# ئەو کتێبانەی جیهانیان گۆڕی



ڕۆبەرت ب. داونز

وەرگێڕانی:
عومەر عەلی غەفور





ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: 218




# ئەو کتێبانەی جیهانیان گۆڕی

رۆبەرت ب.داونز

لە عەرەبییەوە: عومەر عەلی غەفور

دەرهێنانی هونەری ناوەوە: خەلیل هیدایەت مام شێخ

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: ( ٦٠٠٠) دینار

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧١ ) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە.



ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان:هەولێر-پشت پارێزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 - 07504242101

ئیمەیڵ : Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک: www.facebook.com/nawendi Awer

## هێزی گەورەی کتێب

ئەم کتێبە باس لە شازدە کتێبی مەزن دەکات کە ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی. ئەو نووسەرە نەمرانە، هەر لە (کۆپەرنیکۆس) و (هاریت بیچەر ستۆ)وە تا دەگاتە (داروین) و (فرۆید) و (ئەنیشتاین) خەڵکیان دژی ستەم وروژاند، جەنگیان دەست پێکرد و بۆچوونەکانی مرۆڤیان لەبارەی خۆی و دنیاوە ئاوەژوو کرد.

## کتێب چەکە

کتێب بەدرێژایی مێژووی تۆمارکراوی مرۆڤایەتی هێزێکی گەورەی چ لەپێناو خێر و چ لەپێناو شەڕدا پیشان داوە. وا لە خوارەوە باسی شازدە کتێب لە گرنگترین کتێبەکانی هەموو سەردەمەکان دەکەین، کە کاریگەرییان لەسەر مێژوو و ئابووری و کولتور و مەدەنیەت و بیری زانستی هەبووە، لە سەردەمی رێنیسانسەوە تا ئەمڕۆ.

ئەوانە کتێبی زۆر بەهێزن، لەوانە: کتێبی "خەباتەکەم "Mein Kampfی هیتلەر، کە پێشبینیی ئەو مەرگ و وێرانکارییەی کرد لە جەنگی جیهانیی دووەم دەکەوێتەوە. کتێبە بەناوبانگەکەی هارڤی دەربارەی سوڕی خوێن کە تیۆری پزیشکی و چارەسەری گۆڕی. تیۆرەکەی ئەنیشتاین لەبارەی گوێرەیی (یاخود رێژەیی) (النسبیه)، کە سەرەتای چاخی ئەتۆمی دەست پێکرد. ئەم کتێبانە بەوردی لەم کتێبەدا باس کراون کە لەلایەن دکتۆر دوانز سەرۆکی پێشووی کتێبخانەی ئەمەریکی و سەرۆکی کتێبخانەی زانکۆی ئیلینۆیزەوە دانراوە.

بەڕوونی باسی هەژموونی گەورە و بەربڵاوی ئەو کتێبانە و ژمارەیەك کتێبیتر دەکات، لەوانە تیۆرەکەی نیوتن لەبارەی یاسای کێشکردن کە بوو بە بەردی بناغە لە تیۆری زانستیی ئەمڕۆدا. کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"ی داروین کە زۆر لە پیاوانی کەنیسە گومانیان وابوو لەگەڵ بنەماکانی تەوراتدا لێك دەدات. هەروەها کتێبی "کوخەکەی مام سام" کە ئەو کتێبە یەکێك بوو لە هۆ سەرەکیەکانی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا. لێکدانەوەکانی فرۆید بۆ خەو، ئەو دانەرە مەزنەی کودەتایەکی لە هزری مرۆڤی سەردەم لەبارەی خودی خۆی هێنایە کایە.

خستنەڕووی ئەو کتێبانە کاریگەریی گەورەی کتێب لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی پیشان دەدات.

## پێشەکی

وەهمێکی باو هەیە کە پێی وایە کتێبەکان کۆمەڵێ تەنی بێگیانی سڕ و سستن و هیچ کاریگەریەکیان نیە. تایبەتن بە شوێنە داخراوەکان و هێمنی تیۆریی کەنیسە و زانکۆکان و شوێنانیتری هەڵاتن لە جیهانی مادیی خراپەکار. بەپێی ئەم بیرۆکە زۆر هەڵەیە، کتێبەکان پڕن لە تیۆری نازانستی و گرنگیەکی ئەوتۆیان بۆ پیاوی کاری سەرسەخت نیە.

بابای وەحشیی دارستان تێگەیشتنێکی واقیعیانەتری هەبوو کاتێک لەبەردەم لاپەڕەی چاپکراودا دەنوشتایەوە بەهۆی توانای بێسنووری لە گواستنەوەی نامەکاندا. بەدرێژایی مێژوو بەڵگە کەڵەکە دەبن لەسەر ئەوەی کتێب پاك و بێ زیانە و شتێکی بێنرخ نیە، بەڵکو زۆربەی جاران خاوەن جوڵەی گەورە و زیندووە و توانای گۆڕینی ڕێڕەوی ڕووداوەکانی بەشێوەیەکی ریشەیی هەیە، جا هەندێ جار بە باری خێر و هەندێ جاریش بە باری شەڕدا.

دیکتاتۆرەکانی هەموو سەردەمێك لە ناخی خۆیاندا تێڕوانێکی دانایانەیان بۆ هێزی مەزنی کتێب هەیە. هەرکات و لە هەرکوێ دەسەڵاتە ملهوڕ و زۆردارەکان ویستبێتیان بەرهەڵستیەکان بوەستێنن و بۆچوونەکان بکوژن، یەکسەر بێ سێ و دوو بیریان بۆ لەناوبردنی کتێبەکانی سەر بە دژەبۆچوونەکان و زۆربەی جاریش فەوتاندنی دانەرەکانیان چووە. بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەوە، ملهوڕەکان ئاوڕیان لە بەرژەوەندیی خۆیان داوەتەوە و دەستیان بەسەر ئەو خەڵکە، یان هەندێ کتێبی دیاریکراودا گرتووە، وەك کتێبی "خەباتم"ی هیتلەر و کتێبی "سەرمایە"ی کارڵ مارکس و ئەو کتێبە قەبانەی لینین و ستالین نووسیویانن. کەس باشتر لە زۆردارەکە دەرك بە هێزی هەڵتەکێنەری شاراوەی کتێب ناکات.

لە هەندێ بۆنەدا ئەم بیرۆکەیە لەنێو نەتەوە دیموکراتەکاندا پراکتیزە دەکرێ. بۆ نموونە ئەو هەست بەشۆککردنە بەرفراوان و باوەڕنەکردنەی چەند ساڵێك لەمەوبەر لەنێو تاکەکانی گەلی ئەمەریکی و دۆستانیان لە دەرەوە دروست بوو کە ئیدارەی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کتێبخانەکانی پرسگەکان لە دەرەوە، لە بەرنامەیەکی زەبەلاحی سانسۆرکردنی کتێبدا کاری کردوە، لە هەندێ شوێنیش بەکردەوە سووتاندنی کتێب. کاردانەوەی ئەوە بەڕادەیەك توند بوو کە سەرۆك ئایزنهاوەر خۆی هاتە ناو بابەتەکە و هەوڵیدا پەرێزی حکومەتی ئەمەریکی پاك بکاتەوە و وتارە بەناوبانگەکەی بەناوی "مەچۆ ریزی کتێب سووتێنان"ی پێشکەش کرد.

خەڵك لە هەموو جێیەك بە غەریزەی خۆیان بینیویانە کتێب وەك چۆن بۆ سەدەکانی رابردوو پێویست بووە، بۆ رۆشنبیری و شارستانێتی نوێیش، پێویست و بنچینەییە.

ئامانج لەم کتێبە روونکردنەوەی توانای بەهێزی کتێبە، ئەویش لەرێی قسەکردن لەسەر چەند نموونەیەکی دیاریکراو.

یەکەم شت پێویستە ئەوە روون بێ کە مەبەستمان نیە لیستێك بەناوی "باشترین کتێب" یان "مەزنترین کتێب" پێشکەش بکەین، کردنی ئەم جۆرە لیستانە ئارەزوویەکی خۆشە بۆ کات بەسەربردن لەلایەن رەخنەگرانی ئەدەب و دانەران و بڵاوکاران و پیاوانی فێرکردن و سەرپەرشتی کتێبخانەکان کە راسپاردەکانیان لە زانستە ئەدەبیەکاندا قەتیس دەبێ. بەڵکو مەبەست دۆزینەوەی ئەو کتێبانەیە قووڵترین کاریگەرییان لەسەر مێژوو و ئابووری و کەلتور و مەدەنیەت و بیری زانستی کردوە، نزیکەی لە سەردەمی رێنیسانسەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.

دیارە لەمەدا کێشە لە هەڵبژاردندایە، لەخۆوە کۆمەڵێ ناونیشان بەخەیاڵدا دێن، بەوەیش هەڵبژاردن جۆراوجۆر دەبێ و زۆربەیان لەکاتی بەکارهێنانی ژمارەی ریزی یەکەمدا دەسڕێنەوە، لەبەرئەوەی پێویستە ئەو کتێبە خاوەن کاریگەریەکی مەزن و بەردەوام بووبێ لەسەر هزر و کردرای مرۆڤ، نەك بۆ نەتەوەیەکی دیاریکراو بەتەنیا، بەڵکو بۆ زۆرترین بەشی دنیا. کاتێك مرۆڤ دەست بۆ ئەم تاقیکردنەوە سەختە دەبات، ناونیشان دوای ناونیشان دەسڕێتەوە.

لەبەر هۆگەلێکی کرداری نەریت وایە مشتومڕەکە لە بازنەی کتێبەکانی زانست و مادە کۆمەڵایەتیەکاندا سنووردار دەکرێ و بوارە فراوانەکانی وەك ئاین و فەلسەفە و ئەدەب دەخرێنە لاوە. خۆ رووددەدات کاریگەریی شاکارە ئاینی و ئەدەبیەکان زۆر لە کاریگەریی سەرجەم جۆرەکانیتر بەهێزتر بێ، بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێ کاریگەریی کتێبێکی وەك وەرگێڕانی پاشا جەیمس بۆ تەورات بزانێ؟. بەکارهێنانی هەر ئامانجێك لەسەر ئاستێکی نابابەتی، لەتەك ئەم جۆرە کتێبە سەیرەدا ناگونجێ. یان ئەدەبی شکسپیر و ملتۆن کە کۆسپی سەخت دروست دەکات، لەبەرئەوەی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگە تەواو سەرتاپاگیرە، بەشێوەیەك

زمان و ئەدەب و فەلسەفە و شێوازی بیرکردنەوە و ئەخلاق و هەموو رووەکانی ژیان دەگرێتەوە.

وا دابنێ بابەتی ئاین و فەلسەفەیش بەکۆن و نوێیانەوە بخەینە نێو ریزبەندی کتێبەکە، ئەوکاتە ژمارەیەکی زۆر کتێبمان لەبەردەم کەڵەکە دەبن: تەورات (وەرگێڕانەکەی پاشا جەیمس و دوای Douay)، تەلمۆد و قورئان و بوودایی پیرۆز و کتێبە هیندۆسیەکان، کۆنفۆشیوس و فەیلەسوفەکانی گریك و سەینت ئۆگستین و سەینت تۆماس ئەکیونوس و مارتن لۆسەر و عەمانوئێل کانت و زۆر کتێبیتر.

خۆ ئەگەر لە رووی کاریگەریەوە سەیری کتێبەکان بکەین، هەردوو کتێبی "زانست و تەندروستی"ی ماری بەیکەر ئێدی و کتێبی مۆرمۆن Mormon ی جۆزیف سمیث دەبینین. (مۆرمۆن رێبازێکە لە ویلایەتی ئوتاوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پەیدا بوو و بانگەشەی بۆ فرەژنی دەکرد). رەنگە لەمەیش دژواتر هەڵبژاردنی گەورەترین شاکارەکان بێ لە کەلەپوری ئەدەبیدا: خەیاڵ و دراما و شیعر و پەخشان کە هەستی جیهانیان بزواندوە. ئەوکاتە راستەوخۆ ناوی کۆمەڵێ نووسەری کلاسیکی گریك و رۆمان بەخەیاڵدا دێن، هەروەها کەسانی وەك دانتی و چۆسەر و رابیلیە و سێرڤانتس و مۆلیێر و شکسپیر و میلتۆن و گۆتە و هێن و دیستۆفسکی و دەیانیتر، کە رەنگە لە پلەیەکی نزمتردا بن.

لەو کتێبانەیتر کە کاریگەریی قووڵیان هەبووە کتێبی گەشتنامەکانن کە لە سەردەمی مارکۆ پۆڵۆوە ئاسۆی مرۆڤیان فراوان کردووە و کاریان بۆ پان و پۆڕیی جیهانەکەی کردووە. گەڕۆکی بێوێنەی سەدەکانی ناوەڕاست، مارکۆ پۆڵۆ، لە سەدەی سیازدەیەمدا وڵاتانی رۆژهەڵاتی تەی کرد کە ئەورووپا هیچی لەبارەیانەوە نەدەزانی و تۆمارێکی ورووژێنەری لەبارەی سەرکێشی و دۆزینەوەکانی بەجێهێشت. هەروەها گوتارەکەی کریستۆفەر کۆلۆمبس لە ساڵی ١٤٩٣ کە تێیدا باسی گەشتە

بەراییەکانی بۆ ئەمەریکا دەکات و دەستبەجێ بۆ چەند زمانێکی جیاواز تەرجەمە کرا و لە دەوڵەتانی ئەورووپا چاپ کرا و بەتەبیعەتی حاڵ ورووژاندن و چێژێکی زۆری بەخشی. ماوەیەکی کەم دوای ئەمانە وتارەکانی ئەمریکۆ ڤیسیۆڤی هاتن کە پرسیارێکی زیاتری پێویست کرد و لە ساڵی ۱۵۰۷ بەئاگەداریی مارتین والدسیمولەر لە کتێبەکەی "پێشەکیی سیستەمەکانی گەردوون" Cosmographiae Introductis چاپ کرا و ئەو کتێبە بووە مایەی ئەوەی دنیا نوێیەکە ناو بنرێ "ئەمەریکا". ئەو سەدەیەی بەدوای ئەوەدا هات بەناوبانگترین قۆناغی گەشت و دۆزینەوەکان بوو لە مێژووی تۆمارکراودا. لێشاوێك ئەدەبی گەشتنامەی چاپکراوی بەخۆوە بینی، کە زۆربەیان لە سەدەی شازدەیەمدا ریچارد هاکلویت لە کتێبە بەناوبانگەکەی Principal Navigations, Traffics and Discoverier of the English Nation دا کۆی کردنەوە. هەروەها هەندێکیشیان سامۆیل پورکاس لە کتێبی Pilgrims کۆی کردنەوە.

لە بواری کۆچ و گەشتیشدا نابێ کتێبە خەیاڵییە پەتییەکان لەبیر بکەین، لەوانە کتێبی "بەدەوری جیهان لە هەشتا رۆژدا"ی جوڵ ڤێرن (۱۸۷۲)، ئەو کتێبە بەشێوەیەك خەیاڵی ورووژاند کە هیچ کتێبێکیتر نەیورووژاندوە. ساڵی (۱۹٤۳)یش وێندڵ ویلکی کتێبی "یەك جیهان"ی نووسی و بەشداریەکی گەورەی کرد لە بەخشینی تێڕوانینێکی دەرەکیی نێودەوڵەتی بە هاوڵاتیانی و رۆڵێکی لە بیرۆکەی رێکخستنی "نەتەوە یەککگرتووەکان"دا بینی.

شتێکی خۆشە ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو هەوڵانەی پێشتر بۆ سنووردارکردنی ئەو کتێبانەی کاریگەریی گەورەیان بووە دراون و بەراوردیان بکەین. ساڵی ۱۹۳۵ هەریەك لە ئێدوارد ویکس و جۆهین دیوی و چارلز أ. بێرد هەریەکەی لیستێکیان بۆ گۆڤاری Publishers Weekly ئامادە کرد. هەریەك لەوانە ۲۵ کتێبیان

هەڵبژارد کە لە ساڵی ١٨٨٥ەوە دەرچوون، کە بەبڕوای هەریەکەیان کاریگەریی گەورەیان بووە. کۆتا لیستی هەڵبژێردراو پەنجا ناونیشانی لەخۆ دەگرت، کە تەنها چوار لەوانە کۆدەنگییان لەسەر بوو، ئەوانیش "سەرمایە"ی مارکس، "سەرنجێك بۆ دواوە"ی بیلانی، "لقی زێڕین"ی فرێزەر و "تێکچوونی خۆرئاوا"ی شپنجلەر بوون، لەکاتێکدا ٢٩ ناونیشانیان تەنیا یەك دەنگیان هێنابوو. لەناو ئەو کتێبانەی لەو ماوەیەی هەڵیانبژاردوە و لەم دانراوەدا تاوتوێی دەکەین کتێبەکەی ماکیندەرە، کە هەریەك لە ویکس و دیوی و بیرد باسیان نەکردوە، لەکاتێکدا کتێبەکەی هیتلەر تەنیا بیرد باسی کردبوو. تەنیا کتێبەکەی مارکس لەلایەن هەموویانەوە هەڵبژێردرابوو.

چەند ساڵێك پاش ئەوە (ساڵی ١٩٣٩) مالکوڵم کاولی و بێرنارد سمیث هەوڵێکی هاوشێوەی ئەمەیان دا بۆ هەڵبژاردنی ئەو کتێبانەی عەقڵیان گۆڕیوین. بەهاوکاریی دەستەیەکی بژاردە لە پیاوانی فێرکردن و رەخنەگر و وانەبێژ و رێکلامکارانی ئەمەریکی ١٢ ناونیشان وەك سەرلیست دەستنیشان کران، کە بەلای ئەو گرووپەوە گرنگترینن لە پێکهێنانی عەقڵی ئەمەریکیی هاوچەرخدا، بەڵام ١٣٤ کتێبیتریشیان وەك راسپاردە دانابوو. کۆتا هەڵبژاردن بەم شێوەیە بوو:

فرۆید: لێکدانەوەی خەون.

ئادەمز: فێرکردنی هێنری ئادەمز.

تێرنەر: پێشەنگ لە مێژووی ئەمەریکیدا.

سەمنەر: رێگەکانی گەل Folkways.

ڤێلبین: پرۆژەی کار.

دێوی: توێژینەوەیەك لە تیۆری لۆژیکی.

بواس: عەقڵی مرۆڤی سەرەتایی.

بێرد: تەفسیری ئابوورییانە بۆ دەستوور.

ریچارز: بنەماكانی رەخنەی ئەدەبی.

پارینگتۆن: تەوژمە سەرەكیەكان لە هزری ئەمەریكیدا.

لینین: دەوڵەت و شۆڕش.

شپنجلەر: تێكچوونی خۆرئاوا.

لەناو ئەم كتێبانەیشدا ویكس و دیوی و بێرد رایان وایوو كتێبەكانی فرۆید و ئادەمز و تێرنەر و شپنجلەر بێنە هەڵبژاردن.

نووسەری ئینگلیزی (هۆراس شیپ)یش هەوڵیدا لیستێك بەناوی ئەو كتێبانە بكات كە گەورەترین كاریگەرییان هەبووە، بەبێ دیاریكردنی كات و شوێن و بابەتەكان، تا لە كتێبەكەی "ئەو كتێبانەی جیهانیان جولاند" (١٩٤٥) بەكاری بێنێ. شیپ رای لەسەر هەڵبژاردنی دە كتێب گیرسایەوە، كە ئەمانە بوون:

تەورات.

ئەفلاتۆن: كۆمار.

ئۆگەستین: شاری خودا.

قورئان.

دانتی: كۆمیدیای ئیلاهی.

شانۆگەریەكانی شكسپیر.

بەنیان: پێشكەوتنی حەج.

میڵتۆن: ئەندامێتیی دادگەی تاوانەكانی ئەسینا.

داروین: بنەچەی رەگەزەكان.

ماركس: سەرمایە.

لەم كتێبەكەی ئێمەدا تەنیا ئەم دوو كتێبەی دوایی دەستنیشان كراون.

لەمەی رابورد دەردەکەوێ کە کۆدەنگی لەسەر کتێبێکی دیاریکراو ئاستەمە و هەڵبژاردنەکە شتێکی تا رادەیەکی زۆر کەسی و زۆر بابەتییە. لەگەڵ ئەوەیشدا هیواخوازین مافی تەواومان بە قسەکردن لەسەر هەر کتێبێکیان دابێ.

جێی خۆیەتی ئەوەیش بڵێین کە هەندێ کتێبیتر بەوردی دیراسە کران، بەڵام لەبەر هۆیەك لە هۆکان خرانە لاوە.

بۆ نموونە لەنێو کتێبە کلاسیکیەکانی زانستدا کتێبی "کارگەی جەستەی مرۆڤ" (١٥٤٣)ی ئەندریاس ڤیالیوس هەیە، شایانی شوێنێکە لە مێژووی پزیشکیدا شان بەشانی کتێبەکەی هارڤی. هەروەها کتێبەکانی لیبینز لە ماتماتیك و فیزیادا هاوشانی "بنەماکانی ماتماتیك"ی ئیسحاق نیوتنن. لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا کتێبی "پێشەنگ لە مێژووی ئەمەریکیدا"ی فریدریك جاکسۆن تێریز کتێبێکی نایابە و لە بواری خۆیدا بایەخی لە کتێبی "تەوەری جوگراف بۆ مێژوو"ی ماکیندەر کەمتر نیە. کتێبی "مانیفستی شیوعی"ی مارکس و ئەنگلز هێزێکی بزوێنەر بوو بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی بۆ ماوەی پتر لە سەدەیەك، بەڵام کاڵتر و لە بەڵگەنامەکانیدا پەرپوتتر و رەنگە لەو رووەیەدا کەم هەژموونتر بووبێ لە کتێبی "سەرمایە"ی مارکس. هەندێ رەخنەگر کتێبی "گرووپی ماڵدین"ی سۆرۆ-یان لە "یاخیبوونی مەدەنی" پێ باشترە. لەگەڵ ئەوەیشدا یەکەمیان کاریگەریی کەمتر بووە.

لە کتێبە کاریگەرەکانیتر کتێبی "ژیانی واشنتۆن"ـە (١٨٠٠) لە دانانی پارسۆن ماسۆن کە بۆ ماوەی شەش وەچە خزمەتی ئاراستەکردنی هزر و کەلەپوری ئەمەریکی دەدات (بەتایبەت لە حاڵەتی ئەبراهام لینکۆڵندا)، هەروەها کتێبی "جەنگەڵەکان"ی ئەپتۆن سینکلەیر (١٩٠٦)، کە کۆمەڵێ شتی جێداخی لە بۆرسەی گرێبەستەکان لە شاری شیکاگۆدا دۆزیەوە و بووە مایەی چاکسازیەکی ریشەیی.



کاتێ مرۆڤ ئەم شازدە کتێبە پڕ جوڵەیە دەخاتە روو، هەمیشە ئەو پرسیارەمان بەزەیندا دێ: ئایا ئەوە سەردەمەکانن کە کتێبیان دروست کردووە یان بەپێچەوانەوە؟ واتە ئایا هەژموونداریی کتێبێکی دیاریکراو لەبەرئەوە بووە کات لەبار بووە و ئایا ئەو کتێبە هەمان گرنگی لە سەردەمێکیتردا دەبێ؟ یان ئایا دەکرێ لە مێژوویەکیتردا بنووسرێ؟ ئاستەمە لەو دەرەنجامە هەڵبێین کە کاتەکان کتێبیان بەرهەم هێناوە تا رادەیەك لە هەموو لایەنێکەوە، بەڵام ناکرێ ئەو کتێبە لە سەردەمێکیتری مێژووییدا بنووسرێ، یان ئەگەر دەربکەوتایە هەمان ئەو گرنگیەی دەبوو.

زۆر نموونەمان لەبەردەستن: ماکیاڤیلی کتێبی "میر"ی بۆ رزگارکردنی نیشتمانە ئازیزەکەی لە دەستدرێژیی بێگانە دانا. کاتێك ئادەم سمیث کتێبی "سامانی گەلان"ی دادەنا ئینگلتەرا ئامادە بوو تا ئەوپەڕی توانای خۆی ئابووریيە بازرگانی و پیشەسازیەکەی فراوان بکات.هەروەها کتێبی "زانینی گشتی" (الادراك العام)ی تۆماس پین، ئاگری شۆڕشی ئەمەریکی هەڵگیرساند کە گەییبوو و ئامادە بوو بۆ تەقینەوە لە هەر کاتێکدا. هەروەها "کوخەکەی مام تۆم"ی هاریت بیچەر ستۆ هەمان رۆڵی لە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا. ئەگەر دۆخی خراپی باو لە پیشەسازیی ئەوروپا و بەتایبەت سیستمی کارگە ئینگلیزیەکان لە سەدەی نۆزدەیەمدا، زەخیرەی کارل مارکس بۆدانانی کتێبەکەی "سەرمایە" کەمی دەکرد.

کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو"ی شازادەی دەریا ماهان بووە پاڵنەر بۆ لێکچوونێکی دەریایی نێوان هێزە جیهانیەکان لە ساڵی ١٨٩٠. بەڵام فشاری سەرکێشیی فروانخوازی و داگیرکردن پێشتر هەبوو. ئەگەر ئەو پاشاگەردانییە نەبوایە کە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم باڵی بەسەر ئەڵمانیادا کێشابوو، هیتلەر وەك نەمسایيەکی ماڵ سپیکەرەوەی نەناسراو دەمایەوە.

لەلایەكیترەوە وەك ئەو حەبانەی درەنگ كاریگەرییان دەردەكەوێ، هەندێ كتێب چەند ساڵێك پاش دەرچوونیان كاریگەرییان بەتەواوی دەركەوتووە. بۆ نموونە جیهان كاتێك دەركی بە گرنگیی كتێبەكانی ئادەم سمیث و كارل ماركس كرد كە هەردووكیان مردبوون. نیو سەدە پاش مردنی سۆرۆ مەهاتما گاندی لە هیند و باشوری ئەفریقیا رێبازەكەی لە بانگەشەكردن بۆ یاخیبوونی مەدەنی پەیڕەو كرد. ئەگەر سەرهەڵدانی قوتابخانەی ئەڵمانی بۆ سیاسەتی فراوانبوونی جوگرافی نەبوایە، تیۆرەكانی ماكیندەر كە دەیان ساڵ پێشتر داڕێژرابوون ئەو بایەخە شایستەیەی پێ نەدەدرا.



## ١- "مير"
## نیکۆلۆ ماکیافیلی Niccolo Machiavelli
## تونکاریی سیاسەتی هێز

ماکیافیلیزم بۆ ماوەی پتر لە چوار سەدە وەك شتێکی شەیتانی و ناپاك و بێڕەوشت و پیس لە زەینی دنیادا جێگیر بووبوو. باوکی ئەو چەمکە، واتە نیکۆلای ماکیافیلی، رەمزێکی بەناوبانگ بوو بۆ سیاسەتوانی پیلانگێڕ و فێڵباز و دووڕوو و بێ رەوشت و پرنسیپ و ئارەزووباز، کە هەموو فەلسەفەکەی کورت دەبێتەوە لەوەی "ئامانج جۆری ئامرازەکەی خەلق دەکا".

هەموو جیهان باوەڕی وابوو بالاترین یاسای ماکیافیلی گونجانی سیاسییە. لە سەدەی حەڤدەیەمدا دەستەواژەی ئۆلد نیك Old nick وەك کونیەیەك جارێ بۆ شەیتان و جارێ بۆ ماکیافیلی بەکار دەهات.

ئەی کەسێك نیە بەرگریەك لەم تۆمەتبارە بکات؟

ئەو ناوبانگە خراپەی ماکیافیلی خەریکە بڵێین هەرهەمووی پەیوەندی بە کتێبێکیەوە هەیە بەناونیشانی "میر" کە ساڵی ١٥١٣ نووسیویەتی، بەڵام تا ساڵی ١٥٣٢ واتە پێنج ساڵ پاش مردنی، بڵاو نەبوویەوە.

هیچ کتێبێك لەو سەردەمەی تێیدا نووسراوە دانابڕێ. ئەمە راستیەکە رەنگە هیچ کتێبێك نەتوانێ وەك کتێبی "میر" بەو شێوەیە روونی بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کتێبی "میر" وەك هەر کتێبێکی مەزن پەند و وانەی بۆ هەموو سەردەمێك تێدایە.

شتێکی کەم نەبێ لەبارەی ژیانی ماکیافیلی بەر لە ساڵی ١٤٩٨ نازانین کاتێك لە تەمەنی بیست و نۆ ساڵیدا وەزیری کۆماری فلۆرەنسە Florence بووە و ماوەی

هەژدە ساڵ خزمەتی حکومەتی ئەو شارەی کردووە. بە ئەرکی دیپلۆماسی چووەتە توسکانی Tuscany، پاشان چیاکانی ئەپنین Apennineی بڕیوە بۆ ڕۆما. پاش ئەوەیش بۆ ئەودیو چیاکانی ئەلپ. هەریەك لە کۆنتیسە کاترینئادەم سمیپفۆرز و زۆرداری سینا پاندۆلفۆ پێتروچی، فەردیناندی ئەرجۆنی، پاشای فەرەنسا لویسی دوازدەیەم، ئیمپراتۆر ماکسیمیلیان، پاپا جۆلیوسی دووەم و سیزار بۆرجیای ناسیوە.

کێشمەکێشی سیاسی لەنێوان فلۆرەنسە و دەوڵەتەشارەکانیتری وەك پیزا و میلان و ناپۆلیدا بەردەوام لەئارادا بوو. سیاسەت لەو سەردەمەدا بێئەندازە خراپ بوو. ماکیافیلی قوتابیی زرنگ لە بواری توێژینەوە لە سروشتی مرۆڤ، لە سەرەتای ئەزموونی خۆی لە بواری سیاسەتدا، لە چەندین بۆنەدا توانا و لێهاتوویی لە بەئەنجامگەیاندنی دانوستانە سەختەکاندا پیشان داوە. پاش ئەوەیش، بێگومان، واقیعیبوون و گاڵتەکردنی بە کاروبارە سیاسیەکان لەسەر ڕاهێنان بنیات ناوە، لەبەرئەوەی فێر بوو جگە لە چاوچنۆکی و خۆپەرستی گوێ بە هیچ پاڵنەرێك نەدا. ماکیافیلی لەسەر دەستی ئیسپانیا نۆرەیەکی لە ڕەوڕەوەی بەختدا بەرکەوت. ئەوە بوو میدیکلیەکان Medicis کۆماریان لەناو برد و دەسەڵاتیان لە فلۆرەنسە گێڕایەوە. بەوهۆیەوە ماکیافیلی دەرکرا، بەند کرا و ئەشکەنجە درا و سەرەنجام بۆ موڵکە بچوکەکەی لە گوندێك لەنزیك سان کاسیانۆ دوور خرایەوە و لەوێ، هەندێ ماوەی کورت کورت نەبێ، دەستبەسەر بوو تا مردنی لەساڵی ١٥٢٧. کاتەکانی لەو ماوە دوور و درێژەدا بە دانانی کتێبەکانی "میر" و "گفتوگۆکان" و "هونەرەکانی جەنگ" و "مێژووی فلۆرەنسە"وە بەسەر دەبرد، کە هەر هەموویان وەك بنەما باس لە سیاسەتی کۆن و هاوچەرخ دەکەن.

ئاستەمە هیچ جۆرە سۆزێك سەبارەت بە کاروباری گشتی لە سروشتی میکیافیلیدا بدۆزرێتەوە، بەڵام بەرانبەر یەك شت هەستی بە کارتێکرانێکی قووڵ دەکرد. ئەو

نیشتمانپەروەرێکی رەسەن و بە جۆش و خرۆشەوە تامەزرۆی ئەوە بوو ئیتاڵیا وەك دەوڵەتێکی بەهێز ببینێ. ئەوکاتە ئیتاڵیا لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەیەمدا لە نەهامەتیەکی وا کارەساتباردا دەژیا، کە تا رادەی گریان دڵی هەموو کەسێکی نیشتمانپەروەری پەرێشان دەکرد.

لە سەروەختی ماکیافیلیدا گۆڕانێکی گەورەی سیاسی و ئابووری و لاهوتی بەرێگەوە بوو بۆ ئیتاڵیا. پاش خەباتێکی سەخت لە هەموو شوێنێك لە ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئیسپانیا یەکێتیی نەتەوەیی روویدا. بەڵام لە ئیتاڵیا بیرۆکەی رێکخستنی نەتەوەیی یان فیدراڵی، هێشتا نەناسرابوو. ئەو دەوڵەتە حوکمڕانیی پێنج یەکەی سیاسیی گەورەی دەکرد، کە بریتی بوون لە میلان و فلۆرەنسە و ڤێنیس و دەوڵەتی کەنیسە و ناپۆلی. ڤێنیس گەورەترین و بەهێزترینیان بوو. فرەیی بەشە سیاسیەکان سەرچاوەی لاوازیەکی بەردەوام بوو بۆ ئیتاڵیا. لە رووی پراکتیکیشەوە بووە بایسی پیلانگێڕی و دەستێوەردانی بێگانە. پەلامارەکان لەرێی پاشای فەرەنسا شارل هەشتەم لە ساڵی ١٨٩٤ دەستیان پێکرد. پاش چەند ساڵێك لە تێکشکان و پاشەکشەی، لویسی حەوتەم و فەردیناند پاشای ئەراجوان لەسەر دابەشکردنی مەملەکەتی ناپۆلی لە بەینی خۆیاندا رێك کەوتن و ئیمپراتۆر ماکسیمیلیان هێزەکانی نارد بۆ پەلامارданی ڤێنیس. هەروەهادەم سمیپوپای ئەڵمانیا و سویسرا و فەرەنسا و ئیسپانیا بەنێو خاکی ئیتاڵیادا دەچوون و شەڕیان لەسەر دەکرد.

لەو کاتانەدا شەڕە تایبەتەکان و رق و کینەی میللی و دزی و راوڕوت و کوشتن لە وڵاتدا بڵاو بوون و هەر کۆمارێك بەگژ کۆمارێکیتردا دەچوو، هەریەکەیان پەلاماری ئەویتریانی دەدات و کۆمارەکان نەیاندەتوانی بەرەیەکی گشتی لە بەرانبەر دوژمنانی بێگانە پێکبێنن. کەنیسەیش لەبەرئەوەی لە خراپترین قۆناغی مێژوویی

خۆیدا بوو و لە سەرهەڵدانی رکابەرێك بۆ دەسەڵاتە دنیاییەکەی دەترسا، بۆ ئیتاڵیا پەرتەوازەیی لە یەکگرتوویی بەچاکتر دەزانی.

رەنگە ماکیافیلی لە شوێنی خانەنشینکردنە ناچاریەکەوە روونتر لە هەر کەسێکیتر هەستی بەو مەترسییە کردبێ کە هەڕەشەی لە نیشتمانە ئازیزەکەی، ئیتاڵیا دەکرد و ئەو نەگبەتیانەی بەرۆکیان گرتبوو و گەیشتبێتە ئەو قەناعەتەی تاکە ئومێدی رزگاری لە بوونی سەرکردەیەکی مەزندایە، سەرکردەیەکی زۆر بوێر و زیندوو کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەوڵەتۆکە ئیتاڵیەکاندا بسەپێنێ و لە بۆتەی نەتەوەیەکدا جۆشیان بدا کە بتوانێ بەرگری لە خۆی بکات و بێگانە خوێنتاڵەکان لە وڵات بکاتە دەرەوە. دەبێ ئەم سەرکردەیە لە کوێ دەست بکەوێ؟ "میر" بیرۆکەی ماکیافیلی بوو لەبارەی جۆری ئەو سەرکردە ئاواتەخوازە و وردکردنەوەی ئەو رێگەیەی پێویستە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن بیگرێتە بەر.

ئەگەرچی کتێبی "میر" بۆ (لۆرنزۆ دی میدیکی) Lorenzo de Meedici حاکمی نوێی فلۆرەنسە تەرخان کراوە، بەڵام پاڵەوانی کتێبەکە سیزار بۆرجیا Cesare Borgia کوری پاپا ئەلیکسەندەری شەشەمە، کە کاردینالێکی حەڤدە ساڵان و سەرکردەیەکی جەنگیی بەتوانا و شکێنەری رۆمانیا و دیکتاتۆرێکی دڵڕەق بوو کە سۆز و بەزەیی نەدەزانی.

ماکیافیلی ساڵی ١٥٠٢ نێردەیەکی نارد بۆ کۆشکەکەی. وەك نیڤنز دەڵێ ماکیافیلی "بەسەرسامیەوە دەیبینی چۆن بۆرجیا بەپێی بۆنە و هەلکەوت زیرەکانە بەتۆرە وریایی و فێڵ، قسەی لوس و شیرین هەروەها کاری خوێنرێژانە بەکار دێنێ. هەروەها چۆن چۆنی خوێنساردانە غەدر و دووڕوویی دەکرد. چۆن چۆنی بۆ درێژەدان بە ملکەچیی ئەوانەی تێکی شکاندبوون دڕندانە تۆقاندنی بەکار دەهێنا، هەروەها چۆن زۆردارانە چنگی لەو وڵاتانەی داگیری دەکردن توند دەکرد".

سیزار بەگرتنەبەری جووت کەسایەتی و دڵڕەقی و بێتمانەیی سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا، بەڵام سەرکەوتنێکی کاتی بوو. ماکیافیلی نیشتمانپەوەرێکی بەغیرەت و حەزی لە رژێمی کۆماری بوو، بەڵام کاتێك دۆخی یاخی و پەشێوی ئیتاڵیای بینی گەیشتە ئەو باوەڕەی، سیزاری بۆرجیا ئەو سەرکردە نموونەییەیە دەتوانێ ئیتاڵیا لەو پاشاگەردانییە رزگار بکات.

بەم شێوەیە خەونبینینی بە نەتەوەیەکی یەکگرتوو، جۆش و خرۆشی نیشتمانی پێ بەخشی. لە بارێکیشدا دەرکی بە پێویستیەکانی ساتەوەختی سەخت و هەلی زێرینی بەردەم حاکمە نوێیەکە دەکرد، هەموو چالاکی و حەماسی خۆی بۆ دانانی کتێبی "میر" تەرخان کرد و لە شەش مانگی کۆتایی ساڵی ١٥١٣دا نووسی. پاش ماوەیەك لەوە، بە دیارینامەیەکەوە پێشکەشی کۆشکی لۆرینزۆی کرد، تێیدا نووسی: "کاتێ بینیم لەتواناندا نیە دیاریەك پێشکەش بکرێ باشتر بێ لە رەخساندنی هەلی تێگەیشتن لە کورتترین کاتدا، هەموو ئەوەی لەو ساڵە دوور و درێژانە و لە جەرگەی ماندوێتی و مەترسیەکاندا فێری بووم، (لەم کتێبەدا) پێشکەش دەکەم".

ئامانجی بنەڕەتی لە "میر" ئەوەیە بەرژەوەندیی دەوڵەت هەموو شت بەدیدێنێ. چەندین ئاستی جیاواز لە ئەخلاق لە ژیانی گشتی و ژیانی تایبەتیدا هەن. لەبەرئەوە وا بۆ بابای سیاسی شیاوە کە لەپێناو بەرژەوەندیی گەلدا، پەنا بۆ ئەنجامدانی کاری توندوتیژی و فێڵبازی ببات کە لە مامەڵە تایبەتەکاندا بە تاوان دادەنرێن. لەبەرئەوە ماکیافیلی ئەخلاقی لە سیاسەت جیا کردەوە.

کتێبی "میر" رێبەری میرەکانە (یان وەك هەندێ گوتویانە، کتێبێکی پێویستە بۆ زۆرداران) تا فێریان بکات چۆن چۆنی بگەنە دەسەڵات و پارێزگاری لێ بکەن. دەسەڵاتێك کە بۆ بەرژەوەندیی حاکم نیە بەڵکو بۆ خێری گەلە، تا حکومەتێکی

سەقامگیر و پارێزراو لە شۆڕش و پەلاماری بۆ دابین بکات. ئەی بە چ ئامرازێك سەقامگیری و ئاسایش بەدەست دێن؟

بە کەمێك چاوپۆشین لە پاشایەتییە میراتییەکان بۆ گریمانەکردنی ئەوەی حاکم وردبینی و زیرەکییەکی نائاسایی هەیە و دەتوانێ بالادەستیی خۆی بەسەر حکومەتدا بپارێزێ. ئەوا کێشەی پاشایەتیی نوێ کێشەیەکی ئالۆزە. ئەگەر ئەو ناوچانەی تازە شکاون لە هەمان رەگەز و زمانی دەوڵەتە زالبووەکە بن، ئەوا حوکمکردن تا رادەیەك ئاسان دەبێ، بەتایبەت ئەگەر پابەندی دوو بنەما بن "یەکەمیان لەڕەگەوە هەڵکێشانی خوێنی زنجیرەی رەچەڵەکی میرانی پێشوو، دووەمیشیان ئەنجامنەدانی گۆڕانکاری لە یاساکان یان باجەکاندا". "بەڵام ئەگەر گەلان دەوڵەتێکیان داگیر کرد کە زمان و دابونەریت و یاساکانی لە هی گەلە بەزیوەکان جیاواز بوو، ئەوا زەحمەتیەکان چەندقات دەبن و زالبوون بەسەریاندا پێویستی بە بەخت و بەڕێوەبردنێکی گەورە هەیە".

ماکیافیلی درێژەی دەداتێ و دەڵێ، یەکێك لە رێگەکانی زالبوون بەسەریاندا ئەوەیە حاکم خۆی لە ناوچە داگیرکراوەکەدا نیشتەجێ ببێت و سەنتەری کۆلۆنیالیزەکردنیان بۆ بنێرێ (کە خەرجی لە هێشتنەوەی سوپایەکی داگیرکەر کەمترە)، دۆستایەتی لەگەڵ دراوسێ لاوازترینەکە بکات و هەوڵی لاوازکردنی دراوسێ بەهێزترینەکە بدات. کاتێك لویسی دوازەدەیەم ئەم بنەمایانەی پشتگوێ خست، لە پەلامارەکانیدا شکستی هێنا.

لەبارەی "چۆنێتیی حوکمکردنی بەشە ئیدارییەکان"، ماکیافیلی سێ رێگە دەخاتە روو کە دەکرێ لەڕێیانەوە دەست بەسەر ئەو دەوڵەتۆکانەدا بگیرێ کە وا راهاتوون بەپێی یاساکانی خۆیان و بەسەربەستی بژین: یەکەمیان وێرانکردنیان و دووەمیان نیشتەجێبوونە لەناویاندا. سێیەمیش رازیبوونە بەوەی بەگوێرەی یاساکانی خۆیان بژین و ناچار بکرێن سەرانە بدەن، حکومەتەکانیشیان بە تاقمێکی بچوك لە

دانیشتوانەکەی بسپێرێ کە بتوانن دۆستایەتیی باقیی خەڵکەکەت بۆ مسۆگەر بکەن". سەلامەتترینیشیان دوو ڕێگەچارەی یەکەمن.

سەرەڕای ئەمەیش، ئەگەر شارێك یان پارێزگایەك کە تازە داگیر کرابێ، دەقی بە ژیان لەژێر حوکمی میرێکدا کە وەچەکانی ریشەکێش کراون گرتبێ، ئەوا بۆ ئەو هاوڵاتیانەی وا ڕاهاتوون یەکەم گوێڕایەڵ نەبن و دووەمیش لە حاکمە کۆنەکەیان داماڵراون، مەحاڵە بە هەڵبژاردنی حاکمێك لەنێو خۆیاندا ڕازی بن. لەبەرئەوەی ناشزانن چۆن بەئازادی بژین، بەهێواشی چەکدار دەبن، بەوەیش کەسێکی بێگانە بەئاسانی دەتوانێ بیانخاتە ژێر باڵی خۆی و بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاریان بێنێ.

ماکیافیلی پاش ئەوە قسە لەسەر "میرنشینە نوێکان" دەکات، هۆشداری دەدات و دەڵێ: "دەبێ ئەوە لەبەرچاو بێ کە جەماوەر ساتساتە، لەکاتێکدا بەئاسانی ئیغرا دەکرێن بۆ قبوڵکردنی شتێك، بەئاستەم دەتوانرێ لەسەر ئەو ئیغرایە جێگیر بکرێن. لەبەرئەوە دەبێ شتەکان بەم شێوەیە ڕێك بخرێن: ئەگەر خەڵك بەخۆشی باوەڕیان نەهێنا، دەبێ بەزۆر ناچاری باوەڕهێنان بکرێن".

پاش ئەوە دانەر دەست دەکات بە ستایش و پیاهەڵدانی ژیانی سیزار بورجیا بەوەی سەرکردەیەکی جەربەزە و تاکانەیە و پاساو بۆ غەدر و کوشتنەکانی دێنێتەوە. دەڵێ: "کاتێ بیر لە هەموو کارەکانی دۆق دەکەمەوە، نازانم چۆن لۆمەی بکەم، بەڵام لەباتیی ئەوە پێم وایە پێویستە ئەو وەك حاکمێکی نموونەیی پێشکەش بکەم کە پێویستە ئەوانەی بەخت یان ئامانجی کەسانیتر دەیانگەیەنێتە دەسەڵات، چاوی لێ بکەن، لەبەرئەوەی خاوەن ڕۆحێکی باڵا و خەونێکی دوورمەردا بوو، نەدەکرا ڕەفتاری خۆی بەشێوەیەکیتر ڕێك بخا.. لەبەرئەوە لەسەر ئەو کەسەی پێی وایە پێویستە جێپێی خۆی لە دەوڵەتۆکە نوێکەیدا قایم بکات، پێویستە کار بۆ پەیداکردنی دۆست بدات و ▪ بە زەبری هێز بێ یان بە گزی زاڵ

ببێ، هەروەها وا بكات خەڵك هەم خۆشیان بوێت و هەم لێیشی بترسن، وا بكات سەربازەكانی لەدوایەوە بڕۆن و ڕێزی بگرن، هەموو ئەوانە ریشەكێش بكات كە خاوەن هێز یان عەقڵێكی وان رەنگ بێ زیانی پێ بگەیەنن، سیستمی كۆن بە سیستمی نوێ بگۆڕێ، دڵڕەق و چاكەكار و عەقڵ باڵا و ئازاد بێ و لەشكری بێوەفا تێك بشكێنێت و لەشكرێكی نوێ دروست بكات، پارێزگاری لە دۆستایەتیی پاشا و میرەكان بكات بەشێوەیەك ناچاریان بكات بەجۆشەوە یارمەتی بدەن. بسەڵمنەوە لەوەی زیانی پێ بگەیەنن و نەتوانن نموونەیەكی زیندووتر لە كارەكانی ئەو پیاوە بدۆزنەوە".

ئەو كەسەیش دەوڵەتۆكەیەكی داگیر كردووە "پێویستە پەلە بكات و ئەو زیانانەی پێویستە بیانگەیەنێ بەیەك زەبر بیانگەیەنێ تا ناچار نەبێ رۆژانە تازەیان بكاتەوە، بەڵكو بە بەردەوامنەبوونیان خەڵك دڵنیا بكاتەوە، پاش ئەوە بە دەم چەوركردن بیانباتە پاڵ خۆی... پێویستە ئەو دەمچەوركردنە كەم كەم ببەخشرێ تا بەتەواوی چێژیان لێ وەربگیرێ".

ترس لە سزا تەنیا یەكێكە لەو ئامرازانەی پاشای دانا لە حوكمكردنی رەعیەتەكەیدا بەكاری دێنێ. پێویستە میر پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ گەلەكەی هەبێ، ئەگینا لەكاتی تەنگانەدا هیچ سەرچاوەیەك نابێ یارمەتی بدات.. با كەس ئەو پەندە كۆنەم بۆ باس نەكات كە دەڵێ "ئەوەی بینا لەسەر گەل بكات، بینا لەسەر لم دەكات"، لەبەرئەوەی ئەم پەندە بەسەر هاوڵاتیی تایبەتدا دەچەسپێ كە پشت بە بەرژەوەندیەكانی دەبەستێ لەگەڵ گەلدا و حسابی ئەوە دەكات پاڵپشتی بكەن ئەگەر هاتوو دوژمنەكانی یان دەسەڵاتداران بەزاندیان. بەڵام میری بوێر و بەتوانا كە دەزانێ چۆن چۆنی لە دەوڵەتۆكەكەیدا پارێزگاری لە سیستم بكات، قەت پەشیمان نابێتەوە لەوەی ئاسایشی خۆی لەسەر خۆشەویستیی گەل دامەزراندووە.

لە باسکردنی میرنشینە کەنەسیەکانیشدا، واتە ئەوانەی راستەوخۆ لەژێر حوکمی کەنیسەدا بوون، زۆر بە  زبری و گاڵتەپێکردنەوە قسەی لەبارەیانەوە کردووە.

ئەم میرنشینانە بە هەقداری یان بەخت بەدەست دەهێنرێن و بەبێ لە هیچکام لەم دووانەیش پارێزگارییان لێ دەکرێ و بە فەرمانگەلی ئاینیی رێزدار دەستیان بەسەردا دەگیرێ، کە بەجۆرێك کاریگەرن دەسەلاتی میرەکانیان مسۆگەر دەکەن، بەهەر شێوەیەك کار بکەن یان بژین. تەنیا ئەو جۆرە میرانەن کە خاوەن دەوڵەتۆکەن بەبێ ئەوەی بەرگرییان لێ بکەن، خاوەن رەعیەتن بەبێ ئەوەی حوکمیان بکەن.

ماکیافیلی لێرە و لە هەموو جێیەکیدا کە لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمدا لەوبارەوە نووسیبێتی، کەنیسە تۆمەتبار دەکات بەوەی ئیتالیای دژی بێگانە یەك نەخستووە. دەیویست کەنیسە بەتەواوی لە حکومەت جیا بکاتەوە. لەو رووەیشەوە حکومەتی بەهێز پێویستی بە سوپایەکی مەزن هەیە، ماکیافیلی کاروباری جەنگی زۆر بە گرنگ داناوە و رووبەرێکی فراوانی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردووە. زۆربەی دەوڵەتۆکە ئیتاڵیەکانی ئەو سەروەختە عادەتیان وابوو سەربازی کرێگرتە (مرتزقە)یان بۆ بەرگری لەخۆکردن بەکار دەهێنا و زۆربەشیان بیانی بوون. ماکیافیلی پێی وابوو ئەم هێزانە "بێکەڵك و مەترسیدارن" و سوپای نەتەوەیی کە لە هاولاتیان پێك بێ کاریگەرترە و لە کرێگرتە زیاتر پشتی پێ دەبەسترێ. لەو رووەیشەوە مانەوەی نەتەوە پشت بە هێزی سوپا دەبەستێ، پێویستە میری حوکمڕان کاروبارە سەربازیەکان بە مادەی یەکەمی سیاسەتەکەی و خەمی شەو و رۆژی دابنێ.

ماکیافیلی چەند دەروازەیەکی کتێبەکەی بۆ باسکردنی رەفتاری تایبەتی میرەکان لە بارودۆخی جۆراوجۆردا تەرخان کردووە.

جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو ڕێگەیەی خەڵك پێی دەژین و ئەو ڕێگەیەی پێویستە پێی بژین. ئەو میرەی دەیەوێ پارێزگاری لە پێگەکەی بکات، گرنگە فێر بێ چۆن سیفەتێکیتریشی تێدا بێ جگە لە چاکی. بەپێی پێویستیی حاڵەتەکان چاکیەکەی بەکار بێنێ، یان نەهێنێ... هەموو ئەوانەی من ئەیانناسم دان بەوەدا دەنێن کە بۆ میر وا شایستەیە بەهرەدار بێ بە هەموو سیفەتە باشەکان، بەڵام لەو ڕووەوە مەحاڵە سەرجەم ئەو سیفەتانەی تێدا بن... پێویستە ئەوەندە زرنگ بێ بزانێ چۆن خۆی لە زیانەکانی ئەو ڕەوشتە خراپانە لابدا کە دەشێ ببنە مایەی لەدەستدانی دەسەڵات.

پێویستە میر کاتێك لەو شتانەی هی خۆی یان ڕەعیەتەکەی یان کەسانیترن خەرج دەکات، گوێ بەوە نەدا کە ناوی بە چرووك دەربچێ... پێویستە بەدەستبڵاوی لەوەی تایبەتی خۆت و ڕەعیەتەکەت نیە خەرج بکەیت... لەبەرئەوەی ئازادیی دەستخستنە موڵکی خەڵکانیتر کە بە شەڕ بەدەستی دێنێ، ناوبانگت کەم ناکات، بگرە زیادی دەکات. ئەوەی زیانت پێ دەگەیەنێ ئەوەیە لەوەی خۆت خەرج بکەیت. هیچ سیفەتێك وەك ئازادیی خەرجکردن ماڵوێرانکەر نیە، چونکە کاتێك وا دەکەیت ئەو ئامرازە لەدەست دەدەیت کە پێی دەکەیت و هەژار و بێزراو دەبیت، ئەگینا بۆ ئەوەی خۆت لە هەژاری دوور بگریت، چاوبرسی و ئێسك گران دەبیت.

پێویستە میر دڵڕەقی بە یەکێك لە شێوازەکانی پارێزگاریکردن لە یەکێتی و گوێڕایەڵیی ژێردەستەکانی دابنێ "لەبەرئەوەی ئەو (میر)ەی فیتنەکان بە چەند ڕێکارێکی فەوری کپ دەکاتەوە، سەرەنجام بەبەزەییتر دەبێ لەو (میر)ەی لە چاکیی خۆیدا بەر بۆ شتەکان شل دەکات تا ئاڵۆز دەبن، ئەوەیش زەوتکردن و خوێنڕشتنی لێ دەکەوێتەوە، لەبەرئەوەی وەك چۆن دڵڕەقی تاك خراپ دەکات ئەوەیش دەوڵەت خراپ دەکات".

ماکیافیلی لە بڕگەیەکی بەناوبانگدا دەڵێ:

"لێرەدا ئەم پرسیارە سەرهەڵدەدات: ئایا وا بۆ مرۆڤ باشترە خەڵك زیاتر خۆشیان بوێ یان لێی بترسن. رەنگە وەڵام ئەوە بێ حەزمان لە هەردووکیانە، بەڵام لەبەرئەوەی خۆشەویستی و ترس بەکەمی کۆدەبنەوە، بۆیە ئەگەر پێویست بێ یەکێکیان هەڵبژێرین، سەلامەتتر ئەوەیە زیاتر لێمان بترسن تا خۆشیان بوێن. ئێمە بەگشتی جەخت لەوە دەکەین کە خەڵك نمەکنەناس و بێبار و ناپاکن و هەرچی لە وزەیاندا بێ بۆ خۆلادان لە مەترسی ئەیکەن، چاوبرسین و بۆ قازانج هەڵپەیانە، تا ئەوکاتەی بتوانیت خێر و بێریان بەسەردا برێژیت لەتەکتن، تا مەترسی لەئارادا نەبێ ئامادەن خوێنی خۆیان بەخت بکەن، هەروەها تا مەترسی وا بێ ژیان و ماڵ و منداڵیان دەکەنە قوربانی بۆت، بەڵام هەرکە ترسی راستەقینە پەیدا بوو، پشتت تێدەکەن.

ئەمە گاڵتەجارییەکی رووتە، ئەگەرچی ماکیافیلی دەرەنجام ئامۆژگاری میر دەکات کە "هەموو هەوڵی خۆی بخاتە کار تا خۆی لە رق لابدا".

هیچ بەشێك لە کتێبی "میر" هێندەی دەروازەی هەژدەیەم سەرکۆنە نەکراوە و پلاری لێ نەگیراوە. "میرەکان چۆن پارێزگاری لە متمانە دەکەن". خراپییەکانی بەکارهێنانی زاراوەی "ماکیافیلیزم" زیاتر روو لەم بەشە دەکات تا لە باقیی هەموو کتێبەکە. دانەر لەگەڵ ئەوەیە کە پارێزگاریکردن لە متمانە شایانی ستایشە، هەرچی فێڵکردن و دووڕوویی و شایەتیی درۆیە پێویستن و لەپێناو پارێزگاریکردن لە هێزی سیاسیدا چاوپۆشی لێکراوە.

دوو رێگە هەیە بۆ خەباتکردن، یەکێکیان خەباتە بەپێی یاسا و ئەویتریان بریتییە لە بەکارهێنانی هێز. یەکەمیان بۆ مرۆڤ گونجاوە و دووەمیان بۆ درندەکان. بەڵام لەبەرئەوەی ئەوەی یەکەمیان زۆرجار بەکار نیە، پێویست دەکات پەنا بۆ دووەم ببرێ. دەبێ میر باش تێبگات و بزانێ چۆن چۆنی هەردوو رێگەکە: رێگەکەی مرۆڤ و رێگەکەی درندەکان، بەکار دێنێ... بەڵام لەو رووەیشەوە پێویستە بزانێ چۆن

چۆنی دانایانە سروشتی دڕندەکان بەکار بێنێ، پێویستە لەنێو دڕندەکاندا شێر و ڕێوی هەڵبژێرێ، چونکە شێر ناتوانێ خۆی لە تەڵە لابدات، ڕێویش ناتوانێ خۆی لە گورگەکان بپارێزێ... کام میرە زۆر زۆر حازیمە، ناکرێ و نابێ پارێزگاری لە گفتی خۆی بکات کاتێك ئەو کارە زیانی تێدا بێ کاتێك ئەو هۆیانە نامێنن کە وایان لێ کردبوو ئەو گفتە بدات. ئەم ئامۆژگارییە شتێکی باش نیە کاتێك هەموو خەڵك پیاوچاك بن، بەڵام لەبەرئەوەی خەڵك ناپاکن و متمانەیان پێت نیە، پێویستە لەسەر تۆیش لای خۆتەوە متمانەت پێیان نەبێ. هیچ میرێك نیە بیر بکاتەوە و پەکی بکەوێ لەوەی عوزری ماقوڵ بۆ پاساودانی پابەندنەبوونی بە بەڵێنەکەی بدۆزێتەوە.. بەڵام خەڵك هەمیشە بە ساویلکەیی و وابەستە بە پێویستییە هەنوکەییەکانیان دەمێننەوە، تەنانەت ئەوەیش دەیەوێ بیانخەڵەتێنێ پەکی ناکەوێ لە دۆزینەوەی کەسانێکی "دەبەنگ".. بەم شێوەیە واچاکە خۆت لە بەرگی بەزەیی و متمانە و مرۆڤایەتی و لەخواترسان و ڕاساڵیدا پیشان بدەیت و وایش بیت، بەڵام پێویستە عەقڵ هاوسەنگ بێ و ئەگەر پێویستی کرد دەتوانیت و دەزانیت چۆن چۆنی بەخێرایی پێچەوانە ببیتەوە... هەموو کەسێك تۆ بەو ڕواڵەتە دەبینێ کە خۆتی پێ پیشان دەدەیت، بەڵام کەسانێکی کەم ڕاستەقینەی تۆ دەزانن.

ماکیافیلی پێی وایە گرنگە میر خۆی لە ڕق و کینەی گەلەکەی لابدات. ئەو دوو شتە سەرەکیەیش وا لە گەلەکەی دەکەن ڕقیان لێی بێ، فەرهوودکردنی سامانی میللەت و دەستوەردانە ناو موڵك و ئافرەتانی ڕەعیەتەکەی. خەڵك ڕقیان لە میری بێبڕیار و هەڵەشە و ژنانی و ترسنۆك و ڕاڕایە. زیاد لەوەیش، پێویستە حاکم بەدەستی خۆی خەڵاتەکان دابەش بکات، بەرپرسیارێتیی سەپاندنی سزایش بە سەرۆك بەشەکان بسپێرێ، هەروەها لە هەموو ئەو شتانەی دەبنە مایەی ڕق و

نارەزایی، ئازادیی رەفتارکردنی گشتییان پێبدریّ ".. ئەگەر میللەت رقی لە میر بوو سەختترین قەلایش ناتوانیّ بیپاریزیّ.

ماکیافیلی ئامۆژگاری میر دەکات بەم شێوەیە رەفتار بکات:

پێویستە میر وەك سەرگەورەیەکی پێزان دەربکەویّ و رێز لە هەر کەس بنیّ کە لە هونەرێکدا پێشکەوتووە. بۆیە پێویستە رەعیەتەکەی هان بدات و بواریان بۆ برەخسێنیّ بەدڵنیاییەوە پیشەکانیان ئەنجام بدەن جا چ بازرگانی بیّ یان کشتوکاڵی یان هەر پیشەیەکیتر، تەنانەت نابێتە بەربەست لەبەدەم ئەو پیاوە کە موڵکەکانی نەڕازێنێتەوە لەترسی ئەوەی نەوەك لێی بسێنن، یان یەکێکیتر لە ترسی باج دەست لە کردنەوەی شوێنێکی بازرگانی هەڵنەگریّ.

ماکیافیلی زۆر سەرسام بووە بە یاداوەریەکانی رۆمای کۆن بەتایبەت بەو ئامۆژگاریەی ئاراستەی میر کراوە کە "پێویستە لە وەرزە گونجاوەکانی ساڵدا، بە ئاهەنگ و نمایش گەل دڵخۆش بکات".

ماکیافیلی ئیمانێکی بەهێزی بە بەخت و چارەنووس هەبوو، رەنگە ئەوەیش زادەی بیرکردنەوە بوو بیّ لە باوەڕبوونی خەڵکی سەردەمەکەی بە "ئەستێرەناسی" و دەڵیّ: "پێم وایە خواوەندی بەخت خاتوونی نیوەی کارەکانمانە و جەموجۆرکردنی نیوەکەیتریشی، یان کەمتر لە نیوەی بۆ خۆمان بەجێهێشتووە".

بۆچوونەکەی مەترسیەکی مامناوەندی هەبوو، چونکە باوەڕی وابوو مرۆڤ دەتوانیّ تا رادەیەك دەست بەسەر چارەنووسی خۆیدا بگریّ و "واباشترە بوێر بیّ نەك وریا، چونکە بەخت ژنە، بۆ ئەوەی ملکەچی بکەیت پێویستە لێی بدەیت و بەزبری لەگەڵی مامەڵە بکەیت..".

کتێبی "میر" بە ئامۆژگاریەك بۆ ئازادکردنی ئیتاڵیا کۆتایی پیّ دیّ، کە بانگەوازێکی زوڵاڵی نیشتمانپەروەرانەیە. ئیتر کاتی سەرهەڵدانی میرێکی نوێی

قارەمانی ئیتالی هاتووە، کە لە ئیتالیا بێتە پێش "لەو شپرزیەی تووشی بووە"، کە لە عیبریەکان کۆیلەتر و لە فارسەکان ئازارچەشتووتری دەستی ستەم و لە ئەسینیەکان لەبەریەك هەڵوەشاوەترە بەبێ سەرکردە و بەبێ سیستم، دۆڕاو و فەرهەودکراو و ونجن ونجنکراوە. ژێرپێ خراوە و دراوە بەدەم شێوەی جۆراوجۆری وێرانکاریەوە... دەبینین چۆن لە خوا دەپاڕێتەوە کەسێکی بۆ بنێرێ لەم ستەم و توندوتیژییە بەربەرییە رزگاری بکات. هەروەك دەبینین ئامادە و پەرۆشە بۆ شوێنکەوتنی هەر بەیداخێك ئەگەر کەسێك هەبێ بەرزی بکاتەوە".

میکافیلی بەرگریکردنە بەهێزەکەی بەم وشانە کۆتا پێدێنێ:

دواین دەرفەتی ئیتالیا ئەوەیە پێویستە چاوی لە هاتنی رزگارکەرەکەی بێ. دەبێ (ئەو میرە نوێیە) بەچ خۆشەویستیەکەوە لە هەموو پارێزگاکاندا پێشوازی بکرێ کە بەدەست شەپۆلی هاتنی بیانیەکانەوە نالاندویانە. دەبێ بە چ تینوێتیەك بۆ تۆڵەکردنەوە و بە چ دڵسۆزی و وەفایەکی نەگۆڕ و بە چ فرمێسکێك کە زمان لە ئاست دەربڕینیاندا لاڵە پێشوازی بکرێ و چ دەرگایەك لەدوایەوە دادەخرێن؟. چ خەڵکێك گوێڕایەڵیکردنی رەت دەکەنەوە؟ چ ئیتالییەك ملکەچ و لابەندی نابێ؟ ئەم ستەمە بەربەرییە لە هەموو لووتێکدا رۆدەچێ.

زیاتر لە سێ سەدە و نیو تێپەڕی بەر لەوەی خەونەکەی ماکیافیلی بۆ یەکخستنی ئیتالیا و رزگاربوونی لە فەساد و باڵادەستیی بێگانەکان بێتە دی.

چەند دانەیەکی دەستنووس لە کتێبی "میر" لە ژیانی میکافیلی خۆی و چەند ساڵێك پاش مردنیشی دابەش کران. ساڵی ۱۵۳۲ پاپا کلێمێنتی حەوتەم ئامۆزای ئەو میرەی کتێبەکەی بۆ کرابووە دیاری رەزامەندی لەسەر بڵاوکردنەوەی پیشاندا و لە بیست ساڵی پاشتردا ۲۵ جار چاپ کرایەوە. پاشان گەردەلول دەستی پێکرد، ئەوەبوو (ئەنجوومەنی سی) بڕیاریدئادەم سمیپەرجەم دانراوەکانی ماکیافیلی لەبەین ببرێن، لەبەرئەوەی لە رۆما بە ئیلحاد تۆمەتبار کرا و لەوێ و لە

هەموو جێیەکی ئەورووپا کتێبەکانی قەدەغە کران. یەسوعیەکان لە ئەڵمانیا پەیکەرێکی بچوکی ئەویان سووتاند. کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان پێکەوە دژایەتییان دەکرد. ساڵی ١٥٥٩ هەموو کتێبەکانی خرانە لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکان.

ماکیافیلی لە سەدەی نۆزدەیەمدا هەندێ لە گرنگی و بێتاوانی بۆ سومعەی گەڕایەوە. بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکان لە ئەمەریکا و فەرەنسا و ئەڵمانیا و هەموو جێیەك کاریان بۆ بەمەدەنیکردنی حکومەتەکان و جیاکردنەوەی کەنیسە لە حکومەت دەکرد. بزوتنەوەی ئازادیخوازی ئیتالی پەیدا بوو کە ئیلهامی لە نیشتمانپەروەری مەزن ماکیافیلی وەردەگرت، ساڵی ١٨٧٠ گەیشتە لوتکەی سەرکەوتنی خۆی. لە وتارێکی ماقوڵیدا دۆگلاس گریگۆری روونیکردەوە حاکمی ئیتالی ئەلکۆن کافور Cavour توانی ئیتالیا یەك بخات و داگیرکەران بکاتە دەرەوە، بەڵام هەر رێگەیەکیتری بگرتایەتە بەر وڵات تووشی کارەسات دەبوو و لە هەوڵەکانیدا شکستی دەهێنا.

کەس لاری لەوە نیە دیکتاتۆر و ملهوڕەکانی هەموو سەردەمێك ئامۆژگاریی بەکەڵکیان لە کتێبی "میر"دا دۆزیوەتەوە و خوێنەرانی پەرۆشی کتێبەکە لەنێویاندا زۆرن: هەریەك لە ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم و کاترینا دی میدیکی بەو کتێبە سەرسام بوون. ئۆلیڤەر کرۆموێڵ دانەیەکی دەستنووسی ئەو کتێبەی دەست کەوت، باوەڕی بە بنەماکانی هێنا و لە حکومەتی کۆمۆنوێڵس لە ئینگلتەرا جێبەجێی کرد. هەریەك لە هنری سێیەم و هنری چوارەمی فەرەنسی دانەیەکی کتێبەکەیان پێبوو. هەروەها ئەم کتێبە یارمەتیی فریدریکی مەزنیدا بۆ داڕشتنی سیاسەتی پروسیا. لویسی چواردەیەم ئەم کتێبەی کردبووە کڵاوی شەوانەی سەری. دانەیەکی لەنێو گالیسکەکەی ناپلیۆن بۆناپارتدا لە واترلو دۆزرایەوە، کە هەندێ پەراوێزی بۆ نووسرابوو. ناپلیۆنی سێیەم زۆربەی بیرۆکەکانی لەبارەی

حکومەت لەو کتێبەوە وەرگرتبوو. بیسمارك قوتابیەکی دڵسۆز و تازە بوو. ئەدۆلف هیتلەر –وەك خۆی دەڵێ– کتێبی "میر"ی لە نوێنەکەیدا هەڵگرتبوو و سەرچاوەیەکی بەردەوامی ئیلهام بوو بۆی. بێنیتۆ مۆسۆلینی دەڵێ: "باوەڕم وایە کتێبی میر–ی ماکیافیلی رابەرێکی نایابە بۆ مرۆڤی سیاسی. رێبازەکەی ئەمڕۆ زیندووە لەبەرئەوەی لە ماوەی چوارسەد ساڵدا گۆڕانکاریی قووڵ لە عەقڵی خەڵك یان کاری نەتەوەکاندا رووی نەداوە". (مۆسۆلینی پاشتر رای گۆڕی، ئەوە بوو ساڵی ١٩٣٩ ناوی ماکیافیلی خرایە لیسستی رەشی ئەو دانەرە کۆن و نوێیانەی بەپێی پێرستی کتێبە فاشیستیەکان، قەدەغە بوو کتێبخانەکانی رۆمان ئەو کتێبانە نمایش بکەن).

لەلایەکیترەوە، ئەو شرۆڤەکارانەی لە رووداوە مێژووییەکان ورد بوونەتەوە ئەوەیان روون کردۆتەوە کە دەسەڵاتدارانی ملهوڕی وەك هیتلەر و مۆسۆلینی بەگشتی کۆتاییەکی رەشیان تووش هات لەبەرئەوەی هەندێ لە بنەما بنچینەییەکانی بیری میکافیلییان فەرامۆش کرد، یان بەخراپ لێکدایەوە.

ئەوانەی لە رێبازی میکافیلییان کۆڵیوەتەوە کۆکن لەسەر ئەوەی ناتوانین بەتەواوی لە بۆچوونەکانی بگەین تا هەردوو کتێبی "گفتوگۆکان" و "میر"ی نەخوێنینەوە، چونکە کتێبی (گفتوگۆکان) کە زیاتر لە پێنج ساڵ بەدانانیەوە خەریك بووە و بۆ یەکەم جار لە هەمان ئەو ساڵەدا بڵاو بوویەوە کە کتێبی "میر"ی تێدا بڵاو کرایەوە، زۆر لە "میر" قەبەترە. جیاوازیی نێوانیشیان، وەك هەندێ کەس دەڵێن، ئەوەیە (گفتوگۆکان) باس لەوە دەکات "کە پێویستە ببێ" لەکاتێکدا "میر" باسی ئەوە دەکات کە "هەیە". "میر" بەتەواوی تایبەتە بە میرنشینەکان، واتە بەو دەوڵەت یان دەوڵەتۆکانەی پاشایەك حوکمڕانییان دەکات، لەکاتێکدا (گفتوگۆکان) تایبەتە بەو بنەمایانەی پێویستە کۆمارەکان پەیڕەوییان بکەن.

مرۆڤ بە خوێندنەوەی بەراوردکاریانەی ئەو دوو کتێبە دەگاتە ئەو دەرەنجامە سەرسوڕهێنەی کە ماکیافیلی کەسێکی کۆماریخواز بووە و باوەڕی بە بنەمای کۆماری هەبووە. تاکڕەوی خۆشنەویستووە و پێی وابووە حکومەتی ئاوێتە کە لە هەردوو حکومەتی میللی و پاشایی پێکهاتبێ ،باشترین حکومەتە. هیچ حاکمێک بەبێ خۆشەویستیی گەلەکەی تامی ئاسایش و ئارامی نەکردوە. دامەزراوترین حکومەتەکانیش ئەوانەن میرانێك حوکمیان دەکەن بە دەستوور بەستراونەتەوە. وەك لە هێرشکردنی بۆ سەر ئەو پەندە کۆنەی دەڵێ "ئەوەی لەسەر گەل بینا بکات بینا لەسەر لم دەکات" دەردەکەوێ، بەلای میکیافیلیەوە حوکمی گەل، دروستە و لە کتێبی " گفتوگۆکان"دا بەزۆری ئاماژەی پێ دەدات.

کەواتە لە بارێکدا ماکیافیلی بۆ گەلێکی ئازاد حکومەتی کۆماری لە باقیی حکومەتەکان پێ باشتر بووە، بۆچی کتێبی "میر"ی بەرهەم هێنا؟ ماکیافیلی ئەو کتێبەی بۆ سەردەمێکی دیاریکراو و هەندێ هەلومەرجی دیاریکراو داناوە. بەدڵنیاییەوە دەیزانی مەحاڵە لە سەدەی شازدەیەمدا دەوڵەتێکی کۆماری لە ئیتاڵیا دابمەزرێ. کتێبی "میر" بەتایبەت بۆ ئەوە دانرا تا پاڵپشتیی خەڵکانی بەهێز بەدەست بێنێ لەپێناو رزگارکردنی گەلی ئیتالی لەو چەرمەسەریەی تێی کەوتبوون و رزگارکردنی دەوڵەت لە گەندەڵیی سیاسی.

لەو راستیانەی بەکەمی جێی مشتومڕن ئەوەیە، بەر لە کارل مارکس هیچ کەسێك وەك ماکیافیلی ئەو کاریگەرییە شۆڕشگێڕانەیەی لەسەر هزری سیاسی نەبووە. ئەو هەر بەڕاستی شایستەی نازناوی "دامەزرێنەری زانستی سیاسەت"ـە.

## ٢- "زانینی گشتی"

## تۆماس پین Thomas Paine

## شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا

هیچ کەسێکی ژیر پێشبینیی ئایندەیەکی گەشی بۆ تۆماس پین نەدەکرد کاتێك لە تەمەنی سی و حەوت ساڵیدا گەیشتە ئەمەریکا، چونکە تا ئەوکاتە ژیانی زنجیرەیەك شکست و نائومێدی بوو. دەستی بۆ هەر پرۆژەیەك بردبێ شکستی هێناوە. کەواتە چی وامان لێدەکات باوەڕمان وابێ ئەم میوانە نوێیەی دنیا نوێیەکە (واتە ئەمەریکا) لە ماوەی چەند ساڵێکدا ببێتە یەکێك لە گەورەترین نامیلکەنووسەکان لە زمانی ئینگلیزی و یەکێك لە گەورەترین توێژەران لە مێژووی ئەمەریکیدا؟!. ئەو ورووژێنەری دڵەڕاوکێ سیاسیەکان و شۆڕشگێڕێکە لە هەموو داگیرگە (کۆلۆنی)ــە بەریتانی ئەمەریکیەکان و بەریتانیای مەزن و خۆرئاوای ئەورووپادا ناوی دەرکرد، هەندێ لێی ترسان و رقیان لێی بوو هەندێکیش ستایشیان کرد و رێزیان لێنا.

وادیارە گەشتی ئۆقیانوس گۆڕانێکی سەیری لە کەسایەتی و ئەخلاقیی ئەودا دروست کردوە، بەشێوەیەك لە شەو و رۆژێکدا لە زرنگیەکی مامناوەندەوە بیگۆڕێ بۆ هەڵکەوتن.

ئەگەر لە ساڵانی بەرایی تەمەنی پین وردبینەوە، دەبینین بەفیڕۆ نەچووە، بەڵکو لەڕاستیدا جۆرە ئامادەکردنێك بووە بۆ ژیانە تازەکەی. پین لە ٢٩ی کانوونی دووەم/یەنایەری ١٧٣٧ لە تیتفۆرد کانتۆنی نۆرفۆلك Norfolk لە رۆژهەڵاتی ئینگلتەرا لەدایك بووە، لە باوکێکی سەر بە تایفەی دۆستانی مەزەبی ئاینیی

جۆرج فۆکس و لە دایکێکی ئەنگلیکانی.. لە سەرەتای چاوکرانەوەیەوە هەژاریی نوتەك و نەداری و چەرمەسەری چەشتووە. لە قوتابخانەی ئەجرومیدا خوێندوێتی تا گەیشتۆتە تەمەنی سیازدە ساڵی و وەك خۆی دەڵێ "فێرکردنێکی ئەخلاقیانەی زۆر باش و بڕێکی باش لە زانیاریی بەکەڵکی وەرگرتووە". بەهرە سروشتیەکەی لە زانست و داهێناندا -لە ڕووی کرداریەوە- دەرکەوت و بەدرێژایی ژیانی پڕ لە کاری بەردەوامی، لەگەڵی مایەوە.

دوای ئەو خوێندنە سادە و ڕواڵەتییە، پین دەستی دایە فێربوونی پیشەکەی باوکی لە پیشەسازیی کەمەربەند (کورسیهات) و سێ ساڵیش بەوەوە خەریك بوو. پاشان جوانیی دەریا و وەڕسی لە کارکردن لەسەر هەمان ڕیتم، وایان لێکرد ماڵەکەیان بەجێ بێڵێ و خۆی بگەیەنێتە کەشتیی چەتەگەری جەنگی تێریبڵ Terrible بەسەرکردایەتیی کەشتیەوانێك بەناوێکی تۆقێنەر کە ناوی "مەرگ" بوو. باوکی لەدەستیان ڕزگاری کرد و دەستی کردەوە بەکارەکەی لە پیشەسازیی "کورسیهات" تا بوو بە نۆزدە ساڵ. جارێکیتر گەڕایەوە سەر چەتەگەریی جەنگی بۆ تاڵانکردنی کەشتیەکانی دوژمنان و بۆ ماوەیەکی کورت لە کەشتیی "پاشای پروسیا"دا کاری کرد. پاش دامرکانەوەی تامەزرۆیی بۆ سەرکێشیی دەریا، جارێکیتر لە دوکانێکی پیشەسازیی کورسیهاتدا دەستی بە پیشە یەکەمەکەی کردەوە، بەڵام نەك لە تیتفۆرد بەڵکو لە لەندەن. کاتە بەتاڵەکانیشی بە گوێگرتن لە وانەی فەلەکناسی بەسەر دەبرد.

پاش ئەوە ساڵانێکی لە گەشتی سەخت و نۆقرەنەگرتنی لە هیچ شتێکدا بەسەر برد...لە ساندویچ کارەکەرێکی هەتیوی مارە کرد، بەڵام لە ساڵی یەکەمی هاوسەرگیریەکەیاندا مرد. باوکی ژنەکەی فەرمانبەر بوو لە چاودێریکردنی بەرهەمدا. بوونی کاتی بەتاڵی پێویست بۆ ئەنجامدانی کاریتر، پین-ی بۆ ئەو وەزیفەیە کێش کرد و توانی ببێتە فەرمانبەر لە کارگێڕیی چاودێریکردنی بەرهەم.

هیچ ڕێگەیەکیتر وەك ئەم ڕێگەیە نەبوو بۆ لەدەستدانی هاوڕێیان و دوورکەوتنەوە لە خەڵك، چونکە کاری ئەو گرتنی بەقاچاخبەرانی کاڵاکان بوو، لەبەرئەوە دەوڵەمەند و هەژار دژی بوون، پاشتریش بەهۆی سستیکردنی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان لە کارەکەی دەرکرا. پاش ئەوە گەڕایەوە سەر پیشەسازیی کورسیهات و ماوەیەکی کەم تێیدا مایەوە، ئەنجا لە کێنسینگتۆن بوو بە مامۆستا بە مووچەی ٢٥ جونەی لە ساڵێکدا، کە بەشی قوتی پێویستی ژیانیشی نەدەکرد. بەڵام پاش ئەوە گەڕایەوە بۆ چاودێریکردنی بەرهەمهێنان و ساڵی ١٧٧١ بۆ جاری دووەم ژنی هێنایەوە و چوو بۆ لای ژنەکەی و خەسووی لە لویس لە بەڕێوەبردنی دوکانێکی بازرگانیی توتن و بەقاڵی، ئەویش وەك زیادەکارێك بۆ زیادکردنی داهاتی.

پین لەو ساڵانەی دواییدا کاتێکی زۆری لە خانەی "وایت هارت" White Hart و ئامادەبوونی کۆبوونەوەکانی یانەیەك کە بووبووە ئەندام تێیدا، بەسەر دەبرد. ڕۆژنامەیەکی لەبارەی بابەتە هەرە جدیەکانەوە دەردەکرد، هەندێ جاریش بەشداریی موناقەشەی گەرموگوڕی دەربارەی ڕووداوە ڕۆژانەکان دەکرد. کاتێك دەموپلی لە مشتومڕدا دەرکەوت هاوڕێکانی هەڵیانبژارد تا لەبری ئەوان داوای زیادکردنی کرێ و باشکردنی هەلومەرجی کارکردنیان بکات. ئەویش چەند هەفتەیەك بە ئامادەکردنی سکاڵایەك بەناونیشانی "پرسی فەرمانبەرانی چاودێریکردنی بەرهەم و بۆچوونە تایبەتەکان بەو خراپیەی لە هەژاریی فەرمانبەرانی چاودێریکردنی بەرهەم کەوتۆتەوە" بەسەر برد. لە زستانی ١٧٧٢-١٧٧٣ چوو بۆ لەندەن بۆ پێشکەشکردنی ئەو سکاڵانامەیە بە ئەندامانی پەرلەمان و فەرمانبەرانیتر.

ئەو سکاڵانامەیەی پین لەبری هاوڕێکانی پێشکەشی کرد نەك هەر ڕەفز کرا، بگرە بەتۆمەتی پشتگوێخستنی ئەرکەکانی، لە کارەکەیشی دەرکرا و دوکانی فرۆشتنی

توتنەکە هەڵشکا و کەوتە سەر ساجی عەلی و ناچار بوو کەلوپەلی ماڵەکەی بفرۆشێ تا بەهۆی قەرزەکانیەوە نەخرێتە زیندان. لە ژنەکەیشی جیا بوویەوە. لەکاتێکدا دەگەیشتە ناوەڕاستی تەمەن، بەتەنهایی بە باخەڵی خاڵی بەجێهێڵرا.

بەخت یاوەری بوو لەکاتی مانەوەی لە لەندەن چاوی بە بێنجامین فرانکلین کەوت، کە وەك باڵیۆزی کۆلۆنیەکان ڕەوانەی ئەوێ کرابوو. ڕەنگە فرانکلین دەرکی بە بلیمەتیی پەین کردبێ، هەربۆیە هانیدا کە بەختی خۆی لە ئەمەریکا تاقی بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی ڕاسپاردنی دایە بۆ مێردی کچەکەی، ریچارد باچ لە فیلادلفیا، تێیدا باسی ئەوەی کرد کە پەین "لاوێکی بلیمەت و بەتوانایە" و داوای کرد وەك نووسەر یان مامۆستای یاریدەدەر لە قوتابخانەیەك یان وەك یاریدەدەری ڕووپێو دایبمەزرێنێ. نامەکەی فرانکلین سەرمایەی سەرەکیی پەین بوو کاتێك لە سەرەتاکانی مانگی کانوونی دووەمی ١٧٧٤دا لە فیلادلفیا دابەزی.

پەین سەرمایەیەکیتری گرانبەهایشی لەگەڵ خۆی برد، ئەویش ئەزموونی رابردووی بوو. پەین تێبینی ئەو وەحشیەتە بەرابیەی کرد کە دادپەروەری لە ئینگلتەرا لەسەری دەڕۆیشت، تاڵاوی هەزاری چەشت، زۆری لەبارەی مافە سروشتیەکانی مرۆڤ بیست و خوێندەوە، هەروەها ئەو کاپە گەورەیەی بینی کە لەنێوان ژیانی ملیۆنان مرۆڤی ئاسایی و ژیانی چەند هەزار کەسێك لە بنەماڵەی پاشایەتی و وەجاخزادەکان لە بەریتانیا هەیە، هەروەها بەو ڕێگەیەی زانی کە نوێنەرانی گەندەڵی هەرێمەکان لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی House of Commons دا دەیگرنە بەر، هەروەك پەی بە گەندەڵی و دەبەنگیی بنەماڵەی شاهانە برد. کاتێك بەقووڵی لەم شتانە ڕاما، زۆر بەزەیی بە مرۆڤایەتیدا هاتەوە، هەروەها شەیدای دیموکراسی بوو و پاڵنەرێکی بەهێزی بۆ ریفۆرمی گشتیی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێدا دروست بوو.

پاش گەیشتنی پەین بۆ فیلادلفیا، هەر زوو لە گۆڤاری پێنسلڤانیادا، کە تازە دەرچووبوو، کرایە نووسیار (محرر). زۆربەی ئەو هەژدە مانگەی لەو گۆڤارەدا کاری کرد لەو وەزیفەیەدا مایەوە و زۆری نەبرد کاروانی دووروودرێژی خۆی وەك سەرکێشێکی ریفۆرمخواز دەست پێکرد. وتارێکی بڵاو کردەوە و تێیدائادەم سمیپەرکۆنەی دیاردەی بەکۆیلەکردنی زنجی (رەشپێست)ەکانی کرد و بەپێداگریەوە داوای ئازادکردنی کۆیلەکانی کرد. پێنج هەفتە پاش ئەوە یەکەمین کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆ بەرەنگاریکردنی کۆیلایەتی پێکهات. پاش ئەوەیش کۆمەڵێ وتاری نووسی و داوای یەکسانیی مافی بۆ ئافرەتان کرد و پێشنیاری دانانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە پاراستنی مافی چاپ و بڵاوکردنەوە و بەزەییهاتنەوە بە ئاژەڵ و وەلانانی جەنگ بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان وڵاتان کرد.

لەکاتێکدا ئەو وتارانەی دەنووسی، جەنگێکی نێودەوڵەتی بەرپا بوو کە رۆڵێکی گرنگی تێدا گێڕا. ئەوە بوو لە بەهاری ساڵی ١٧٧٥ شەڕەکانی کۆنکۆرد Concord و لێکسینگتۆن Lexington و بەنکەر هیڵ Bunker Hill هەڵگیرسان. پاش کوشتارەکەی لێکسینگتۆن لە مانگی نیسان/ئەپرێل، پەین بۆ بنجامین فرانکلینی نووسی "دژوارە بۆ من ببینم هەر کە گەیشتە ئێرە، بەبەرچاومەوە شەڕ لە وڵات هەڵبگیرسێ".

لە کۆلۆنیەکاندا بۆچوون لەبارەی ئەو شێوازەی پێویستە بیگرنە بەر جیاواز بوو. بۆچوونەکان لەمسەرەوە لە پەرگیرەکانی وەك سەمۆیل ئادەمز و جۆن هۆنکۆکەوە، کە زۆر سوور بوون لەسەر جەنگ دەستی پێدەکرد، تا دەگەیشتە کۆنەخوازەکانی سەر بە پاشا. جۆرج واشنتۆن و بینجامین فرانکلین و تۆماس جافرسۆن لەو سەرکردانە بوون کە لایەندییان بۆ بەریتانیا پیشان دەدات و نەیاری بیرۆکەی جیابوونەوە و سەربەخۆیی بوون. بڕیاری هەردوو کۆنگرەی کۆنتنتالی

یەکـەم و دووەم جـەختیان لـە لابەنـدی (ولاو) بـۆ تـاج کـردەوە و تـەنیا داوای سافکردنێکی دادپەروەرانەی داواکانیان دەکرد.

لـە ناوەنـدی ئـەو بیرکردنـەوە شـلۆق و کێشـمەکێش و بۆچـوون و پاڵنـەرە دژبەیەکانەدا، تەنیا یەك پیاو هەبوو کە بەڕوونی ئاراستەی رووداوەکان و ئەنجامە چـاوەڕوانکراوەکانی دەبینـی. هـەر لـە سـەرەتاوە تۆمـاس پـین بـڕوای وابـوو جیابوونـەوە لـە ئینگلتـەرا شـتێکی حەتمییـە و سـاڵی ١٧٧٥ی بـۆ نووسـینی بۆچوونەکانی تەرخان کرد. بەر لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی، پیشانی ژمارەیەك لە هاوڕێکانی دا لەنێویاندا دکتـۆر بێنجامین روش کـە پێشـنیاری کـرد ناونیشـانی نامیلکەکە زانینی گشتی "الادراك العام" بێ، پارمەتیشیدا بۆ دۆزینەوەی بڵاوکارێك بەناوی رۆبێرت بێڵ کە چاپخانە و کتێبخانەیەکی لە فیلادلفیا هەبوو.

"الادراك العـام" لـە ١٠ی یەنایـەری ١٧٧٦ بـڵاو بوویـەوە، کـە ٤٧ لاپـەڕە و نرخەکەیشی دوو شلین بوو. لە ماوەی سێ مانگدا ١٢٠ هەزار دانـەی لـێ فرۆشـرا و کۆی گشتیی فرۆشراوەکانیشی گەیشتە نزیکەی نیو ملیۆن دانە، ئەویش بەبەراورد بە ژمارەی دانیشتوان، وەك ئـەوە وایـە ئـەمڕۆ (ئـەم کتێبـە لـە سـاڵی ١٩٧٧ بـڵاو کراوەتەوە-وەرگێڕ)، لە ئەمەریکا ٣٠ ملیـۆن دانـەی لـێ بفرۆشـرێ. لەڕاسـتیدا لـە سێ کۆلۆنیەکە هەر کەسێك خوێندەواری هەبێ دەبێ خوێندبێتیەوە. لەگـەڵ ئـەم فرۆشە گەورەیەدا رازی نەبوو یەك بەنس لە داهاتی ئەو نامیلکەیە وەربگرێ.

لە مێژووی ئەدەبدا هیچ شتێك نیە لە کاریگەریی فەوریدا شـان لـە شـانی "زانینـی گشتی" بدات. زەنگێك بوو بۆ کۆلۆنییە ئەمەریکیەکان تا بەبێ قبوڵکردنی سوڵح و دوودڵی لەپێناو سەربەخۆییاندا بجەنگن. ئەو کتێبە بۆی روون کردنەوە کە شۆڕش تاکە چارەسەری خەباتیانە دژی بەریتانیای مەزن و جـۆرجی سـێیەم. پـین گـوتی "مـادام جگـە لـە زللـە هـیچ شـتێك داد نـادا، دەی بـۆ خـاتری خـوا بـا بـەرەو جیابوونەوەی یەکجاری بڕۆین، ئێمـە لـە هەڵوەشـاندنەوەی یاسـاکان بـاجێکی زۆر

گەورە دەدەین ئەگەر ئەمە هەموو ئەوە بێ لە پێناویدا دەجەنگین... ئەمە بابەتی شارێك یان كانتۆنێك یان مەملەكەتێك نیە، بەڵكو بابەتی كیشوەرێكە.. ئەمە چارەنووسی رۆژێك یان ساڵێك یان نەوەیەك نیە، بەڵكو زۆربەتەكەمان هەموو لەم ئەزموونەدا هاوبەشە. ئێستا كاتی وەشاندنی تۆوی یەكێتی و باوەڕ و شەرەفی كیشوەرێكە..سەربەخۆیی تاكە بەستەرە كە پارێزگاری لە پێكەوەبەسترانمان دەكا".

پێشەكیی "زانینی گشتی" بڕگەیەكی نەرم و هێمنكەرەوەیە.

بەشی یەكەمی نامیلكەكە باس لە سەرهەڵدان و سروشتی حكومەت دەكات، لەگەڵ جێبەجێكردنێكی دیاریكراوی دەستووری ئینگلیزی. فەلسەفەی نووسەر لەبارەی حكومەتەوە لەم جۆرە دەربڕینانەوە دەردەكەوێ:

حكومەت، تەنانەت لە باشترین دۆخیشیدا، شەڕێكی ناچارییە، لە خراپترین دۆخیشیدا بەڵایەكی ناگەهانە... حكومەت وەك جلوبەرگ وایە، نیشانەی بەرائەتێكی ونبووە.. چەندە مەدەنیەت كامڵتر بێ كەمتر پێویستی بە حكومەت دەبێ.

سەرهەڵدان و دروستبوونی حكومەت بەهۆی شكستی ئەخلاقە جوانەكان لە حوكمڕانیكردنی جیهان بووەتە شتێكی پێویست.

جیاوازیەكی گەورە لەنێوان كۆمەڵگە و حكومەتدا هەیە. خەڵك بۆ لای كۆمەڵگە كێش دەبن و لەڕێی هاوكاریی كۆمەڵایەتیەوە دەتوانن هەندێ پێویستیی دیاریكراویان دەست بكەوێ. لەم حاڵەتەدا مرۆڤ هەندێ مافی سروشتی دیاریكراوی هەیە وەك ئازادی و یەكسانی. بەشێوەیەكی نموونەیی، پێویستە مرۆڤ بتوانێ بەبێ حكومەت بەئاشتی و بەختەوەری بژی ئەگەر پاڵنەرەكانی ویژدان روون و هاوئاهەنگ و لەبار بن. بەڵام لەبەرئەوەی مرۆڤ بەسروشت لاواز و لە رووی ئەخلاقیشەوە ناكامڵە، پێویست بەبوونی هێزێكی سڵەمێنی وەك حكومەت دەكات.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئاسایش و پێشکەوتن و ئاسوودەیی گەل زیاتر لەسەر کۆمەڵگە دەوەستێ نەك حکومەت. بەدەمەوەهاتنی کۆمەڵگە و نەریت و پەیوەندییە دووسەرەکانی نێوان خەڵك، لە هەر دەستوورێکی سیاسی بەهێزترن.

پاش ئەوە پین چەند سەرنجێك لەسەر ئەو دەستوورەی ئینگلتەرا زۆر خۆی پێوە هەڵدەکێشا دەخاتە روو و دەڵێ: "بەڵگەنەویستە کە (ئەو دەستوورە) لەو سەردەمە تاریك و قەڵبەی تێیدا دارێژراوە، شتێکی نازدار بووە.. ئاخر کاتێك ستەمکاری جیهانی داگرت، کەمترین خۆراپسکاندن لەو ستەمە رزگاربوونێکی جوامێرانە بوو. بەڵام ئاسانە ئەوە روون بکرێتەوە کە ناکامڵە و ئەگەری تەئویلکردنی دژبەیەکی لێ دەکرێ و ناتوانێ ئەوە بەدیبێنێ کە بەرواڵەت گفتی بەدیهێنانی دەدات".

گرنگترین سیفەت کە پێویستە لە حکومەتدا هەبێ بریتییە لە (بەرپرسیارێتی)، کە بەلای پین-ەوە ئەمە بەهیچ شێوەیەك لە دەستووری بەریتانیدا روون نییە. ئەوەندە ئاڵۆزە مەحاڵە بزانرێ کێ لە شتێکی دیاریکراو بەرپرسە. تاکە بەشی جێدڵخۆشی لەو دەستوورەدا بریتییە لە مافی گەل، لانیکەم لە رووی تیۆرییەوە. ئەوەتا دەڵێ ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی (عموم) بە هەڵبژاردن دێنە هەڵبژاردن. پین پێشنیاری یەك هۆڵی یاسادانانی بۆ کۆلۆنیەکان دەکرد کە ئەندامان و سەرۆکەکەی بەشێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێرن، وەزارەتێکیشیان هەبێ کە لەبەردەم کۆنگرێسدا بەرپرس بێ.

پین پیسترین داشۆرین و گەورەترین سوکایەتی لە نانێکی گەرمدا بۆ دەستووری پاشایەتیی میراتی پێچاوەتەوە. هێرشی کردە سەر بنچینەی بنەمای پاشایەتی بەتایبەت فۆرمە ئینگلیزیەکەی ئەو بنەمایە.

جیهان بۆ یەکەم جار حکومەتی پاشاکانی لە بتپەرستەکانەوە بۆ مایەوە، لەو نەریتەیشدا نەوەکانی ئیسرائیل لاساییان کردنەوە. ئەوە بەرەونەقترین داهێنان

بـوو کـە شـەیتان بـۆ بڵاوکردنـەوەی بتپەرستی دایمەزراند. بتپەرسـتان جۆرەهـا پەرستنیان بۆ پاشا مردوەکانیان دەکرد. جیهانی مەسیحیش هەمان شتی بۆ پاشا زیندووەکانی کرد. ئێمە شەڕی مافی میراتگرتنیشـمان بـۆ شـەڕی پاشـایەتی زیـاد کرد. لەو رووەوە شەڕی یەکەم خۆ بێنرخکردن و خۆکەمکردنەوە بوو، ئەوا شـەڕی دووەم، وەك مـــاف، ســـووکایەتی بـــوو پێمـــان و بەســـەر نەوەکانمانـــدئادەم سمیپـەپێنرا... لـە گـەورەترین بەڵگـە سروشـتیەکان لەسـەر هیچوپوچـیی مـافی میراتگریـی پاشـاکان ئەوەیـە سروشـت خـۆی بێـزی لێـدەکات، ئـەگینا گاڵتـەمان پێدەکات و لەبری "شێر"، "کەر"مان دەداتێ.

گەڕانەوەی شەرعیەتی میراتگریی ئینگلیزی بۆ تەخت بۆ سەردەمی غەزو، شـتێکە بەلای پین-ەوە جێگومانە و دەڵێ "دەمڕووتێکی فەرەنسی لە ئینگلتەرا دابەزی و تاقمێکی چەکداری لەتەك بوو، بەبێ رەزامەندیی دانیشـتوانە نیشتمانیەکان خـۆی کردە پاشای ئینگلتەرا، ئەمەیش بەدڵنیاییەوە سەرهەڵدانێکی سووك و بێنرخانەیە و بەدڵنیاییەوە هیچ شتێکی ئیلاهـی تێدا نیـە". خـۆ ئەگـەر سیسـتمی پاشـایەتی تیمێك خەڵکی بەڕەوشـت و ژیـر و دانـا مسـۆگەر بکـات ئـەوە لاریمـان نیـە، بـەڵام "دەرگایـەك بـۆ کەسـانی دەبـەنگ و خراپـەکار و خراپکـراوان دەکاتـەوە".. ئـەو خەڵکانەی وا تەماشای خۆیان دەکەن کە ئـەوان لـەدایك بـوون تـا حـوکم بکـەن و خەڵکیتریش لەدایك بوون تا گوێڕایەڵ بن، هەر زوو خوێڕی دەبن. ئەوانە جیاواز لـە بـاقیی رەگـەزی مرۆڤایـەتی لـە سـەردەمێکی زووەوە عـەقڵیان بـە خۆبـەزلزانی و لوتبەرزی ژەهراوی بووە.. کاتێکیش بە میرات حکومەت وەردەگرن، بەزۆری نەزان دەبن و لە سەرتاسەری شانشیندا بەکەڵکی هیچ شتێك نایەن".

رێگـەدان دانیشـتنی کەسـانی منداڵکـار و پـیر لەسـەر تـەختی پاشـایەتی، کۆمـەڵێ خراپـە و بـەدکاری لـێ دەکەوێتـەوە، چـونکە لـە حاڵـەتی یەکەمـدا حـوکمی

ڕاستەقینەی شانشین بەدەست سەرپرس (وصي)ی تەختەوە دەبێ، لە حاڵەتی دووەمیشدا حوکم دەکەوێتە ژێر ئارەزووی پاشایەکی پیر و داڕزاو.

لە وەڵامی ئەو قسەیەیش کە میراتگریی تەخت ڕێگە لە ڕوودانی شەڕی ناوخۆ دەگرێ، پەین ئاماژەی بەوەدا کە لە سەردەمی پەلامار (الغزو)ەوە "لانیکەم هەشت شەڕی ناوخۆ و نۆزدە یاخیبوون لە ئینگلتەرا ڕوویان داوە". دەڵێ "پاشا لە ئینگلتەرا جگە لە ڕاگەیاندنی جەنگ و دابەشکردنی پۆستەکان کارێکی زۆر کەم دەکات، ئەمەیش مانای هەژارخستنی گەلە. چ کارێکی نایابە پیاوێك ساڵانە هەشتسەد هەزار جونەیهی ئیستەرلینی لێ وەربگرێ و لەبەر ئەو کارەیش بپەرسترێ! تاکە پیاوێکی دەستپاك لە کۆمەڵگە و لە دیدی خوادا لە هەموو ئەو پیاوە بازاڕییە بەپاشاکراوانە بەنرخترە کە لەم دنیایەدا ژیاون.

پەین لە چەند بڕگەیەکدا ڕێزی خۆی بۆ جۆرجی سێیەم پیشان داوە. ئەوەتا پاش قەسابخانەکاریەکەی لیکسنگتۆن دەنووسێ و دەڵێ "من بۆ هەتاهەتایە فیرعەونی دڵڕەق و بەدسروشتی ئینگلتەرا فڕێ دەدەم، هەروەها ڕقم لەو هیچوپووچەیە کە بەساختە ناوی لێنراوە "باوکی گەل"، لەکاتێکدا هەواڵی قڕتێخستنی گەلەکەی دەبیستێ بەبێ ئەوەی هەستی ببزوێ، بەئاسوودەیی ئەخەوێ لەکاتێکدا ئەوان خوێنیان لەسەر ڕۆحی ئەوە". پاشان دەڵێ "هەندێ کەس دەڵێن ئەی پاشای ئەمەریکا لەکوێیە؟ هاوڕێم منیش وەڵامت دەدەمەوە. ئەو لەسەرەوە حوکم دەکات و وەك پاشا وەحشەکەی بەریتانیا کار بۆ لەناوبردنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی ناکات".

پەین لەبارەی ئەو قسەیەی کۆنەخوازان (المحافظین) کە پێیان وابوو ئەمەریکا بەهۆی پەیوەندی بە ئینگلتەراوە گەشەی کردووە گوتی: ئەمەریکا بەو ئەندازەیە و زیاتریش گەشەی دەکرد ئەگەر هیچ هێزێکی ئەورووپی دەستیان نەخستایەتە کاروبارەکانی، چونکە ئەو کاڵا بازرگانیانەی ئەمەریکا خۆی پێ دەوڵەمەند

کردوون، پێویستیەکانی ژیانن و تا ئەوکاتەی خەڵکی ئەورووپا عادەتیان هەبێ بخۆن هەمیشە بازاڕ بۆ ساغکردنەوەیان دەبێ.. گەنمی ئێمە لە هەر بازاڕێکی ئەورووپیدا پارە دێنێ، ئەو کالآیانەیش هاوردەیان دەکەین دەبێ نرخەکەیان بدەین، بۆیە دەتوانین لە کوێ پێمان خۆش بێ بیانکڕین.
هەرچی ئەو قسەیەش ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێ بەریتانیا کۆلۆنیەکانی لەدژی ئیسپانی و فەرەنسی و هیندیەکان پاراستووە و دەڵێ "دەکرا بەریتانیا بەهەمان پاڵنەر، واتە لەبەر بازرگانی و کۆلۆنیەکان، تورکیایشی بپاراستایە. بەهەرحاڵ ئەو پاراستنە وەك چۆن لەسەر حسابی ئەوان بووە لەسەر حسابی ئێمەیش بووە".
پین دەرکی بەوە کردبوو بەهێزترین پەیوەندی کە پارێزگاری لە جیانەبوونەوەی کۆلۆنیەکان دەکات، بیرۆکەیەکی عاتیفیی بەریتانییە، ئەگەر ئەمە ڕاستیش بێ. ئاخر تەنانەت دڕندەکانیش بەچکەکانیان ناخۆن و خەڵکە کێویەکانیش جەنگ دژی خێزانەکانیان ڕاناگەیەنن.. ئەوەتا پاشا و دەست و پێوەندەکانی دەستەواژەی "دەوڵەتی دایك یان دایکە دەوڵەت"یان بەشێوەیەکی یەسوعیی و پاپەوییانەی بێنرخ بەکار هێناوە بەمەبەستی بەدەستهێنانی لایەنگریەکی نادادپەروەرانە بەهۆی عەقڵی سادەیی ئێمەوە، چونکە ئەوە ئەورووپایە کە دایکە دەوڵەتی ئەمەریکایە نەك ئینگلتەرا. پین گوتی، دنیا نوێیەکە (مەبەست ئەمەریکایە کە تازە دۆزرابوویەوە) پەناگەی شەیدایانی چەوساوەی ئازادیی مەدەنی و ئاینیی سەرتاسەری ئەورووپا بووە. ژمارەی ئەو دانیشتوانەی بەئەسڵ ئینگلیزن تەنانەت لەم پارێزگایەشدا ناگاتە سێ-یەکی کۆی دانیشتوان، لەبەرئەوە پەست دەبم بەوەی دەستەواژەی "دەوڵەتی دایك یان دایکە دەوڵەت" تەنیا بۆ ئینگلتەرا بەکار بێ. ئەمە خۆپەرستی و ساختە و چاوچنۆکی و بیرتەسکییە.
لەبارەی هۆشداریەکەی جۆرج واشنتۆن کە "لە بەستنی هاوپەیمانێتیی هەمیشەیی لەگەڵ هیچ بەشێك لە جیهانی بیانی دوور بکەوینەوە" و لەبارەی سیاسەتی

تۆماس جیفرسۆن کە جەختی لە "ئاشتی و بازرگانی و دۆستایەتی راستگۆیانە لەگەڵ هەموو گەلان (دەکرد) و نەکەوینە هاوپەیمانی لەگەڵ هیچکام لەوانە"، پێی ئاماژە بەوە دەکات کە بوونی پەیوەندیی بەردەوام لەگەڵ بەریتانیا چەندین خراپی تێدایە: .. لەبەرئەوەی هەر ملکەچی یان پشتبەستنێك بە بەریتانیای مەزن دەبێتە مایەی بەشداریکردنی راستەوخۆی ئەم کیشوەرە لە جەنگ و شەڕە ئەوروپیەکاندا و دەمانکاتە دوژمنی نەتەوەکان کە هیچ کێشە و سکاڵایەکمان لەنێواندا نیە، کە بەبێ ئەوە هەوڵ دەدەن دۆستایەتیمان لەگەڵدا بکەن. لەو رووەیشەوە ئەورووپا بازاڕی بازرگانیمانە، پێویستە هیچ پەیوەندیەکی لایەنگرانە لەگەڵ هیچ بەشێکی نەبەستین. بەرژەوەندیی راستەقینەی ئەمەریکا دوورکەوتنەوەیە لە کێشەکانی ئەوروپیەکان.. ئەورووپا پڕە لە مەملەکەتی ئاشتیخواز، ئەگەر جەنگ لەنێوان ئینگلتەرا و هەر هێزێکی بیانیدا هەڵبگیرسێ، بازرگانیی ئەمەریکا بەهۆی پەیوەندیی وڵاتەکە بە بەریتانیاوە وێران دەبێ..

پێی لایەنە خراپە هەمەجۆرەکانی حکومەتی بەریتانی دەخاتە روو، جا دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە:

"ئەوە هێزی بەریتانیا نیە کە فریای ئەم کیشوەرە دەکەوێ، چونکە زۆر نابات کاروبارەکانی زۆر و ئاڵۆز دەبن و هێزێکی دوورەدەست ناتوانێ بەباشی دەستی بیگاتێ و بەڕێوەی ببات. لەبەرئەوە پشتگوێمان دەخات، لەبەرئەوەی بەریتانیەکان ئەگەر نەتوانن بمانشکێنن ناشتوانن حوکممان بکەن.. ئێمە هەر جارێك بمانەوێ بابەتێك بخەینە روو یان سکاڵایەك پێشکەش بکەین سێ چوار هەزار میل ببڕین، ئەنجا چوار پێنج مانگیش چاوەڕوان بین تا وەڵاممان بەدەست دەگاتەوە، کە پاش گەیشتنەوەیشی پێویستی بە پێنج شەش مانگ هەیە تا لێك بدرێتەوە. ئەمەیش پاش چەند ساڵێك وەك کارێکی گەمژانە تەماشا دەکرێ.. کارێکی گەمژانەیە دورگەیەك (مەبەستی ئینگلتەرایە) حوکمی کیشوەرێك (واتـ

ئەمەریکا) بکات، سروشت بەهیچ شێوەیەك وای نەکردوە شوێنکەوتە لە هەسارە شوێنکەوتووەکەی گەورەتر بێ.
هەروەها وتارێکی بەهێزی ئاراستەی راڕا و دڵ لاوازەکان کرد کە هێشتا باوەڕیان وابوو دەکرێ رێکەوتن و ئاشتەوایی لەگەڵ ئینگلتەرا بکرێ و گوتی: ئایا دەتوانن ئەو کاتەمان بۆ بگێڕنەوە کە تێپەڕیوە؟.. کەواتە ناتوانن سوڵح لەنێوان بەریتانیا و ئەمەریکادا بکەن. ئێستا دوایین پەتی ئومێد پچڕا. گەلی ئینگلتەرا وتار دژی ئێمە دەدات، هەندێ زیان هەن سروشت نایانبەخشێ، ئەگەر بیانبەخشێ چیتر بە سروشت نامێنێتەوە. وەك چۆن ئاشق لەو کەسە نابورێ کە ئابڕوی ماشوقەکەی بتکێنێ، ئەم کیشوەر (قارە)یەیش بەهیچ شێوەیەك لە قەسابخانەکاریەکانی بەریتانیا نابورێ. لەکاتێکدا هەموو جیهان لەژێر باڵی ستەمدا دەناڵێنێ، پێویستە ئەمەریکا دەرگاکانی بۆ ئازادی واڵا بکات و پەناگەیەك بۆ مرۆڤایەتیی چەوساوە ئامادە بکات.
پەین دوایین دەروازەی نامیلکەکەی بۆ بابەتێکی زۆر کرداری تەرخان کردوە، ئەویش "توانای ئێستای ئەمەریکا"یە، تا متمانەی ئەمەریکیەکان بەدەست بێنێ و قایلیان بکات کە توانای بەشەری و مەشقی پیشەسازی و سەرچاوەی سروشتیی پێویستی هەیە نەك هەر بۆ بەرپاکردنی جەنگێکی سەرکەوتوو دژی بەریتانیا، بگرە ئەگەر پێویست بکات بۆ شەڕ دژی دنیای دەستدرێژیکاریش؟!. کۆلۆنیەکان ئێستا ژمارەیەکی زۆر پیاوی چەکدار و مەشقدراویان تێدایە و دەتوانن لە ماوەیەکی کورتدا کەشتیگەلێکی دەریایی ئامادە بکەن کە هاوتای کەشتیگەلی بەریتانیا بێ، لەبەرئەوەی بڕێکی زۆر قەتران و تەختە و ئاسن و گوریسمان هەیە "دروستکردنی کەشتی مایەی شانازیی ئەمەریکایە کە لەوەدا هێشتا لەسەروو تەواوی جیهانەوەیە..".
بەرهەحاڵ ئەمەریکا پێویستی بە کەشتیگەلە بۆ بەرگری و خۆپاراستن،

لەبەرئەوەی کەشتیی دەریاوانیی ئینگلیزی کەڵکێکی ئەوتۆی نیە، لە دووریی سێ تا چوار هەزار میلە و بۆ کاتی ڕوودانی مەترسی هیچ سوودێکی نابێ".

جێی خۆیەتی لێرەدا بۆچوونە ئاینیەکانی پینیش لەو قۆناغەی ژیانیدا بزانین. دەڵێ "سەبارەت بە ئاین، باوەڕم وایە ئەرکی هەموو حکومەتەکانە هەموو مامۆستا جوامێرەکانی ئاین بپارێزن. کارێکیتر شك نابەم کە پێویست بێ حکومەت بیکات (ئەمەیش لێدانێکی ڕوونە لە کەنیسە و مەبەستی جیاکردنەوەی کەنیسەیە لە حکومەت).. سەبارەت بەخۆیشم بەعەقیدەوە باوەڕی تەواوم هەیە ئەوە ویستی خوای توانایە بەسەر هەموو شتێکدا کە جیاوازی لە بۆچوونی ئاینیماندا هەبێ. ئەمە بوارێکی فراوانتر بە چاکییە مەسیحیەکەمان دەدات. خۆ ئەگەر شێوەی بیرکردنەوەی هەمووومان وەك یەك بوو، ئەوا پێکهاتەی ئاینیمان پێویستی بە مادەیەکە بۆ گفتوگۆ. بۆ ئەم بنەما ئازادە چاوم لە هەموو ئەو بەهایانەیە لەنێوانمادان، تا وەك منداڵانی خێزانێك بین، کە جیاواز نین تەنیا لەو شتانەدا نەبێ کە ناوی یەکەم یان ناوی مەسیحی لێدەنێن.

پین هۆی دەستگرتنی بە بۆچوونەکەی لەبارەی جیابوونەوە لە بەریتانیا کورت دەکاتەوە لەوەی "هیچ شتێك وەك ڕاگەیاندنی ڕاشکاوانەی سەربەخۆییمان کاروبارەکانمان بەخێرایی و ئاسانی ساف ناکا"..

نووسەر کتێبی "زانینی گشتی"ی بە باسکردنی چوار هۆکار کۆتا پێ دێنێ:

١- لەبەرئەوەی ئەمەریکا لە ڕەعیەتەکانی بەریتانیایە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێ بێتە نێو ناکۆکیی نێوانیان.

٢- ناکرێ چاوەڕوانی یارمەتی لە فەرەنسا و ئیسپانیاوە بکرێ بۆ چاککردنی نێوانی بەریتانیا و ئەمەریکا و بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوانیان، چونکە هەنگاوێکی لەو جۆرە دژی بەرژەوەندییانە.

٣- لەو رووەوە ئەمەریکیەکان دان بەوەدا دەنێن ئەوان رەعیەتی بەریتانیان، ئەوا لە دیدی نەتەوە بێگانەکاندا بە پاخی دادەنرێن، بەوەیش کەمێك نەبێ سۆزیان بەدەست ناهێنن.

٤- ئەگەر ئەمەریکیەکان راپۆرتێك ئامادە بکەن تێیدئادەم سمیپکالآی خۆیان دژی بەریتانیا و لێبڕانیان بۆ بڕینی هەموو پەیوەندیەك لەگەڵی روون بکەنەوە و وێنەی ئەو راپۆرتە بۆ هەموو دەوڵەتان بنێرن و نیازی ئاشتیخوازانەیان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە و ئارەزوویان بۆ بەستنی پەیوەندیی بازرگانی دەربڕن، ئەوان ئەنجام لە بەرژەوەندیمان دەبێ.

پین لە کۆتاییدا دەڵێ: .. ئەگەر سەربەخۆیی رانەگەیەنرێ، ئەوا کیشوەرەکە وا هەست دەکات کە وەك ئەو پیاوە لەبەر نابەدڵی کارێکی بەردەستی ئەم رۆژ بۆ ئەو رۆژ دوا دەخات لەکاتێکدا دەزانێ ئەو کارە هەر دەبێ بکرێ و حەزی لێ نیە دەستی پێ بکات، لە هەمان کاتدا حەز دەکات زوو لە کۆڵی بکاتەوە و بەردەوام مێشکی بە زەرورەتی ئەو کارەوە سەرقاڵە.

بۆچی، لەباتیی ئەوەی هەریەکەمان بەدگومانی یان پرسیارەوە مڕ لەویتر بکات، هەریەکەمان بەدڵ و گیان دەستی دۆستایەتی بۆ هاوسێکەی درێژ ناکات و وەك کارێك لە کارەکانی لەبیرکردن پێکەوە وێنەی هێڵێك بکێشین و هەرچی ناکۆکیی رابردوو هەیە لەبیری بکەین. با ناوی ئەندامی حزبی ئازادیخوازان و ئەندامی حزبی کۆنەخوازان لەناو ببەین و تەنیا دەستەواژەی "هاوڵاتیی باش" و "هاوڕێی وەفادار" و "لایەنگری سەرڕاستی مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی ویلایەتە ئازاد و سەربەخۆکانی ئەمەریکا" لەنێوانیانماندا بەر گوێ بکەوێ.

ئەمە ئەو پەیامە شۆڕشگێڕانەیە بوو کە کتێبی "زانینی گشتی" ئاراستەی گەلی ئەمەریکی کرد.

بۆ زانینی ئەو کاریگەرییە فەورییەی ئەو کتێبە بەجێی هێشت، دەتوانین ئاماژەی بە گوتەی هەندێ لە سەرکردە هاوچەرخەکان بکەین.

گومانەکانی جۆرج واشنتۆن بوونە هەڵم کاتێك بۆ (جۆزیف رید)ی لە نورفوك نووسی: "کەمێکیتر لەو بەڵگە ئاگرینانەی لە فالموپ و نورفوك خرانە روو، ئەگەر بخرێنە سەر ئەو رێبازە دروست و هۆ دەمکوتکەرانەی لە نامیلکەی "زانینی گشتی"دا هاتوون، ئیتر ئەندامان لەبارەی بریاردان لەسەر بنەمای جیابوونەوە، لە دوودڵیدا نامێڵێتەوە". چەند هەفتەیەك پاش ئەوەیش بۆ ریدی نووسی: "لەو گوتارانەی لەم دواییەدا لە ڤێرجینیا بەدەستم گەیشتوون، پێم وایە نامیلکەی "زانینی گشتی" گۆڕانکارییەکی سەیری لە عەقڵی زۆر لە خەڵك دروست کردوە".

جۆن ئادەمز بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێ "نامیلکەیەکم بۆ ناردیت بەناونیشانی "زانینی گشتی" بۆ بەرگریکردن لە هەندێ رێباز دانراوە. دەشێ چاوەڕوانی ئەوە بکەیت وەستانی ملهوڕی و بەرەنگاریکردنی ستەم بەزوویی دەبێتە بیروباوەڕێکی گشتی". ئەویش پاش خوێندنەوەی وەڵامی دایەوە: "ئەم نامیلکەیە لەکاتی گونجاودا هاتووە، وەك تیشکێك لە وەحی بۆ رەواندنەوەی گومانەکانمان و دیاریکردنی هەڵبژاردنمان".

بینجامین رش لەبارەی نووسینەکەی پینەوە دەڵێ: "لە چاپخانە بە کاریگەرییەکەوە دەردەچێ، کە شتی وا بەکەمی لە پیتەکانی چاپ و کاغەز وەشاوەتەوە، لە هیچ سەردەم و لە هیچ دەوڵەتێکدا".

ژەنراڵ چارلز لی دەڵێ "دان بەوەدا دەنێم کە قەناعەتی پێ کردم". فرانکلین گوتی "کاریگەرییەکی گەورەی دروست کرد".

سیر جۆرج ترفلیان لە کتێبی "مێژووی شۆڕشی ئەمەریکیدا" دەڵێ: ئاستەمە ناوی هەر دارشتنێکی بەشەری ببرێ کە ئەو کاریگەرییە فەوری و

دەستودەمەی هەبووبێ و پانتاییەکی فراوانی گرتەوە و بەو شێوەیە بەردەوام بێ... بەگوێرەی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە، نامیلکەی "زانینی گشتی" هەزاران کەسس بەرەو بیرۆکەی سەربەخۆیی گۆڕی کە پێشتر تەنانەت بەرگەی بیرۆکەی سەربەخۆییشیان نەدەگرت.. ئەوەی ئەم کتێبە کردی هیچی کەمتر نیە لەوەی موعجیزەکان دەیکەن، کۆنخوازانی گۆڕی بۆ ئازادیخواز.

چەند مانگێك پاش دەرکەوتنی "زانینی گشتی" زۆربەی ویلایەتەکان ڕێنماییان دایە نێردراوەکانیان کە دەنگ بە سەربەخۆیی بدەن. تەنیا ویلایەتی ماریلاند دوودڵ بوو، نیویۆرکیش بەرهەڵستی کرد. لە ٤ی تەمموزی ١٧٧٦ واتە دوای کەمتر لە شەش مانگ لە دەرچوونی ئەو نامیلکەیە لە چاپخانە، کۆنگرێسی کۆنتینینتال (کیشوەرەکە) لە هۆڵی دەوڵەت لە ویلایەتی فیلادلفیا کۆبوویەوە و سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای ڕاگەیاند. ئەگەرچی پەین خۆی بڕیارەکەی نەنووسی، بەڵام پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ تۆماس جیفرسۆن هەبوو لەکاتی داڕشتنیدا. جگە لە بەندێکی دەستوورەکە لە دژی کۆیلایەتی، کە پەین بانگەشەی بۆ دەکرد، هەموو ئەو بنەمایانەی بانگەشەی بۆ دەکردن لەو بڕیارە بەناوبانگەدا هەبوو.

گێڕانەوەی ژیانی پاشتری پەین وێنەیەکی دەقاودەقی چیرۆکی "زانینی گشتی"ـە و دەکرێ بەکورتی ئاماژە بە ڕووداوە گرنگەکان بکەین. ڕاستەوخۆ پاش سەربەخۆیی، پەین چووە ڕیزەکانی سوپای شۆڕش. لەو ڕووەوەیشەوە وتاربێژێکی پڕ بەڵگە بوو لە بەرگریکردن لە کێشەی ئەمەریکا، بەشدارییەکی گەورەی لە یەکێتیی و ڕۆحی نەتەوەییدا هەبوو، ئەویش لەڕێی زنجیرە نامیلکەیەکەوە کە هەر هەموویان بەناونیشانی "قەیران" بوون.

یەکەمین نامیلکەی ئەو زنجیرەیە بە چەند دێڕێك دەست پێدەکات کە زۆر لەسەر زمانن و دەڵێ "هەندێ کات هەن ڕۆحی خەڵکیان تێدا ئەزموون دەکرێ.

سەربازی هاوین و نیشتمانپەروەری تیشکی خۆر لە خزمەتی نیشتمانەکەیان پاشەکشە دەکەن، بەڵام ئەوەی ئێستا لەو خزمەتەدا دەمێنێتەوە شایانی سوپاسی پیاو و ئافرەتە". پاش چەند مانگێك كە كۆنگریس نرخی پێنی وەك پسپۆڕێکی ڕاگەیاندن و بانگخوازی ئەخلاقی جوان زانی، کردی بە وەزیری کاروباری دەرەوە، بەوە پێن بوو بە یەکەمین وەزیری ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام ڕووداوەکان ناچاریان کرد دەست لە پۆستەکەی بکێشێتەوە. پاش ئەوە کرا بە نهێنیپارێزی سڕی کۆنگرەی پەنسلڤانیا. لە ساڵی ١٧٨١ لەگەڵ جۆن لۆرێنز نێردرا بۆ فەرەنسا بۆ هێنانی کۆمەکیەکی دارایی بۆ حکومەتی ئەمەریکی کە زۆر پێویستی بە یارمەتی بوو، هەر هەمان ساڵ بە پارە و یارمەتیەکانەوە گەڕایەوە.

کاتێ شۆڕش لە ساڵی ١٧٨٣ کۆتایی هات، پێن ڕووی کردە داهێنانە میکانیکیەکانی و نەخشەی یەکەمین پردی هەڵواسراوی کێشا و دەستی کرد بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەر هێزی هەڵم. بڕیاریدا لەبارەی هەندێ مەسەلەی میکانیکی ڕاوێژ بە ئەندازیارانی فەرەنسا و ئینگلتەرا بکات، هەر بۆیە ساڵی ١٧٨٧ چوو بۆ ئەوروپا و پازدە ساڵ لەوێ مایەوە. هەر کە پێن گەیشتە هەندەران شۆڕشی فەرەنسی هەڵگیرسا، ئەویش بەحەماسەوە پشتیوانی کرد و بە بەرگریەکی نوێی زانی لە بۆچوونە دیموکراسیەکانی.

کتێبە گەورەکەی لەو کاتەدا کتێبی "سەردەمی عەقڵ" Age of Reason بوو کە هەندێ جار پێی دەوترا "تەوراتی مولحید". لەڕاستیدا پێن باوەڕی بە بوونی یەك خوا هەبوو نەك لە ئاینێکی ئاشکرادا. لە کتێبی "سەردەمی عەقڵ"دا کە پێن بۆ بەرگرتن لەو شەپۆلی ئیلحادەی لە سەردەمی شۆڕشدا فەرەنسای گرتەوە داینابوو، بەتوندی ڕەخنەی لە سەردەمی کۆن The Old Testament دەگرت. سەرباری ئەو هەوڵە، زانایانی لاهوت و گرووپە

ئاینییــە ئەرسۆزۆکسـیەکان بەتونـدی سـەرکۆنەیان کـرد و بــە پــەرگیرێکی مەترسیدار و بێباوەڕیان وەسف دەکرد.

کاتێ پین ساڵی ۱۸۰۲ گەڕایەوە ئەمـەریکا، بینـی وەك قارەمـانێکی شۆڕشـگێڕ پێشوازی لێنەکرا، بگرە بەهۆی کتێبی "سـەردەمی عـەقڵ" و تیـۆرە سیاسـییە پەرگیرەکانیەوە، بەدەسیسەی سەرکردە سیاسیەکان و ئەنـدامانی کەنیسـە لـە کۆمەڵگە تەرە کرابـوو. لـە نیـو رۆچیل و نیویـۆرك کـە لێیـان نیشـتەجێ بـوو، بەپاساوی ئەوەی هاوڵاتیی ئەمەریکی نیـە مـافی دەنگدانی پـێ رەوا نـەدیترا ؛ نەك هەر ئەوەندە، بگرە هەوڵی کوشتنیشی درا.

پاش حەوت ساڵ لە مامەڵـەی خـراپ و رقلێبـوون و فەرامۆشـکردن و هـەژاری و ناساغی، ساڵی ۱۸۰۹ لە تەمەنی ۷۲ ساڵیدا کۆچی دوایی کـرد. رێگـە نـەدرا لـە گۆڕستانی کواکەر (هاوڕێیانی رێبازی جۆرج فۆکس)دا بنێژرێ.

ئـەو دوژمنایـەتی و درۆ و دەلەسـە و دەمارگیرییـە توندانـەی پـین لـە کۆتـا ساڵەکانی ژیانیـدا دووچاریان بـوو، بـۆ سـەردەمە نوێکـانیش مایـەوە. ئـەوەتا تیۆدۆر رۆزفێڵت بە "ئـەو مولحیـدە بچوکە پیسـە" ئامـاژەی بـۆ دەکـات. بـەم شێوەیە پین وەك "ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆز"ی لێهات، کە نـە ئیمپراتـۆری بوو نە رۆمانی بوو نە پیرۆزیش بوو. پین-یش نە مولحید بوو نە بچـوك بـوو نـە پیسیش بوو. تا ساڵی ۱۹۳۲یش رادیۆی شاری نیویۆرك رێگەی بە پەخشکردنی بەرنامەیەك لەبارەی پین نەدەدا.

پاش ٤٥ ساڵ لـە دروسـتکردنی هۆڵەکـە، پـین لـە "هـۆڵی بەناوبانگی مـەزنانی ئەمەریکی"دا هەڵبژێردرا. لە هەمان ساڵیشدا شاری نیو رۆچێل مـافی هـاوڵاتی بۆ ئەو قارەمانە شۆڕشگێڕە گێڕایەوە، کە ساڵی ۱۸۰٦ لەدەستی دابوو.

ئەمـە ئـەو پیـاوە بـوو کـە رەنگـە پـتر لـە هـەر کەسـێکیتر شایسـتەی نازنـاوی "دامەزرێنــەری ســەربەخۆیی ئەمــەریکا" بــێ. ئــەو بــوو بــۆ یەکــەم جــار

دەستەواژەی "ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا"ی بەکارهێنا و پێشوەخت دەیزانی "ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایش هاوشێوەی بەریتانیای مەزن لە مێژوودا مەزن دەبێ".



## ٣- كتێبي "سامانی گەلان"
## ئادەم سمیث Adam Smith
## پارێزەری پرۆژە ئازادەکان

دوای تێپەڕینی دوو مانگ بەسەر بەشداریی کتێبی "زانینی گشتی" لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و ڕووداوە هاوچەرخەکانیتری شۆڕشی ئەمەریکا، لە لەندەن کتێبێك دەرچوو کە قەدەری وابوو کاردانەوەیەکی قووڵ لە بوارێکیتر لە بوارەکانی چالاکیی مرۆییدا دروست بکات. بەپێچەوانەوەی نامیلکە هەست گڕدەکەی پەین، پەیامە درێژە دوو بەرگیەکەی ئادەم سمیپ بەناونیشانی "پرسیار لە سروشت و هۆکانی سامانی گەلان"، بۆمبێکی زەمەنی بوو، سەرەتا بەکەمی سەرنجی ڕاکێشا. لەڕاستیدا ئەم کتێبە تا سەدەی پاش مردنی دانەرەکەی دوای شۆڕشی ئەمەریکی، نەیتوانی کاریگەریی چاوەڕوانکراوی تەواو دروست بکات. شۆڕشی فەرەنسی لە قۆناغی ڕێکخستندا بوو، شۆڕشی پیشەسازیش بەهۆی دۆزینەوەی هێزی هەڵمەوە بەخێرایی بەرەو پێشەوە ملی دەنا. لە ئینگلتەرا هەموو ڕواڵەتەکانی ژیانی ئابووری لەژێر چاودێریی وردی حکومەتدا بوون.

نرخەکان سڕ کران، کرێ و سەعاتەکانی کار دیاری کران، گۆڕانکاری لە بەرهەمدا کرا و دەوڵەت بەتەواوی دەستی بەسەر بازرگانیی دەرەکیدا گرت لە هاوردە و هەناردەکان و جەنگ خەریکە بڵێین بەردەوام لەئارادا بوو. سیاسەتی نەتەوەییش پێویستی بە سوپا و هێزێکی دەریایی بەهێز و گەلێکی گەورە، دەستگرتن بەسەر کۆلۆنیەکان لە کون و قوژبنی زەویدا و لاوازکردنی دەوڵەتە ڕکابەرەکانی وەك فەرەنسا بە ڕێگە باش یان خراپەکان هەبوو. هەر پێشنیارێك بۆ دابەشکردنی

عادیلانەی سامان بەتوندی لەلایەن چینە دەسەڵاتدارەکانەوە بەرهەڵستی دەکرا. فێرکردن لەنێو کەمینیەکی خواپێداودا قەتیس بوو، یاسای تایبەت بە تاوانەکان زۆر توند و مافە سیاسیەکانی جەماوەر زیاتر لەرووی تیۆریەوە هەبوون تا کردەیی.

وەك چۆن بۆ چەند نەوەیەك وابوو، هێشتا ئەریستۆکراسیەتی ئارا جڵەوی حکومەتی بەدەستەوە گرتبوو، بەڵام چینێکی نوێ و بەهێز لە بازرگان و پیشەسازان پەیدا بوون کە داوای سەرماف (امتیاز)ی تایبەتیان بۆ خۆیان دەکرد و بەدەستیشیان هێنا. لە دیدی ئەم گرووپەدا هەناردەکان نیعمەت و هاوردەکان کارەسات بوون و پێویستە رێگە نەدرێ پارەی دەوڵەت بچێتە دەرەوە. پێویستە پارێزگاری لە ترازوویەکی پێشکەوتووی بازرگانی بکرێ، پێویستە کرێی کار نزم و سەعاتی کار درێژ بێ و پیشەسازیە نیشتمانیەکان لەرێی تاریفەیەکی گومرگیی بەرزەوە بێنە پاراستن. گرنگە کەشتیگەلێکی بازرگانیی بەهێزی هەبێ و هەر رێوشوێنێك فەرز بکرێ کە بکرێ خۆبەخۆ یارمەتیی بازرگانان بدات، ئەوەیش بۆ بەرژەوەندیی گەل بەگشتی. لەژێر فشاری دەنگە بەهێزەکاندا پەرلەمان بڕیارێکی دەرکرد بۆ گۆڕینی سەرجەم ئەو پێشنیارانە بۆ یاسا.

پاش ئەوە ئادەم سمیث هات و ویستی ئەو بۆچوونانەی بە هەڵە و زیانبەخشی دەزانین لەبەریەك هەڵتەکێنێ. دەکرێ ژیانی سمیث تا ئەم قۆناغە ئامادەکاری بێ بۆ ئەو کارە گەورەیەی خۆی بۆ ئەنجامدانی تاو دابوو.

ئەو هاوڵاتیەکی سکوتلەندی بوو لە تەمەنی چواردەساڵیدا (ساڵی ١٧٢٧) چووە زانکۆی گلاسجو و کەوتە ژێر هەژموونی مامۆستا مەزنەکەی، فرەنسیس هوتچسۆن، کە زۆرجار رێبازەکەی دووبارە دەکردەوە کە "بەختەوەریی مەزن بۆ زۆرترین ژمارە"، تا ئەو رێبازە بوو بە فەلسەفەی هەمیشەیی سمیث. دوای ئەوە چوو بۆ زانکۆی ئۆکسفۆرد و شەش ساڵ لەوێ مایەوە و زۆربەی کاتی خۆی بۆ

خوێندنەوەی بەرفراوانی ئەدەب تەرخان کرد. کاتێك گەڕایەوە سکولتەندە دەستی کرد بە گوتنەوەی موحازەرە لە ئەدەنبرە تا ساڵی ١٧٥١ کاتێك لە زانکۆی گلاسجو یەکەم جار بە مامۆستای کورسیی زانستی مەنتیق و پاشان میتافیزیکا و پاشتریش فەسلەفەی ئەخلاق، دامەزرا.

ماوەی دوازدە ساڵ وەك وانەبێژێکی بەهرەدار و بەناوبانگ کاری دەکرد، کاتێك کتێبی "تیۆری سۆزە ئەخلاقیەکان"ی بڵاو کردەوە و رەواجێکی گەورەی هەبوو، ناوبانگی زیاتر بوو، کە بەلای هاوسەردەمەکانیەوە ئەو کتێبە لە "سامانی گەلان" باشترە. کاتێك پاداشتە ماڵییە چەورەکان ئیغرایان کرد، دەستی لە کارەکەی وەك مامۆستا کێشایەوە و یاوەریی لاوێکی خانەدانی وەك هاوڕێ و مامۆستا کرد لە گەشتێکدا بۆ ئەوروپا کە سێ ساڵی خایاند. لەوێ چاوی بە پێشڕەوانی ئابووری و فەیلەسوف و بیرمەندانی سیاسیی ئەو سەردەمە کەوت، بەتایبەت لە فەرەنسا.

ساڵی ١٧٥٩ یاداشتەکانی سمیث بیرۆکەی "سامانی گەلان"ی تێدا بوو، بەڵام کارکردن تێیدا بەخاوی دەچوو تا پێگەیشت. ساڵانێك لە رامان و دیراسە و خوێندنەوە و تێبینیی بنەمایی و قسەکردن لەگەڵ خەڵکی جۆراوجۆر و پێداچوونەوەی نەبڕاوەی خایاند بەر لەوەی کتێبەکە بۆ چاپ ئامادە ببێ. بەر لە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، سمیث زۆربەی سێ ساڵەکەی لە لەندەن بەسەربرد و کتێبەکەی لەگەڵ بێنجامین فرانکلین نوێنەری کۆلۆنییە ئەمەریکیەکان تاوتوێ کرد. کتێبەکە لە ئاداری ١٧٧٦ لە چاپخانە دەرچوو، لەوکاتەوە چەنددین جار چاپ کراوەتەوە و بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی دنیا تەرجەمە کراوە.

کتێبی "سامانی گەلان" زیاتر بیبلۆگرافیا بوو تا نامەیەك لە ئابووریدا. رەخنەگرێك ناوی ناوە "مێژوو و رەخنەکردنی هەموو شارستانێتییە ئەوروپیەکان".

سمیث بە تاوتوێکردنی بابەتی دابەشکردنی کار دەستی پێکردوە، پاشان چووەتە سەر سەرهەڵدان و سوودی دراو، نرخی کاڵاکان، کرێی کار، قازانجی بازرگانی،

بەکرێدانی زەوی، نرخی زیو، جیاوازیی نێوان کاری بەرهەمهێن و بەرهەمنەهێن. دوای ئەوە پێشکەوتنی ئابووری لە ئەورووپا لە کەوتنی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیەوە شەرح کردووە و شیکاریی فراوانی کردووە بۆ رەخنەکردنی سیاسەتە بازرگانی و کۆلۆنیالیستیەکانی نەتەوە ئەورووپیەکان، داهاتی پاشا، رێگە جۆراوجۆرەکانی بەرگریکردن لە دادپەروەری و بەرقەرارکردنی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، سەرهەڵدان و گەشەی ئەو سوپایانەی ئێستای ئەورووپا، مێژووی فێرکردن لە سەدەکانی ناوەڕاست. هەروەها رەخنەکردنی زانکۆکانی سەردەمەکەی و مێژووی هێزی دنیایی کەنیسە و هەڵاوسانی قەرزە میللیەکان و لەکۆتاییشدا تاقیکردنەوەی سیستمی باج و سیستمەکانی داهاتی گشتی.

لەوانەیە ئەو بابەتە گشتیەی سمیث کتێبی "سامانی گەلان"ی لەسەر بنیاتنا، نیکۆلۆ ماکیافیلی داینابێ کە پێی وایە هەموو کەس بەر لە هەموو شت بەرژەوەندییە شەخسیەکانی دەیبزوێنن، حەزکردن لە سامانیش تەنیا یەکێکە لە رواڵەتەکانی ئەوە. پاڵنەرە خۆپەرستانەکان لەپشت هەموو چالاکیەکانی مرۆڤەوەن. زیاد لەوەیش، سمیث لەباتیی ئەوەی ئەم رواڵەتە لە رەفتاری مرۆڤدا بە شتێکی قەدەغە و نەویستراو ببینێ، باوەڕی وابوو خۆپەرستی (انانیە)ی تاك بەرژەوەندیی کۆمەڵگەی لێ دەکەوێتەوە. دەڵێ باشترین رێگە بۆ خۆشگوزەرانیی ئوممەت بریتییە لە رێگەدان بە هەموو مرۆڤێك تا "کۆششێکی سیستماتیك و بەردەوام و نەپچڕاو بۆ باشکردنی باری ژیانی خۆی بکات... چاوەڕوان نین خۆراکی خۆمان لە مرۆڤایەتیی قەساب یان بیرەساز یان نانەواوە دەست بکەوێ، بەڵکو لە تێڕوانینیانەوە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەستمان دەکەوێ. ئێمە نە لەبارەی خۆشەویستیی ئەوان بۆ خێری مرۆڤ، بەڵکو لەبارەی خۆشەویستییان بۆ خۆیان، قسە لەگەڵ خۆمان دەکەین، قەتیش لەبارەی پێویستیی خۆمان قسەیان لەگەڵ ناکەین بەڵکو لەبارەی بەرژەوەندیی خۆیانەوە قسە دەکەین".

بەهۆی ئەم جۆرە برگانەوە راسکین لەبارەی سمیث-ەوە دەڵێ "ئەو پیاوە سکوتلەندییە خاوەن نیوە پەروەردە و نیوە زیرەکییەی راشکاوانە بێباوەڕی فێری خەڵك دەکات: تۆ پەروەردگارت تووڕە دەکەی، نەفرەت لە یاساکەی دەکەیت و ئیرەیی بە هاوسێکەت دەبەیت لەسەر خێراتەکەی".

سمیپ دەڵێ "پیشەسازیی نوێ بەهۆی دابەشکردنی کار و کەڵەکەکردنی سەرمایەوە مومکینە- هەریەك لەم دوانەیش بە بەرژەوەندیی شەخسی یان "سیستەمی سروشتی" لێکدەدرێتەوە وەك کە فەیلەسوفەکانی سەدەی هەژدەیەم باسیان کردووە. مرۆڤ بەبێ ئەوەی هەست بەخۆی بکات، "دەستێکی ئیلاهی" پەلی دەگرێ تا بەکارکردن لەپێناو خۆی و قازانجی خۆیدا، بەشداری لە خێری گشتیدا بکات. سروشتیشە لەتەك ئەوەدا بوترێ پێویستە حکومەت کەمترین دەستوەردانی لە سیستەمی ئابووریدا هەبێ. چونکە باشترین حکومەت -وەك تۆم پین لە بۆنەیەکیتردا گوتویەتی- ئەو حکومەتەیە بە کەمترین حوکمکردن حوکم بکات.

سمیپ بۆ روونکردنەوەی باشییەکانی دابەشکردنی کار باسی پیشەسازیی دروستکردنی دەرزی دەکات: "ئەو سەنعەتکارەی فێری ئەو پیشەسازییە نەبووە و.. نازانێ ئەو ئامێرانەی تێیدا بەکار دێن چۆن بەکار دەهێنرێن.. رەنگە کەم رێك بکەوێ بتوانێ بە گەورەترین کۆشش رۆژی دەرزیەك دروست بکات، بەدڵنیاییەوە ناتوانێ بیست دەرزیش دروست بکات،" بە دابەشکردنی کرداری دروستکردن بۆ "هەژدە کرداری جیاواز، کە هەرهەموویان لە هەندێ کارگەدا چەند دەستێکی جیا ئەنجامیان دەدەن.. دەبینی کارگەیەکی بچوکی لەو جۆرە کە تەنیا دە پیاو ئیشی تێدا دەکەن.. دەتوانن پێکەوە ٤٨ هەزار دەرزی لە رۆژێکدا دروست بکەن".

سمیپ دەڵێ سەرهەڵدانی دابەشکردنی کار لای گەلانی سەرەتایی بووە:

بۆ نموونە لەنێو تاکەکانی خێڵێکی ڕاوچی یان ئاژەڵداردا، کەسێك هەیە کە بەوردی و وەستایانە لە هەر کەسێکیتری خێڵەکە تیر و ڕم دروست دەکات. زۆرجار هاوڕێکانی ئاژەڵ و گۆشتی ڕاوی لەگەڵ دەگۆڕنەوە بە تیر و ڕم. بەو شێوەیە ئەو وەستایە ماڵات و گۆشتی ڕاوی زیاتری دەست دەکەوێ لەوەی ئەگەر خۆی بچوایە بۆ ڕاو. بەم شێوەیە، لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیدا پیشەسازیی تیر و ڕم بوون بەکاری سەرەکیی ئەو..

کەسێکیتر لە دروستکردنی پەیکەر و سەربانی کوخە بچوکەکانیان یان ماڵە بزۆکەکانیان لەوانیدی شارەزاترە.. کەسێکیتر دەبێتە ئاسنگەر یان مسگەر. کەسێکیتریش دەبێتە پێستەچی.. بەم شێوەیە، هەموو تاکێك دڵنیا دەبێ لەوەی هەرکات دەرفەت هەڵبکەوێ دەتوانێ ئەوەی لە پێویستیی خۆی زیادە لەو شتەی دروستی دەکات لەگەڵ شتێکیتر کە لە پێویستیی ئەو کەسەی دروستی کردووە زیادە، بگۆڕێتەوە، ئەمەیش هانی هەموو کەسێك دەدات کە توانای خۆی لە یەك کاری دیاریکراودا خەرج بکات و هەموو سەلیقە و بەهرەی خۆی بخاتە کار بۆ ئەوەی ئەو کارەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بە چاکترین شێوە بکات.

سمیپ پاش ئەوە دێتە سەر بابەتی دراو و نرخی کاڵاکان و باس لە بنەمایەك دەکات کە ئابووریناسان هێرشی دەکەنە سەر و بەهەڵەی دادەنێن، بەڵام ئەو پێی وایە ئەوە تەنیا قیرەقیر و چەنەچەنی بیرمەندانی سۆشیالیستە. سمیپ دەڵێ: "تەنها کارە کە هەرگیز نرخی ناگۆڕێ، هەر ئەویش ئاستی ڕاستەقینە و کۆتایە و هەموو کاڵاکان، لە هەموو شوێن و کاتێکدا بەو مەزەندە و بەراورد دەکرێن. ئەوە نرخی ڕاستەقینەیەتی، هەرچی پارەیە، تەنیا نرخە ڕواڵەتیەکەیەتی".

سمیپ لە هیچ جێیەکی کتێبەکەیدا بەو ئەندازەیە ڕاشکاو و هەندێ جار تووڕە نیە وەك لەوەی کاتێك قسە لەسەر نایەکسانیی سەودای نێوان خاوەنکار و کرێکاران دەکات. هەروەها لە بەرهەڵستیکردنی ئەو بیرۆکە بازرگانیەی دەڵێ کرێی نزم

کرێکاران ناچار دەکات زیاتر کار بکەن، بەوەیش خۆشگوزەرانیی ئینگلتەرا زیاتر دەکەن. سمیپ لەسەر خاڵی یەکەم دەنووسێ "کرێکاران چاویان لەوەیە زۆرترین بەدەست بێنن، سەرگەورەکانیش چاویان لەوەیە کەمترین بدەن. هەربۆیە کرێکاران عەزمیان جەزم کرد یەك بگرن تا کرێی کار بەرز بکەنەوە، خاوەنکارانیش یەکیان گرت تا نزمی بکەنەوە".

سمیپ درێژەی دەداتێ و دەڵێ: کەواتە زەحمەت نیە پێشبینی بکرێ کام لەم دوو لایەنە لە هەموو بارودۆخە ئاساییەکان لەم کێشەیەدا دەیباتەوە و بەرانبەر ناچار دەکات مل بە مەرجەکانی بدات. لەو رووەوە خاوەنکاران ژمارەیان کەمترە ئاسانتر دەتوانن یەك بگرن، ئەمە جگە لەوەی یاسایش هەمیشە لای دەسەڵاتدارانە یان لانیکەم یەکگرتنیان قەدەغە ناکات، لەکاتێکدا یەکگرتنی کرێکاران قەدەغە دەکات. هیچ بڕیارێکی پەرلەمانیمان نیە دژ بە یەکگرتن لەپێناو دابەزندنی کرێی کار، بەڵام زۆر بڕیار هەن دژی یەکگرتن بۆ بەرزکردنەوەی کرێ. لە هەموو ئەم کێشانەدا خاوەنکاران دەتوانن ماوەیەکی درێژتر بەرگە بگرن. خاوەن زەوی، کشتیار، خاوەن کارگە یان بازرگانان، تەنانەت ئەگەر یەك کەسیش شك نەبەن بەگشتی دەتوانن بەپشتبەستن بە پاشەکەوتی بەدەستهاتووی پێشوویان ساڵێك و دووان بەرگە بگرن، لەکاتێکدا زۆر لە کرێکاران ناتوانن زیاتر لە هەفتەیەك بەرگە بگرن، ژمارەیەکی کەم دەتوانن ماوەی مانگێك بەرگە بگرن، زۆر بەکەمی کەسێکت دەست دەکەوێ بتوانێ ماوەی ساڵێك بەبێ کار بەرگە بگرێ. لەوانەیە بە تێپەڕینی کاتێکی درێژ بەئەندازەی گرنگیی خاوەنکار بۆ کرێکار، کرێکاریش بۆ خاوەنکار گرنگ بێ، بەڵام ئەم گرنگییە ئاوا راستەوخۆ نیە.

سۆزی سمیپ بۆ کرێکارانی هەژار لەم بڕگانەدا دەردەکەوێ:

"بەشی هەرەزۆری هەر کۆمەڵگەیەکی سیاسی لە خزمەتکار و کرێکار و پیشەکاری جۆراوجۆر پێکدێ، بەڵام ئەوەی دەبێتە مایەی باشکردنی بارودۆخی ئەم بەشە

هـەرەزۆرە، بـەهیچ شـێوەیەك نـاکرێ بـۆ هـەمووان بـە ماندوکـەر دابنـرێ. هـیچ کۆمەڵگەیـەك نـاتوانێ بەکامـەرانی و خۆشـگوزەران بـژی لەکاتێکـدا ئـەو بەشـە هـەرەزۆرەی هـەژار و بێچـارە بـێ. ئەمـە حاشـاهەڵنەگرە. زیـاد لـەوەیش، جێـی خۆیـەتی ئەوانـەی خـۆراك و جلوبـەرگ و مـاڵ بـۆ تـەواوی گـەل دابـین دەکـەن، پشکێکیان لە بەرهەمی کارەکەیاندا هەبێ و خۆراك و ماڵێکی شایستەیان هـەبێ... ئەمە دەستخۆشـانەیەکی ئـازادە لەسـەر کـارکردن کـە چـالاکیی کـۆی خـەڵك زیـاد دەکات. هەقدەستیش چالاکی زیاد دەکات.. ئێمە دەبینین کرێکاران کاتێك کرێیان بەرز بێ کار و چالاکییان زیاتر دەبێ لەو کاتەی کرێیان نزم بێ".

پاشان دەڵێ:

"بازرگان و خاوەن کارگەکانمان داد و بێدادیانە لەو کارە خراپـەی کرێـی بـەرز لـە بەرزبوونەوەی نرخی دەکات، بەوهۆیەشەوە کەمیی فرۆشی کاڵاکانیان لە نـاوخۆ و دەرەوەدا، بەڵام هیچ لـەبارەی قازانجە زۆرەکـان نـاڵێن، ئـەوان لەئاسـت قازانجـە بەڵاکانی خۆیان بێدەنگن، تەنیا لەسەر قازانجی کەسانیتر سکاڵایانە".

سمیپ بیست و دوو ساڵ بەر لـە بڵاوبوونـەوەی کتـێبی "بنـەماکان دانیشـتوان"ی ماڵتۆس، پێشبینیی تیۆری ماڵتۆسی دەکرد.

"هەموو پۆلە ئاژەڵێك بەشێوەیەکی سروشتی بەپێی ئـامرازی خـۆی لەژیانـدا زیـاد دەکات و هیچ پۆلێك ناتوانێ بەزیاتر لەو ئامرازە زیاد بکـات. بـەڵام لـە کۆمەڵگـەی شارستانیدا تـەنیا لـەناو چینە نزمەکانـدا دەبیـنین کـەمیی پێداویسـتیەکانی ژیـان سنوور بۆ زۆربوونی مرۆڤ دادەنێت و بەهیچ ڕێگەیەکیتر ناتوانێ ئەوە بکات جگە لە ڕێگـەی لـەناوبردنی بەشـی هـەرەزۆری ئـەو منداڵانـەی، لەئـەنجامی هاوسـەرگیریی بەرهەمدارەوە لەدایك بوون".

بە لەبەرچاوگرتنی قازانجەکانی کار لە سـەردەمە نوێکانـدا، ئاسـتەمە ئـەو هـەموو قەدەغە و کۆت و بەندە دەرەبەگیانە بەراست بزانرێن کە لەو سەردەمەی سمیپ–

یشی تێدا بووە باو بوون. هەر شێوەیەك لە شێوەكانی ڕێكخستنی كرێكارانە تەنها یەكێك بوون لەو كۆت و بەندە سەختانەی بەسەر كرێكاراندا سەپێنرابوون. هەروەها یاساكانی فێربوون یاخود فێربوونی پیشەسازییانە (التلمڑە الصناعیە) و یاسای مانەوە (اقامە) لەو كۆت و بەندەی پێشوو سسەختگیرتر بوون.

مێـژووی یاسـای فێركردنـی پیشەسـازییانە بـۆ سـەردەمی شـاژن ئـەلیزابیس دەگەڕێتەوە. یاساكە -وەك سمیپ باسی دەكا- دەڵـێ "لـە ئایندەدا قەدەغەیە هەر كەس هیچ پیشە یان كارێكی غامچ لە ئینگلتەرا بكات، بەبێ ئەوەی پێشتر لانیكەم بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەو كارەدا شاگردی كردبێ". لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا خاوەن كار تەنیا قووتی مەمرە و مەژی دەدایە قوتابی یاخود شاگردەكە. بەتەبیعەتی حـاڵ خاوەنكـارە بێویژدانـەكان ئـەم یاسـایەیان بەهـەل زانـی بـۆ چەوسـاندنەوەی كرێكارەكانیـان تـا زۆر وەربگـرن و كـەم بـدەن، پیشـەكارە فێرخوازەكانیش لە كۆیلە دەچوون.

سمیپ بۆ ئەوەی ئەو ڕێگەیە قاو بدات، رایگەیاند كە ئـەو مـاوە درێـژەی فێربـوون بەهیچ شێوەیەك پێویست نیە، لەبەرئـەوەی زۆربـەی پیشـەكان چـەند هەفتەیـەك بەسەر بۆ فێربوونیان. هەروەها یاساكانی فێربوونی پیشەسازیانە دەستوەردانێكی زۆرەملێیانە بوو لە مافی كرێكاردا كە ڕێگەی پـێ نـەدەدا گرێبەسـت بـۆ كارەكـەی بكات، یان كارەكەی هەڵبژێرێ، یان لە كارێكی كەم كرێـوە بگوێزێتـەوە بـۆ كارێـك كرێی زیاتر بێ.

بەهەمان شێوە یاسای مانەوەیش ستەمكارانە بوو "دەوێرم بڵێم كەم پیاوی هـەژار بووە لە تەمەنی چل ساڵیدا لە ئینگلتەرا، لە كاتێكی ژیانیدا هەستی بەوە نەكردبێ بەهۆی یاسای ئیقامـەوە بەشـی خـوراوە. ئـەم یاسـایەیش دیسـان لـە سـەردەمی ئەلیزابیسدا دەرچووە. ئامانجی بنەڕەتیش تێیدا سیستماتیزەكردنی دابەشـكردنی كۆمەكیەكانی هەژاری بوو. هەر ئەبرەشیەیەك بەرپرس بوو لە گرنگیدان بە ئەندامە

هەژارەكانی. بۆ ئەوەیش ژمارەی هەژاران لە كۆمەڵگەدا زیاد نەكات، ڕێگە بە هەژارانی نوێ نەدەدرا لەوێ نیشتەجێ بن مەگەر كەسێكیان هەبێ بیانژێنێ. ئاكامی پەیڕەوكردنی ئەم یاسایە دروستبوونی چینێك بەندكراوی ئەبەدی بوو لە زێدی خۆیاندا و بەربەستێكی سەختی لەبەردەم ئەو كرێكارانەدا دادەنا كە دەیانویست لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكیتر بگوێزنەوە.

سمیپ هەوڵیدا كاری بەرهەمهێن و كاری نابەرهەمهێن لێك جیا بكاتەوە، بەوەی دەڵێ "نەتەوە مەزنەكان بە بەفیڕۆدانی گشتی و بەدڕەفتاری هەژار ناكەون ئەگەرچی لەوانەیشە هەندێ جار بەهۆیانەوە هەژار بكەون، چونكە هەموو یان زۆربەی داهاتی نەتەوەیی لە زۆربەی دەوڵەتاندا بۆ پارێزگاریكردن لە دەستە نابەرهەمهێنەكان بەكار دێ، وەك ئەو گەلانەی كۆشكی قەشەنگ و زۆر و زەبەند و دامەزراوەیەكی گەورەی ئیكلێركی و كەشتیگەل و سوپای گەورە دروست دەكەن، كە ئەمانە لە كاتی ئاشتیدا هیچ شتێك بەرهەم ناهێنن قەرەبووی ئەو خەرجە بكاتەوە بۆ هێشتنەوەیان دەكرێ، تەنانەت ئەگەر جەنگیش لەئارادا بێ. ئەو جۆرە خەڵكانەی هیچ بەرهەم ناهێنن لەسەر ئەوە دەژین خەڵكانیتر بەرهەمی دێنن. خۆ ئەگەر ئەوانە ژمارەیان چەند قات زیاد ببێ، ئەوا لە ساڵێكی دیاریكراودا بەشێكی گەورە لەو بەرهەمە بەكار دەبەن و هێندە ناهێڵنەوە بەشی هێشتنەوەی كرێكارە بەرهەمهێنەكان بكات".

ناخۆشبەختانە، كۆلۆنییە ئەمەریكیەكانیش گوێیان بە ئامۆژگارییە دروستەكان سەبارەت بە كاری كۆیلەكان نەدا.

"باوەڕم وایە ئەزموونی هەموو سەردەم و گشت نەتەوەكان دەیسەلمێنن ئەو كارەی كۆیلەكان دەیكەن، ئەگەرچی وا دێتە بەر چاو تەنیا خەرجی دەستكرتن بەو كۆیلانەیان دێنێتە سەر، بەڵام لە كۆتاییدا بەهادارترین كارە، چونكە ئەو كەسەی نەتوانێ ببێتە خاوەنی هیچ شتێك، هیچ قازانجێكی دەست ناكەوێ مەگەر

هەر ئەوەی تا دەتوانێ زیاتر بخوات و کەمتر ئیش بکات. هەربۆیە هەر کارێک دەیکات زیاد لەوەی بەشی کڕینی پێویستیەکانی ژیانی دەکات، بە توندوتیژی و ترساندن نەبێ ئامادە نیە بە ویستی ئازادی بیکات".

پاش ئەوە سمیپ لە پرسەکانی کارەوە دەچێتە سەر بەرگریکردن لە چاککردنی کێشەکانی زەوی. لێرەیشدا پێی وایە پێڕەو نادانای حکومەت و یاسا نەشیاوەکان کۆسپن لەبەردەم پێشکەوتندا. زۆربەی زەویەکانی بەریتانیا لە سەدەی هەژدەیەمدا ملکەچی سەرپرسی (وصایە) بوون. خاوەن زەوی دەیتوانی ڕێسا بۆ دابەشکردن و فرۆشتنی زەویەکەی دەربکات، کە میراتگرانی بۆ چەندین سەدە پاش مردنی پێوەی پابەند دەبن. یەکێك لە نەریتە کۆنەکانیتر مافی کوڕی گەورە بوو لە بردنی هەموو میراتی دایك و باوکی، ئەوەیش عادەتێکی دەرەبەگیانە بوو کە ڕێگە لە پەتکردنی موڵکە گەورەکان دەگرێ. بەگوێرەی ئەم یاسایە کوڕی گەورە تاکە میراتگرە. سمیپ لەبارەی ئەمەوە دەڵێ "هیچ شتێك وەك ئەو مافە زیان بە بەرژەوەندیی بنەماڵەیەکی گەورە ناگەیەنێ، کە بۆ ئەوەی یەك کەسیان دەوڵەمەند بێ، باقیی منداڵەکان بخرێنە ژێر باری هەژارییەکی وا کە ناچار بن دەست پان بکەنەوە". لێرەوە، بەپێداگریەوە داکۆکی لە ئازادیی بازرگانیکردن لە زەویەکان دەکرد، بە هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی وەسێتکردن و یاسای مافی کوڕە گەورە لە میرات و هیتریش کە دەبوونە کۆسپ لەبەردەم گواستنەوەی خاوەندارێتیی زەویەکان، لەڕێی بەخشین یان وەسێتکردن یان فرۆشتنەوە.

بڕگەیەکی بەناوبانگی کتێبی "سامانی گەلان" باس لە کۆلۆنیەکان دەکات و بە بڕوای سەرچاوەیەکی جێمتمانە، ئەو بڕگەیە "باشترین پوختەیە لەبارەی سیاسەتی کۆلۆنیەکان تا ئەو کاتە نووسرابێ". باسکردنی ئەم بابەتە بۆ سێ بەش دابەش دەبێ:

١- "پاڵنەرەکانی دامەزراندنی کۆلۆنیی نوێ"، تێیدا باسی لە پرۆژە کۆلۆنیالیستیەکانی هەریەك لە یۆنان و رۆما و ڤینیس و پورتوگال و ئیسپانیای کردووە.

٢- "هۆکانی خۆشگوزەرانیی کۆلۆنییە نوێکان"، باس لە هۆکارەکانی ئەو خۆشگوزەرانییە دەکات، لەوانە زەوییە فراوان و هەرزانەکان، کرێی بەرز، گەشەی خێرای دانیشتوان و بایەخدانی کۆلۆنیالیستەکان بە کشتوکاڵ و هونەرەکانیتر. (بەراورد لەنێوان سیاسەتە کۆلۆنیالیستییە رۆشنگەرانەکانی ئینگلتەرا و سیاسەتە کۆلۆنیالیستییە بەرتەسك و لەقاڵبدەرەکەی هەریەك لە پورتوگال و ئیسپانیا دەکات).

٣- "لەبارەی ئەو تایبەتمەندیانەی ئەوروپا لە دۆزینەوەی ئەمەریکا دەستی کەوتوون، هەروەها لەرێی گەیشتن بە دورگەکانی هیندی رۆژهەلات لەرێی سەرلوتکەی هیواوە". سمیپ لەبارەی ئەم دوو دۆزینەوەوە دەڵێ "ئەوانە گەورەترین و گرنگترین دۆزینەوەن مێژووی مرۆڤایەتی تۆماری کردوون".

سمیپ هێرشی کردۆتە سەر ئەو کۆت و بەمەبەستی قۆرخکردنی بازرگانییان لەسەر کۆلۆنییەکان دانراون و دەڵێ ئەوە دەستدرێژییە بۆ سەر "مافە سروشتیەکان"ی ئەو کۆلۆنییانە. سیستمی بازرگانی لەو کۆلۆنیانە هیچوپوچ و خەرج گران بوو، رێك وەك ئەو سیستەمەی لەنێو خودی دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکاندا هەبوو. هەروەها داچۆڕینی توانای دارایی هێزە داگیرکەرەکە هەبوو، لەبەرئەوەی کۆلۆنییەکان بە ویستی خۆیان رازی نابن بەوەی باجی ئەوتۆ لەسەر خۆیان بسەپێنن کە بەشی بەرگری لەخۆکردنیان دەکات.

سمیپ توانی لە زۆربەی هاونیشتمانیەکانی بابەتیانەتر تەماشای کۆلۆنییە ئەمەریکیە یاخیبووەکان بکات. باوەڕی وابوو چارەسەری گونجاوی ئەو کێشەیە بریتییە لەوەی ئەو کۆلۆنییە ئەمەریکییانە لە پەرلەمانی بەریتانیادا نوێنەرایەتی

بکرێن–واتە یەکگرتن لەباتیی جیابوونەوە، نوێنەرایەتییەك لەسەر بنەمای داهاتی باج دامەزرابێ. ئەگەر، وەك ڕێی تێدەچێ، بەوە کۆتایی هات کە ئەمەریکیەکان باجی بەریتانیایان زیاد بکەن، ئەوا دەکرێ ئەو پارەیە لەڕێی زەریای ئەتڵەسیەوە بگوێزرێتەوە بۆ "ئەو بەشەی ئیمپراتۆریەت کە بەشداریی زیاتری بووە لە بەرگریی گشتی و پاڵپشتیکردنی هەمووان‌دا". دەشێ ئەمە بەرپەرچدانەوە بووبێ بۆ جەختکردنی تۆم پەین لەوەی گەمژەییە باوەڕ وابێ دورگەیەك دەتوانێ بۆ هەتاهەتایە کیشوەرێك داگیر بکات،"، چونکە ئەوکاتە پێویستە دۆخەکە پێچەوانە بێتەوە.

سمیپ پێداگری لەوە دەکرد کە ئەگەر نەکرێ ناکۆکیی کۆلۆنییە ئەمەریکیەکان بەئاشتییانە لەتەك بەریتانیا چارەسەر بکرێ، ئەوا پێویستە سەربەخۆیی وەربگرن، ئەگەرچی دان بە واقیعەکە دەنێت و دەڵێ "پێشنیارکردنی ئەوەی بەریتانیای مەزن دەستبەرداری هەر دەسەڵاتێکی ببێ بەسەر کۆلۆنیەکانی و لێیان بگەڕێ خۆیان دەسەڵاتەکانیان هەڵبژێرن و یاسا دابنێن، بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان ئاشتی بەرقەرار بکەن یان جەنگ ڕابگەیەنن. ئەمە مانای پێشنیارکردنی سیستمێکە هەرگیز پێشتر ڕووی نەداوە و هیچ نەتەوەیەکی دنیا نایگرێتە بەر... (ئەوکاتە) حوکمکردنیان زۆر زەحمەت دەبێ، هەروەها ئەو داهاتە زۆر کەم دەبێ بەبەراورد بەو خەرجەی تێیاندا دەکرێ".

دووربینیی سمیپ لەم بڕگەیەی خوارەوەدا دەدرەوشێتەوە، کە تێیدا پێشبینیی ئایندەی ئەمەریکا دەکات:

"خەڵکی کۆلۆنییە ئەمەریکیەکان لە بفرۆش و بازرگان و قازیەوە گۆڕان بۆ سیاسەتوان و یاسادانەر، لە پێکهێنانی وێنەیەکی نوێی حکومەتی بەرفراوانی بەریتانیدا بەکار هێنران و وا خۆیان دەبینن کە لە ئایندەدا دەبنە گەورەترین و

بەهێزترین ئیمپراتۆریەت جیهان بەخۆیەوە دیبێ، چاوەڕوانیش دەکرێ ئەوە رووبدات".

بەناوبانگترین بەشی کتێبی "سامانی گەلان"، کە ئەوەیان کرۆکی مەبەستە، بەشی چوارەمیەتی بەناونیشانی "لەبارەی سیستمەکانی ئابووریی سیاسی"، تێیدا ئادەم سمیپ باسی دوو سیستمی جیاوازی کردووە: سیستمی بازرگانی و سیستمی کشتوکاڵ، ئەو رووبەرەیش بۆ باسکردنی بازرگانی تەرخان کراوە هەشت هێندەی رووبەری تایبەت بە کشتوکاڵە.

باسی "ئازادیی کار" دەکات، کە لەو کاتەوە ئیتر ئەو چەمکە بەستراوەتەوە بەناوی ئەوەوە. ئەو گەنگەشەیەی تایبەت بوو بە هەریەک لە کار و زەویەکان و کاڵاکان و پارە و نرخەکان و کشتوکاڵ و ماڵات و باج بەیەک خاڵ کۆتایان هات، ئەویش ئازادیی بازرگانییە لە ناوخۆ و دەرەوەدا. نەتەوە بەبێ بازرگانیەکی ئازاد لە ناوەوە و دەرەوە ناتوانێ پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیی تەواوی دەست بکەوێ.. سمیپ تکای لە نەتەوەکان کرد رەسمە گومرگیەکان و بەخشین و بێبەشکردن لە سیستمی بازرگانی و قۆرخکردنی بازرگانی لەلایەن کۆمپانیا بەڵێندەرەکانەوە هەڵبوەشێننەوە، چونکە هەموو ئەم کۆت و بەندانە گەشەی سروشتیی پیشەسازی و بازرگانی و ئازادیی گەیشتنی کاڵاکان بەدەستی بەکاربەران پەک دەخەن. هەروەها واز لە بنەمای قەڵبی "هاوسەنگیی بازرگانی" بهێنرێ کە بازرگانەکان حەزیان لێیە. پارە تەنها ئامرازێکە "پێوەرێک نیە بەهۆیەوە بتوانین بزانین ئەوەی پێی دەوترێ هاوسەنگیی بازرگانی لەنێوان دوو دەوڵەتدا بەلای کامیاندایە... سامان نە لە پارە و نە لە زێڕ و زیودا نیە، بەڵکو لەو شتەدایە پارە دەیکڕێ و بەکردەوە شایستەی کڕینە".

هەروەها دابەشکردنی کار، وەک چۆن لەنێوان تاکەکاندا پێویست و مەنتیقییە لەنێوان گەلانیشدا بەهەمان شێوەیە. "سەردەستەیی سروشتیی دەوڵەتێک بەسەر

ئـەوانیتر لـە بەرهەمـەهێنانی هەنـدێ کـاڵای دیـاریکراودا، هەنـدێ جـار مەزنـە، بەرادەیەك هەموو جیهان رایدەگەیەنن کە رکابەریکردنی لەو کاڵایانەدا بێهوودەیە. (بۆ نموونە) لە سکوتلەندە دەتوانرێ لەرێی خانووی شوشـەیی و حـەوز و دیـواری گەرمـەوە هەنـدێ جـۆری زۆر باشـی تـرێ بەرهـەم بهێنـرێ، هـەروەها دەکـرێ شـەرابێکی زۆر باشـی لـێ دروست بکـرێ کـە تێچـوونی لانیکـەم سـی قـاتی خەرجیەکەیەتی ئەگەر لە دەوڵەتانی بێگانەوە بهێنرێ و لە کواڵیتیشدا وەك یەکن. جا ئایا ماقووڵە یاسایەك دەربکرێ هاوردەکردنی هەموو سرکە بیانیەکان قەدەغە بکات تـەنها لـەپێناو هانـدانی دروسـتکردنی هـەردوو جـۆری ناسـراو بـە کلارێـت و بەرگەندی لە سکوتڵەندە؟".

سمیپ خەسڵەتە ئابووریـەکانی بازرگـانیی ئـازاد لـەم راسـتیانەدا کـورت و پوخـت دەکاتەوە:

"دروشمـی هـەر سـەرۆك خێزانێکـی ژیـر ئەوەیـە هـەوڵ نـەدا لـە ماڵەکەیـدا شـتێك دروست بکات کە خەرجی دروستکردنی زیـاتر بـێ لـەو پارەیـەی لـە کڕینیـدا پێـی دەدات... ئەوەیش لە رەفتاری هەر خێزانێکدا ژیرانە بێ بەکەمی رێك دەکـەوێ لـە مەملەکـەتێکی مەزنیشـدا گەمـژەیی بـێ. جـا ئەگـەر دەوڵـەتێکی بیـانی بتـوانێ کاڵایەکمان بە هەرزانتر لەو نرخە بۆ بێنێ کـە خۆمـان لـە دروسـتکردنیدا خـەرجی دەکـەین، ئـەوا وا باشـترە لـەباتیی کـاڵا خۆماڵییەکـەی خۆمـان لێیـان بکـڕین و بەشێوەیەك بەکاری بێنین هەندێ تایبەتمەندیمان بۆ بەدیبێنێ".

سمیپ جەخت لە قازانجی دووسەرە لە بازرگانیی بیانیدا دەکات و دەڵێ:

"ئەگەر بازرگانی بیانی لەنێوان هەر دوو شوێنێکدا بکرێ، هەریەکەیان دوو سوودی ئاشـکرای دەسـت دەکـەوێ. ئـەو بازرگانییـە زیـادەی بەرهـەمی زەوی و کـاری هەریەکەیان کە خواستیان لەسەر نیە دەبات و لەباتییان شتێك دێنێ کە خواستی لەسەرە... ئەم ئـاڵوگۆڕە تەنگەبـەریی بـازاڕی لۆکـاڵی دابەشـکردنی کـار لـە هـیچ

لقێکی دیاریکراوی هونەر یان پیشەسازیدا پەك ناخات لەوەی بۆ بەرزترین ئاستی تەواوی بەرز بێتەوە. ئەگەر دەوڵەتێك بازاڕێکی فراوانتر بۆ هەر بەشێك لە بەرهەمی کاری خۆی کە لە بەکاربردنی ناوخۆی زیادە بکاتەوە، ئەوا بەو کارە هێزی بەرهەمهێنانی بەهێز و باشتر دەکات و بەرهەمی ساڵانەی بۆ بەرزترین ئاست زیاد دەکات، بەوەیش داهات و سامانی راستەقینەی کۆمەڵگە زیاد دەکات".

دیارە سمیپ بەباوەڕەوە جەختی لەسەر ئازادیی بازرگانی دەکرد، بەلەبەرچاوگرتنی هەندێ هەڵاوێران یان سنووردارکردنی دیاریکراو لە جێبەجێکردنیدا. دەڵێ: بۆ هاندانی پیشەسازیی ناوخۆ بەگشتی وا باشە هەندێ ئەرك بخرێتە سەر شانی پیشەسازیی بیانی، یەکەمین ئەرکیش ئەو کاتەیە بەرگریکردن لە دەوڵەت جۆرێکی دیاریکراو لە پیشەسازی دەسەپێنێ، تەنانەت ئەگەر بەدیهێنانی ئەوەیش لەبەر هۆی ئابووریی رووت نەبێ، چونکە "بەرگریکردن زۆر لە خۆشگوزەرانی گرنگترە".

لەو رووەیشەوە سمیپ لە دەوڵەتێکی شەڕواندا ژیاوە، دانی بەوەدا ناوە کە ئەو دەوڵەتە دەوڵەمەندانەی وا باشە لە کاتی ئاشتیدا ئاڵوگۆڕیان لەتەك بکەین، لەکاتی جەنگدا لە دەوڵەتە هەژارەکان مەترسیدارتر دەبن. هەروەها لەگەڵ ئەوە بووە کە دانانی تاریفەیەکی گومرگیی خۆپارێزانە لەسەر "پیشەسازییە تازە گەشەسەندووەکان" یارمەتی خێراتر گەشەکردنی دەدات.

سمیپ دووپاتی دەکاتەوە کە هەر دابەزاندنێکی تاریفەی گومرگی پێویستە "بەهێواشی و پلەبەپلە و پاش ئاگەدارکردنەوەیەکی زۆر دوور و درێژ" بکرێ، ئەویش بۆ پاراستنی وەبەرهێنانە نەباتیەکان لەو پیشەسازیەی ناتوانێ لەبەردەم رکابەری بیانیدا خۆ رابگرن و دەستەبەرکردنی پیشەیەك بۆ کرێکاران کە تێیاندا بەدوای کاری نوێدا بگەڕێن.

ئەمە کۆمەڵێ دانپێدانانی واقیعی بوو بۆ رەخنەکانی نەیارانی بازرگانیی ئازاد.

ئەگـەر حکومـەت، وەك سمیـپ دەڵـێ، دەسـت لەسـەر کارەکـان و پیشەسـازی و کشتوکاڵ و زۆربەی چالاکییە ڕۆژانەکانی نەتەوە هەڵبگرێ، ئەی ئەو ئەرکانە چـین کە بۆ حکومەت بەگونجاویان دەزانێ؟! دیـارە بازنـەی بەرپرسـیارێتیی حکومـەت تەسـك دەبێتـەوە و ئـەرکی بنـەڕەتی لـە بەرپەرچـدانەوەی هێرشـی بێگانـە و بەرقەرارکردنی دادپەروەریدا کورت دەبێتەوە.

ئادەم سمیپ بەباشی دەزانێ حکومـەت هەنـدێ جـۆر ئـیش و دامـەزراوەی گشـتی دابمەزرێنێ و چاك بکاتەوە، کە ڕێی تێناچێ کەسێك یان چەند کەسێکی کـەم ئـەو جۆرە پرۆژانە دابنێن، لەبەرئەوەی قازانجیان ناگاتە ئاستی ئـەو پارەیـەی تێیانـدا خـەجی دەکـەن، ئەگەرچـی زۆرجـار زیـاتر لـە تێچووەکانیان کـەڵك بـە کۆمەڵگـە گەورەکە دەگەیەنن.

چاکردنەوەی ڕێگە سەرەکیەکان و ڕووناککردنەوەی شارەکان و دابینکردنی ئاو بۆ خەڵکی لەو ئەرکانەن سمیـپ بـۆ حکومـەتی دەستنیشـان کـردوون. بـەم شـێوەیە بیانوویەکی سادەی بـۆ مانـەوەی ئـەو کەسـەی نـاوی نـاوە "ئاژەڵـە ساختەچـی و فێڵبازەی پێی دەڵـێن "سیاسـەتوان" هێشـتۆتەوە، بـەدەر لـە پارێزگـاریکردن لـە ئاسایشی دەرەکی و سیستمی ناوخۆ.

سمیپ لە یـەکێك لـەو شـتانەی هـەڵاوێردی کـردوون، کـە بەشـداریی حکومەتـە لـە فێرکردنی گەل، زۆر پێش سـەردەمەکەی کـەوتووە و لـەبارەی بایـەخی فێرکردنـی میللییەوە دەڵێ:

"ئەو کەسەی بەشێوەیەکی گونجاو کەڵك لە بـەهرە عەقڵیـەکانی مـرۆڤ وەرنـاگرێ، زیاتر لە مرۆڤی ترسنۆك شـایانی ئەوەیـە بـەبێ نـرخ تەماشـا بکـرێ. وادیـارە ئـەو کەسە ئەندامێکی سەرەکی لە ئەندامەکانی ئەخلاقی سروشـتی بەشـەری شـێواوە. ئەگەرچی حکومەت هیچ سوودێك لە فێرکردنی چینە نزمەکانی گەل نـابینێ، بـەڵام جێـی خۆیـەتی بایـەخ بـەوە بـدات کـە بەتـەواوی نـەزان نـەبن. لەگـەڵ ئەوەیشـدا

حکومەت سوودێکی گەورە لە فێرکردنیان نابینێ. چەندە ئەوان خوێندەوارتر بن کەمتر بەدوای شتە ئەفسانەیی و پڕوپوچەکاندا دەچن کە لە نەتەوە نەزانەکاندا دەبێتە مایەی تێکدانی سیستەم. زیاد لەوەیش، میللەتی زانا و زیرەك لە میللەتی نەزان و دەبەنگ بەنەزاکەتتر و رێکخراوترە. هەر تاکێکیان هەست دەکات ئەو رێزدارە و شایانی ئەوەیە لەلایەن سەرۆکە شەرعیەکانیەوە رێزی بگیرێ. بەوەیش ئامادەیی زیاتر تێدا دەبێ کە رێزی ئەو سەرۆکانە بگرێ.. لە دەوڵەتانی ئازاددا ئاسایشی حکومەت پەیوەندیی زۆری بە هەڵوێستی گەل لەبارەی رەفتاری حکومەتەوە هەیە. لەبەرئەوە زۆر گرنگە میللەت بەو ئاراستەیەدا نەچێ کە بە هەڵچوون و دەمارگیرییەوە حوکم لەسەر حکومەت بدات".

هەڵسەنگاندنی ئادەم سمیپ و کتێبەکەی کە بێلایەن و دوور لە خاترکارییە، کارێکی ئاڵۆزە تەنانەت دوای تێپەڕبوونی دووسەد ساڵیش. بۆ نموونە بەکڵ Buckle لە کتێبی "مێژووی مەدەنیەت"دا دەڵێ: "

دەشێ کتێبی سامانی گەلان... گرنگترین کتێب بێ دانراوە، ئیتر هەڵوێستمان لە رادەی رەسەنیی هزر یان هەژمونی پراکتیکی کتێبەکە هەرچی بێ". ماکس لێرنەر Max Lerner ئەگەرچی کەمتر مەیلی بۆ سمیپ هەیە دەڵێ: "رەنگە کتێبی سامانی گەلانیش هاوشێوەی هەر کتێبێکی نوێ رۆڵی لە گەڵاڵەکردنی دیمەنی ژیانی ئەمڕۆمان هەبووبێ".

لێرنەر ورد بۆی چووە کاتێك دەڵێ "ئەوانەی ئەو کتێبەیان خوێندۆتەوە، ئەوانە بوون کە مەبەستیان بوو سوود لە تێڕوانینی ئەو بۆ جیهان وەربگرن، ئەوانیش چینی راپەڕیوی پیاوانی کار و لیژنە سیاسییە جێبەجێکارەکانیان لە پەرلەمانەکانی جیهان و لیژنە زەینییە جێبەجێکارەکانیان لە ئەکادیمیاکان. لەڕێی ئەوانەوە ئەو چینە توانییان هەژموونێکی گەورە بەسەر باقیی دانیشتوانی جیهاندا

پەیدا بکەن، ئەگەرچی ناشیانناسن، لەڕێی ئەوانیشەوە ھەژموونی گەورەیان بەسەر بۆچوونە ئابووری و سیاسی و نەتەوەییەکانەوە ھەبوو".
زانای ئابووریی ئینگلیزی بەناوبانگ ج.أر.مایۆت J.A.R. Marriott دەڵێ "رەنگە ھیچ دانەرێك لە سەردەمی خۆیدا، ئەو کاریگەرییە قووڵەی لەسەر بیری زانستیی ئابووری و ھەروەھا کاری ئیداری نەبووبێ. ھۆی گرنگیش ھەن کە ھێشتا ئەو کاریگەرییەی ھەیە". زانایەکیتری ئابووری بەناوی و.ر.سکۆت W.R. Scott دەڵێ "سمیپ لە رووی زەینیەوە مامۆستا بوو لە بینینی ژیانی ئابووری بەبەردەوامی و بەگشتی".
لە لایەکیترەوە زۆر لە بیرمەندانی ئازادیخواز و پەرگیر بەئاستەم دەتوانن لە سمیپ ببوورن بەھۆی زیادەڕەویکردنی لە ستایشی بنەمای "ئازادیی کار"دا کە بزنزمان و پیاوانی پیشەسازی کاری پێدەکەن و کتێبەکەی ئەویان بە ئینجیلی خۆیان دادەنێن. ھەروەھا ئەو ڕێبازانەی ئەو لەپێناو پاراستنی کرێکار و جوتیار و بەکاربەر و کۆمەڵگە بەگشتی بەرگری لێکردن، بەبەرچاوی حکومەتەوە لەلایەن کەسانێکی بێ ئاکار و کینەبازەوە شێوێنران، حکومەتیش فزەی لێوە نەھات.
پاشان ئەو مشتومڕە کۆنەیش کە دەڵێ ئایا مریشك لە ھێلکەیە یان ھێلکە لە مریشکە؟ ئاخۆ دەکرا پەیڕەوی لە بنەماکانی سمیپ لە گەشەکردنی ئابووری و پیشەسازی بکرایە ئەگەر ئەو یەك وشەی نەنووسیایە؟ یان ئایا دەکرێ کتێبەکەی "سامانی گەلان"، کە فەلسەفە و پلانێکی بۆ بزاڤە نوێیەکە پێشکەش کرد، ئەو ھەموو گۆڕانە بەرفراوانە بێنێتە کایە کە پاش بڵاوکردنەوەی روویاندا؟ رەنگە راستەقینەکە لە شوێنێکی ناوەڕاستی رێگەدا بێ.
ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە ئادەم سمیپ سەردەمی راستەقینەی بۆ لەدایکبوونی ھەڵبژارد و لە ناوەڕاستی رێگە لەنێوان دوو قۆناغی مێژووییدا وەستا. بانگەشەی بۆ ئازادیی ئابووریی نوێ کرد و جیھانێکی تامەزرۆیش گوێی بۆ شل کرد و بۆ

بەدەستهێنانی گۆڕانێکی ئابووریی مەزن کەڵکی لە بنەماکانی وەرگرت. لەکاتی شۆڕشی پیشەسازیدا پیاوانی کاری بەریتانی دەرکیان بە دروستیی ڕێبازەکانی سمیپ کرد و کۆت و بەند و ئیمتیازاتە بازرگانیەکانیان واز لێهێنا. لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئەو ڕێبازانە بەریتانیایان وەك دەوڵەمەندترین نەتەوە پێشانی دنیادا. دیارە کاریگەریی بۆچوونەکانی سمیپ لەسەر دەوڵەتە بازرگانییە گەورەکانیتریش بەدەگمەن لەوە کەمتر بووبێ.

کەمن ئەوانەی نکوڵی لەوە دەکەن کە ئادەم سمیپ بەشایستەییەوە شایانی نازناوی "باوکی زانستی ئابووریی نوێ"یە.



## ٤- "بنەمای دانیشتوان"

## تۆماس مالتوس Thomas Malthus

### نانخۆری زۆر

لە کۆتاکانی سەدەی هەژدەیەمدا خەیاڵی خەیاڵپلاوانی ئەوکات چێژێکی خۆشی دەبەخشی. ئەو میسالیەتەی لە ئەمەریکا و فەرەنسا لەگەڵ بزاڤە شۆڕشگێڕیەکان هات وای بردە مێشکی خەیاڵپلاوان کە ئیتر کامڵبوونی مرۆڤ لە ئاسۆوە سەری دەرهێناوە و لە دروستبوونی بەهەشتێك لەسەر زەوی نزیك بووینەتەوە.

لەو خەیاڵپلاوانە ویلیەم گۆدوین لە ئینگلتەرا و مارکیز دی کوندۆرسیە لە فەرەنسا. ئەم دوو پیاوە هەواداری زۆر دڵسۆزیان هەبوو کە لەپێناو هەڵهاتنی رۆژێکی نوێدا، بانگەشەیان بۆ زۆر خەون و ئومێد و خەیاڵ دەکرد. گۆدوین لە کتێبی "دادپەروەریی سیاسی"دا باسی کۆمەڵێ بۆچوونی نموونەیی بێئەندازە گەشبینی کردووە، کە پوختەکەیان ئەوەیە "رۆژێك دێ تێیدا هەموو تەژی دەبین لە زیندوویی و ئیتر پێویستمان بە خەوتن نابێ، تەژی دەبین لە ژیان و ئیتر پێویستمان بە مردن نابێ، هەروەها پێداگری لەسەر گەشەپێدانی هێزە زەینیەکان بەسەر پێویستی بۆ هاوسەرگیریدا زاڵ دەبێ. بەکورتی، خەڵك وەك فریشتەیان لێ دێ". گۆرانی بەبالای ئەوەدا دەگوت کە "لەگەڵ باشبوونی تەندروستی و تەمەندرێژیدا باشبوونی زیاتریش روودەدات. نە جەنگ دەمێنێ نە تاوان و نە بەرقەرارکردنی دادپەروەری  و نە حکومەت. زیاد لەوەیش نە نەخۆشی و نە ئازار و نە خەم و خەفەت و نە رق و کینە نامێنن. هەموو مرۆڤێك بە حەماسێکی زۆرەوە کار بۆ خێری هەمووان دەکات".

بـۆ ڕەواندنــەوەی تــرس لــە ڕووبەڕووبوونــەوەی ژمارەیــەکی زۆری دانیشــتوان لەبەرانبەر بوونی بڕێکی زۆر کـەم خـۆراک، گۆدوین دەنووسـێ "لەوانەیـە ملیۆنـان ساڵی پڕ لە دانیشتوانی روو لەزیاد تێبپەڕن، بـەڵام زەوی لـە بەخشـینی خـۆراکی پێویست بۆ ژیانی دانیشتوانەکەی بەردەوامە". هەروەها بـیری لـەوە کـردەوە کـە لەوانەیە حەزی سێکسی بپوکێتەوە. کۆندۆرسیە پێی وابـوو دەشـێ بمێنێ، بـەڵام بەبێ ڕێژەیەکی بەرز لە زاوزێ.

ئـەم بلّقـە جوانانـە کەڵکەڵـەی تەقانـدنیان دەوروژانـد، دەرزیـی ئـەو تەقاندنـەیش لاوێکی ئیکلیرکی زمان هاج

ئامادەی کرد بەناوی تۆماس ڕۆبەرت ماڵتۆس، کـە تەمـەنی سـی و دوو سـاڵ و لـە کۆلێژی یەسوعی کامبریدج بوو. لە وەڵامی ئەوانەی باوەڕیان بەوە بوو مرۆڤایـەتی دەگاتە پلەی کاملّیی کۆمەڵایەتی، ساڵی ١٧٩٨ کتێبی "وتارێـك لـەبارەی بنـەمای دانیشـتوان"ی دەرکرد، کـە بـوو بـە یـەکێك لـە کتێبـە کلاسـیکییە مەزنـەکان لـە ئابووریی سیاسیدا.

ماڵتۆس لە سەردەمی ئادەم سمیپ و تۆماس پین-دا ژیاوە ئەگەرچی لـە تەمەنـدا زۆر لەوان منداڵتر بووە. دووەم کوڕی دانیاڵ ماڵتۆس بوو، کە پیـاوێکی لادێـی دارا و هاوڕێی ڕۆسۆ و بەڕێوەبەری کێڵگەکەی بوو، یەکێك بوو لەوانەی زۆر بە جۆدوین سەرسام بوو. باب و کوڕ مەراقیان مشتومڕ بـوو. تۆمـاس هێرشـی دەکـردە سـەر بۆچوونە خەیاڵیـەکان، لەکاتێکدا دانیـاڵ بـەرگری لـێ دەکـردن. دواجـار مـاڵتۆس بـەدەم پێـداگریی باوکیـەوە چـوو و بڕیاریـدا بۆچـوونەکانی لـەو کتێبەیـدا ڕوون بکاتەوە، کە لە ماوەی ١٥٦ ساڵی ڕابردوودا کاریگەرییـەکی قـووڵی لەسـەر هـزر و ژیانی مرۆڤایەتی دروست کرد. ڕەنگە ئەو کاریگەرییـە لـە هـیچ سـەردەمێکدا وەك ئەم ئەم سەردەمەی ئێستا ڕۆشن نەبێ. ئەوەی ئـادەم سمیـپ بیسـت و دوو سـاڵ

بەر لەوە لە پرسیارکردنی دەربارەی سروشت و هۆکانی سامان پێی هەستا، مالتۆس بە شیکردنەوەیەکی وردی سروشت و هۆکانی هەژاری تەواوی کرد.

کتێبی "وتارێك لەبارەی بنەمای دانیشتوان" و کاریگەری لەسەر باشکردنی کۆمەڵگە لە ئایندەدا، لەگەڵ تێبینیەکانی لەبارەی خەونەکانی مستەر جۆدوین و مارکیز دی کۆندۆرسیە و باقیی ئەو نووسەرانەیتر کە بۆچوونەکانیان بڵاو کردۆتەوە بەبێ ئەوەی ناویان ببرێ، لە چاپی ساڵی ١٧٩٨دا کەمێك لە ٥٠ هەزار وشە زیاتر بوو. ئەوەیش روونە کە ژمارەیەکی کەمی لێ چاپ کراوە، لەبەرئەوەی ئەو کۆپیانەی لەو چاپە ئێستا ماون زۆر دەگمەنن. پاش ئەوە دانەر دەڵێ "ئەم کتێبۆکەیە لەسەر پاڵنەری ئەوکاتە و بەو مادە کەمانەی لە ناوەندێکی لادێیدا لە بەردەستمدا بوون، نووسراوە".

ئەڵبەت بیرۆکەی ئەو وتارە نوێ نەبوو، لەبەرئەوەی زۆر لە نووسەرانی سەدەی هەژدەیەم، لەوانە بینجامین فرانکلین، قسەیان لەسەر پرسی زیادبوونی دانیشتوان کردووە، بەڵام هیچکامیان بەو بەهێزی و حەماس و بەرچاوڕوونییە پێشکەشیان نەکرد، کە مالتۆس کردی.

مالتۆس لە سەرەتای کتێبەکەیدا دوو گریمانەی بنچینەیی باس کردووە:

یەکەم: خواردن بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستە. دووەم: غەریزەی جینسی بۆ هەردوو رەگەز پێویستە و بەنزیکەییش هەر وەك ئێستای دەمێنێتەوە.

خەیاڵپڵاوان خۆیان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە مرۆڤ لەوانەیە لە کۆتاییدا بتوانێ بەبێ خواردن بژی.

بەڵام مستەر جۆدیون مەزەندەی خۆی راگەیاند کە ئارەزووی جینسی لەنێوان نێر و مێدا لەکاتی گونجاودا خامۆش دەبێ.. باشترین مشتومڕ لەبارەی کەماڵی مرۆڤەوە لە وردبوونەوە لەو پێشکەوتنەی مرۆڤ لە حاڵەتی وەحشیەوە تا ئێستا بەدەستی هێناوە، هاتەکایە.. بەڵام هیچ پێشکەوتنێك بەرەو خامۆشبوونی

غەریزەی جینسی لەنێوان نێر و مێدا رووی نەداوە و وادیارە هێشتا هەمان گوڕ و تینی هەیە كە دوو هەزار یان چوار هەزار ساڵ لەمەوپێش هەیبووە.

مالتۆس وای گریمانە كردبوو كە "پەیامەكانی" هی ئەوە نین پووچ بكرێنەوە، هەربۆیە بنەما بەناوبانگەكەی دانا كە دەڵێ:

"..بەدڵنیاییەوە هێزی مرۆڤ لەو هێزەی لە زەویدایە بۆ بەرهەمهێنانی مادە بۆ مرۆڤ گەورەترە. جا ئەگەر گەشەكردنی ژمارەی دانیشتوان رانەگیرێ، ئەوا بە زیادكردنێكی ئەندازەیی (متوالیە هندسیە) زیاد دەكەن لەكاتێكدا خێراتی زەوی تەنها بە زیادكردنێكی ژمێرەیی (حسابی) زیاد دەكات. ئاگەداربوونێكی سادە لە ژمارەكان زەبەلاحیی هێزی یەكەم لەچاو دووەم پیشان دەدات".

مالتۆس پێشنیارەكەی زیاتر دەڕازێنێتەوە و بابەتەكەی بەم شێوەیە دەخاتە روو:

"سروشت لەنێوان هەردوو مەملەكەتی ئاژەڵی و رووەكیدا تۆوی ژیانی بەدەستێكی سەخاوەتمەندانە و بەئازادی، بۆ دەرەوە وەشاندوە. لە شوێن و خۆراكی پێویست بۆ خۆراكدانیان توندگیری كردوە، هەربۆیە توخمی رووەك و توخمی ئاژەڵ بەگوێرەی ئەم یاسا قەیدكەرە گەورەیە كەم دەكەن، رەگەزی مرۆڤیش، هۆكان چەندە بەهێز بن، ناتوانێ لەم یاسایە قوتار بێ. ئاسەواری ئەوەیش لەنێو رووەك و ئاژەڵەكاندا فەوتانی تۆوەكان و نەخۆشی و مردنی پێشوەخت بوو. لەنێو رەگەزی مرۆڤیشدا نەهامەتی و خراپە".

بە بڕوای مالتۆس ئەم راستییە سەخت و واقیعییانە كۆمەڵێ بەربەستیان لەبەردەم كەماڵی كۆمەڵگە داناوە، كە ناتوانرێ تێپەڕێنرێن. هیچ ریفۆرمێكی نەیتوانیوە فشاری یاسا سروشتیەكان لاببات، كە رێگرن لە "بوونی كۆمەڵگەیەك هەموو ئەندامانی لە خۆشگوزەرانی و بەختەوەری و ئاسوودەییەكی رێژەییدا بژین و هەست بە هیچ بایەخدانێك بە دەستەبەركردنی ئامرازەكانی ژیان بۆ خۆیان و خێزانەكانیان نەكەن".

مـالتۆس بـۆ ڕوونکردنـەوەی زیادبوونـە ئەندازەییەکـەی زیـادبوونی ژمـارەی دانیشتوانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی وەرگرت "کە تا ئامرازەکانی ژیان لـەبارتر بـن، ئـەخلاقی خـەڵك بێگـەردتر دەبـێ" و لێرەیشـەوە سـنووردارکردنی زوو هاوسەرگیریکردن کەم دەکاتەوە.

مالتۆس بینی ژمارەی دانیشتوان، بەدەر لە کۆچ، لـە مـاوەی ٢٥ سـاڵدا دووقـات بووە، لەوەیش بەو دەرەنجامە گەیشت کـە کاتێك کۆت و بەند لەسەر سروشت دانەنرێ و وەچەخستنەوە و هاوسەنگی ڕانەگیرێن، لـە هـەموو نەوەیەکدا ژمـارەی دانیشـتوان دووقـات دەبـێ. بـەڵام ڕەخنـەگران هەسـتیان بـە بـوونی کەلەبـەر لـە ڕێساکەی مالتۆسدا کرد، لەبەرئەوەی ئەو بارودۆخەی لەو قۆناغەی مالتۆس باسـی دەکات لە ویلایەتە یەکگرتووەکان باو بوو، بۆ هیچ قۆناغێکیتری مێژووی ئەمەریکا و بگرە مێژووی هیچ نەتەوەیەکیتر نموونەیی نەبووە.

مالتۆس پێوەرەکەی لەبارەی زیادبوونی ژمـارەی دانیشـتوان لـە ئینگلتـەرا بـەکار هێنا، واتە دووقاتبوونی ژمارەیان لە هەموو ٢٥ ساڵێکدا، پاشان ئـاوڕی لـە پرسـی خۆراك دایەوە و گەیشتە ئەو دەرەنجامـەی "بەگرتنەبـەری سیاسـەتێکی دانایانـە، واتە بەزیادکردنی ڕووبەری زەوی و هاندانی کشتوکاڵ، دەکرێ لە یەکـەمین بیسـت و پێنج ساڵدا بەرهەمی ئەو زەوییە دووقات بکرێ".

پاش ئەوە لە نەوەی دووەمدا زەحمەتیەکان دەست بە کەڵەکەبوون دەکەن کاتێك ژمارەی دانیشتوان جارێکیتر دووقات دەبێتەوە. واتە دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ چوار هێندەی ژمارەکـەی سـەرەتای لێدێ. "مەحاڵـە گریمانـە بکـرێ کـە بەرهـەم بگاتە چوار هێندەی ڕادەی سەرەتا". ئەوپەڕی چاوەڕوانی ئەوەیە چـاوەڕوان بـن سەرچاوەکانی خۆراك سێ هێندەی پێشتر زیاد بکەن. بـە زمـانی ژمـارە یاسـاکەی مالتۆس بۆ ژمارەی دانیشتوان (زیادبوونی ئەندازەیی) بـەم شـێوەیە: ١، ٢، ٤، ٨،

١٦، ٣٢،... بەڵام زیادبوونی خۆراك (زیادبوونی ژمێرەیی) بەم شێوەیە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧.... هتد.

بەرەنجامی لۆژیكیی توێژینەوەكەی مالتۆس ئەوەیە پێویستە ئامرازێكی بەردەوام بدۆزرێتەوە بۆ راگرتنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، مەترسیدارترینی سەرجەم ئامرازەكانیش كەمیی خۆراكە. دەستەی "ئامرازە راستەوخۆكان"یش كۆمەڵێ رێوشوێنی "ئەرێنی" دەگرێتەوە، وەك شوێنی نیشتەجێبوونی ناتەندروست و كاری قورس و هەژاریی نوتەك و نەخۆشی و خراپ پەروەردەكردنی منداڵان و شارە گەورەكان و پەتا و قات و قڕی. هەرچی ئامرازە "رێگرەكانە، خەفەكردنی ئەخلاقی و بەدڕەوشتی دەگرێتەوە. بەبڕوای مالتۆس ئەمە ئەنجامگەلێكی كرداریی حەتمی بەدوادا هاتووە. ئەگەر بڕیار بێ مەخلوقاتە بەشەریەكان گەورەترین بەختەوەریی مومكین بەدەست بێنن، پێویستە لەسەریان ئەركە خێزانیەكان نەگرنە ئەستۆ مەگەر كاتێك لەتوانایاندا بێ خێزانەكانیان بژێنن. هەرچی ئەو كەسانەن داهاتی پێویستیان نیە بۆ ژیاندنی خێزانێك، پێویستە بەهیچ شێوەیەك هاوسەرگیری نەكەن و بەعازەبی بمێننەوە. زیاد لەوەیش، پێویستە سیاسەتی میللی وەك یاسای هەژاران رێگە لە هاندانی چینی كرێكاران و هاوشێوەكانیان بگرێ لەوەی منداڵیان ببێ كاتێك ناتوانن بەخێویان بكەن.

"ئەو پیاوەی هاتۆتە دنیا و ناتوانێ لە باوك و دایكیەوە قووتی ژیانی بەدەست بێنێ، كە مافێكی رەوای لەسەریانە، ئەگەر كۆمەڵگە حەزی لە كاری ئەو كەسە نەبێ، ئەوا مافی لە كەمترین بەشی خواردندا نیە، لەڕاستیدا لەو جێیەی لێیە كارێكیشی نیە".

ئەمەی لە وەڵامی وتارێكی پیندا نووسی بەناونیشانی "مافەكانی مرۆڤ".

سەدەقە، چ تایبەت بێ یان حكومی، خواستراو نیە، لەبەرئەوەی پارەیەك دەداتە هەژاران بەبێ زیادبوونی بڕی خواردنی پێویست. بەوەیش نرخ بەرز دەبێتەوە و

مادەکـان کـەم دەکـەن. هـەروەها پلانـی نیشـتەجێکردنی میللـی قەدەغەیـە لەبەرئەوەی هانی هاوسـەرگیریی زوو دەدات و بـەوەیش ژمـارەی دانیشـتوان زیـاد دەکات. بەرزبوونەوەی نرخیش هـەمان کاریگـەریی زیانبەخشـی هەیـە، لەبەرئـەوە تاکە ڕێگە بۆ هەڵاتن لە چنگ ئەم تەڵەزگە ئاڵۆزە بریتییە لە هاوسەرگیریی درەنگ لەگەڵ "خەفەکردنی ئەخلاقی"، واتە گرتنەوەی نەفس لە ئارەزووەکان.

لە دیدی ماڵتۆسدا هەر پرۆژەیەك بۆ باشکردنی کۆمەڵگە و سووککردنی هـەژاری، مەترسی ئەوەی لەپێشە بـە زیـادبوونی ئـەو خراپانـەی هـەوڵی چارەسـەری داون، کۆتایی پێبێ.

ئەم ڕێچکە منجرەی ئەو لاوە ئیکلیرکییـە دژ بـە کۆمەڵگـە، دیـدگای کۆمەڵناسـانی لەو نەوەیە و نەوەکانی پاشتردا گۆڕی. لەگەڵ ئەوەیشدا دەوڵەمەندانی سـەردەمی ماڵتۆس و ئەو چینانەی جڵـەوی دەسـەڵاتیان بەدەسـتەوە گرتبـوو، بەحەماسـەوە ڕێبازەکـەیان لـەئامێز گـرت. کەواتـە هـۆی هـەژاریی بـەربڵاو و زیانـە کۆمەڵایەتیەکانیتر، لـەباتیی خـراپ دابەشـکردنی سـامان، بـۆ هاوسـەرگیریی زوو و وەچەخستەوەی زۆر دەگەڕێتەوە.

دەکرێ ڕێچکەی ماڵتۆس لەبارەی بەرنامەکانی کۆمەکیکردن لەلایـەن حکومەتـەوە لەم بڕگەیەدا روون بکرێتەوە کە دەڵێ:

"یاسـا ئینگلیزییـەکانی تایبـەت بـە هـەژاران بـەلای خراپترکردنـی دۆخـی گشـتیی هەژاراندا دەچن، بەم دوو ڕێگەیە: کاتێك بەلای زیادکردنی دانیشتواندا دەچن بەبێ زیادکردنی بڕی خواردنی پێویست بۆیان. لەوانەیە پیـاوێکی هـەژار ژن بـێنێ بـەبێ ئەوەی بزانێ ئەو ناتوانێ تـەنیا بەپشتبەسـتن بـەخۆی خێزانەکـەی بـەخێو بکـات، ئەوکاتە دەکـرێ بەشـێوەیەك لـە شـێوەکان بڵـێین حکومـەت خـۆی ئـەو هەژارانـە دروست دەکات کە بەخێویان دەکـات. لەبارێکدا پێویسـتە لـە حاڵـەتی زیـادبوونی ژمارەی دانیشتواندا داهاتەکانی دەوڵەت بە ڕێـژەی بچوك بەسـەر هـەموو تاکێکدا

دابەش بکرێن، ئەوا ئاشکرایە داهاتی کاری ئەو کەسانەی کۆمەکیەکانی ئەبروشیە نایانژێنێ، بڕێکی کەمتر لە جاران خۆراکی پێ دەکڕدرێ. ئەوەیش پاڵ بەزۆر کەسیانەوە دەنێ تا داوای کۆمەکی بکەن.

دووەمیشیان ئەوەیە دەڵێ بڕی ئەو خۆراکەی لە پەناگەکاندا لەلایەن تاقمێك لە کۆمەڵگە بەکار دەبرێ، کە ناکرێ بەگشتی بە تاقمە بەنرخەکە دابنرێ، لە پشکی ئەندامە بەنرخترەکان کەم دەکاتەوە. بەم شێوەیە، بەهەمان رێگە ژمارەیەکیتر ناچار بە پاڵدانەوە دەکرێن".

ماڵتۆس لە کۆتاییدا وتارەکەی پوخت دەکاتەوە و دەڵێ:

"هەمان شت بەسەر بارودۆخیتردا دەچەسپێ. دەکرێ جەخت لەوە بکرێ کە زۆریی ژمارەی دانیشتوان لە نەتەوەیەکدا لەگەڵ بڕی ئەو خۆراکەی بەرهەمی دێنێ یان دەکرێ بەدەست بێ، دەگونجێ و بەگوێرەی ئەو ئازادییەی ئەو خواردنەی پێ دابەش دەکرێ یان ئەو بڕە خواردنەی دەشێ بە کاری یەك رۆژ بێتە کڕین، بەختەوەر دەبێ. دەوڵەتانی بەرهەمهێنی گەنمیش دانیشتوانیان لە دەوڵەتانی ئاژەڵدار زیاترە، بەڵام بەختەوەرییان نە لەسەر زۆری یان کەمیی ژمارەی دانیشتوانیان، نە لەسەر هەژاری یان دەوڵەمەندییان و نە لەسەر لاوی و پیرییان نەوەستاوە، بەڵکو لەسەر رێژەی نێوان ژمارەی دانیشتوان و بڕی خواردن وەستاوە".

کتێبەکەی ماڵتۆس گەردەلوولێك لە رەخنە و ناڕەزایی و تانەلێدانی بەدوای خۆیدا هێنا، بەتایبەت لە دوو لایەنەوە، کە ئەوانیش کۆنەپارێزە لاهوتیەکان و پەرگیرە سۆسیۆلۆژیستەکان بوون. گرنگترین ژیاننامەنووسی ماڵتۆس، کە بۆنارە Bonar دەڵێ "ئەو وتارە بۆ ماوەی سی ساڵ بوختانباران کرا".

ماڵتۆس زەمکراوترین پیاوی سەردەمی خۆیەتی و وەسف کراوە بەوەی "پیاوێکە بەرگری لە ئاوڵە و کۆیلایەتی و کوشتنی منداڵان کردووە، پەلاماری چێشتخانە

میللیەکان و هاوسەرگیریی زوو و کۆمەکیەکانی ئەبروشیەکانی داوە، ئەو کەسەی هیچوپوچی گەیشتە رادەیەك لەکاتێکدا لەبارەی خراپیەکانی خێزانەوە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، کەچی خۆی ژنی هێنا، ئەوەی پێی وابوو حوکمی جیهان خراپە و باشترین ئامرا خراپترین و زیانبەخشترین ئەنجامی لێ دەکەوێتەوە، بەکورتی، ئەو هەموو رەونەق و جوانیەکی لە ژیان سەندەوە".

کەم نەبوون ئەو رەخنەگرانەی بەسووك سەیرکردنەوە تەواوی بنەماکانی مالتۆسیان تووڕدا. ئەوەتا هازلیت Hazlitt دەڵێ "پاش خوێندنەوەی لیستەکانی رەگەزی نوح هیچی نەدۆزیەوە، دوای ئەوەی زانی دنیا خڕە".

کۆلیریدج Coleridge دەڵێ "ئایا ئێمە ئێستا پێویستمان بە کتێبگەلێکە فێرمان بکات نەهامەتیی گەورە و بێڕەوشتیی مەزن لە هەژاری دەکەونەوە، هەروەها (گوایە) پێویستە دژوارترین هەژاری هەبێ کاتێك ژمارەی دەمەکان لە نانەکان زیاتر و سەرەکان لە مێشکەکان زیاتر بن؟".

هەندێکیتر توندتر دابەزینە سەری. (ویلیەم تۆمپسۆن) پێشڕەوی سۆشیالیزمی ئینگلیزی لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانیدا دەڵێ: "بە درۆ و دەلەسەی بریقەدار سووکایەتی بە هەژاران مەکە کە زۆرینەی هەرەزۆری بەشەرن، (گوایە) لەرێی ژمارەی دانیشتوانی سنووردارکراو یان نەخواردنی پەتاتەوە بەختەوەرییان لە دەستی خۆیاندایە، لەکاتێکدا هۆکان باقین، ئەو هۆیانەی وا دەکەن لە رووی ئەخلاقی و ئاینیەوە مەحاڵ بێ بەبێ پەتاتە و وەچەی بێ خۆراك بژین..".

(ویلیەم کۆبێت)یش لە دەربڕینێکی توندا دەڵێ "چۆن مالتۆس و شوێنکەوتە بۆگەنە گەمژەکانیان دەتوانن، ئەوانەی دەیانەوێ چینە هەژارەکان فڕێ بدرێن و رێگە لە هاوسەرگیریی هەژاران بگیرێ، چۆن ئەو تاقمە بێئەقڵە لەخۆباییە دەتوانن تەماشای رووی پیاوی زەحمەتکێش بکەن کە ئەوان لە هەمان کاتدا داوای لێدەکەن چەك هەڵبگرێ و بۆ بەرگریکردن لە نیشتمان ژیانی بخاتە مەترسی؟".

هەر کۆبیت بوو وەك توانج نازناوی "قەشە"ی دایە پاڵ ماڵتۆس لەو دەمەتەقێیەی بەرێکەوت لەگەڵ جوتیارێکی کرد و گوتی:

دەتەوێ چەند منداڵت ببێ؟

جوتیارەکە وەڵامی دایەوە: ژمارە بەلامەوە گرنگ نیە، چونکە خوا دەم نانێرێ بەبێ ئەوەی گۆشت بنێرێ.

کۆبیت گوتی: قەت ناوی قەشەیەکت نەبیستووە بەناوی ماڵتۆس؟

جوتیارەکە گوتی: نەمبیستووە گەورەم..

گوتی: ئەگەر ئەو ئەم قسەتی ببیستایە، شێت و هار دەبوو، لەبەرئەوەی دەیەوێ پەرلەمان یاسایەك دەربکات لە هەزاران قەدەغە بکات لە تەمەنێکی زوودا هاوسەرگیری بکەن، یان منداڵی زۆریان ببێ.

ژنی جوتیارەکە سەری سوڕما و گوتی: ئایەڕۆ چ وەحشێکە!. بەڵام مێردەکەی پێکەنی و وایزانی سوعبەت ئەکەم.

کاتێ رێبازی ماڵتۆس بۆ یەکەم جار سەری هەڵدا، بەتۆمەتی ئەوەی ئەو رێبازە لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ کە بەدیهێنەری گەردوون چاکەکارە بەرهەڵستی کرا. هاوکات ماڵتۆس تۆمەتبار کرا بەوەی کتێبێکی دەرکردووە پێچەوانەی رێنماییەکانی ئاینە. ئەوەیش تۆمەتێکی پشتشکێن بوو دژی کاهینی کەنیسەیەکی دانپێدانراو. بەهۆی ئەم رەخنەوە ماڵتۆس لە چاپی دووەمی کتێبەکەیدا، جەختی لەسەر "چەپاندنی ئەخلاقی" کرد وەك رێگەیەك کە پارێزگاری لە ژمارەی دانیشتوان لە چوارچێوە دیاریکراوەکەدا دەکات، هەروەها باسی نەهامەتی و بێرەوشتی (رژێلە)ی سڕیەوە، بەوەیش "هەموو بەدگومانیەکی لەبارەی رەحمی خوا" رەواندەوە.

لە بەرنامەی زیندوو راگرتنی سەدەمین ساڵیادی لەدایکبوونی ماڵتۆسدا، واتە لە ساڵی ١٩٣٥، بۆنار بەرگری لە ماڵتۆس کرد دژی ئەوانەی بەبڕوای ئەو

نوێنەرایەتیەکی خراپی دانەریان کردووە، هەروەها خراپ خوێندوویانەتەوە و بەخراپ هەندێ لە قسەکانیان باس کردووە و بەخراپی لێی حاڵی بوون. بەتێڕوانینی ئەو، مالتۆس لە خستنەڕووی ڕێبازەکەیدا پۆزەتیڤ بوو نەك تێکەتیڤ. بۆنار پێی وابوو "خواستی دڵی مالتۆس بۆ مرۆڤایەتی" ئەم ئامانجانەی لەخۆ گرتووە:

١- ڕێژەیەکی نزمی مردن بۆ هەمووان.

٢- ئاستێکی بەرزی گوزەران بۆ هەژاران.

٣- کۆتایی لەناوچوونی ساواکان.

مالتۆس پێی وابوو نەتەوەکان چەندە شارستانیتر و زاناتر بن و ئاستێکی بەرزتری گوزەرانیان هەبێ، ڕێگە لە خێرایی بەرزبوونەوەی ڕێژەی لەدایکبوون دەگرن. لە ئەنجامی ئەوەیشدا بۆچوونەکانی لەبارەی ئایندەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پلەبەپلە گەشبینیبەخش دەبوون. مالتۆس تێبینی کرد لە خودی ئینگلتەرادا "دەبێ خێراترین سەرنجی رووکەشانە لەبارەی کۆمەڵگە قەناعەتمان پێ بکات کە ئامرازەکانی سنووردارکردنی وەچە لەنێو هەموو چینەکاندا، بەپلەیەکی بەرز بەڕێوە دەچێ". ڕاستیەکەی ئەو سەرجەم چینە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی وەرگرتبوو، بە خانەدان و پیشەکار و وەرزێر و کرێکار و خزمەتکارانی ماڵانەوە، هەرچینێك بەجیا، ئەویش بەهۆی جیاوازیی هەلومەرجی ئابوورییانەوە. باوەڕیشی وابوو هەڵپەی مرۆڤ بۆ پارێزگاریکردن لە پێگەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی، ڕێگە لە هاوسەرگیریی خێرا دەگرێ. بۆ نموونە:

ئەو پیاوەی فێرکردنێکی ئازادی هەیە و داهاتەکەی خەریکە بەشی ئەوە نەکات هاوڕێیەتیی چینی خانەدانەکان بکات، پێویستە بەتەواوی لەوە دڵنیا بێ کە ئەگەر ژنی هێنا و خێزانی پێکەوەنا، لە تێکەڵبوونی بە کۆمەڵگە ناچار دەبێ تێکەڵ بە چینی مامناوەندی جوتیاران و چینی پیشەییە نەویترەکان ببێ. واتە لە پلیکانەی

کۆمەڵگەدا دوو یان سێ پلە دابەزێ، بەتایبەت لەو ئاستەی پلەبەندیەکەدا کە فێرکردن تێیدا کۆتایی دێت و نەزانی دەست پێدەکات، عامەی خەڵك بە زانا و خەیاڵپلاوێکی وەحشی دانانێن، بەڵکو بە شەڕێکی راستەقینە و بنچینەیی دادەنێن.

لە قسەکانی هاوسەردەمەکان دەکرێ بەو دەرەنجامە بگەین کە مالتۆس لەکاتی ژیانیدا پشتگوێ نەخراوە، چونکە ئەو ئاسەوارەی چاپی یەکەمی "وتار" دروستی کرد وای لە حکومەتی ئینگلیزی کرد ساڵی ١٨٠١ سەرژمێرییەکی دانیشتوان بکات، کە ئەوە یەکەمین سەرژمێرییە لە هاتنی ئەو ئەرمادا Armada وە ئەنجامی بەدیهێناوە. پێشنیارەکانی سەرژمێریی پێشوو بەرهەڵستی کرا گوایە لەگەڵ رێنماییەکانی کتێبی پیرۆز و هەروەها نەریتە ئینگلیزیەکاندا ناگونجێ. وتار-ەکەی مالتۆس ئەنجامێکیتریشی هەبوو، ئەویش هەموارکردنی یاسای هەژارانی حکومەت بوو بەمەبەستی دووربوون لە هەندێ هەڵە کە مالتۆس دیاری کردبوون.

بیرۆکەکانی مالتۆس هاوشێوەی کاریگەرییان لەسەر زانستە کۆمەڵاتیەکان، کاریگەرییان لەسەر زانستە سروشتیەکانیش زۆر بەهێز بوو. هەریەك لە چارلز داروین و ئەلفرێد رسل والاس ئازادانە رایانگەیاند ئەوان قەرزاری مالتۆسن لە گەڵاڵەکردنی بیردۆزی پەیدابوون لەڕێی هەڵبژاردنی سروشتیەوە. داروین دەنووسێ:

لە ئۆکتۆبەری ١٨٣٨، واتە پاش تێپەڕینی پازدە مانگ بەسەر توێژینەوە سیستماتیکەکەمدا، وا رێك کەوت هەر بۆ خۆشی وتاری ژمارەی دانیشتوانی مالتۆسم خوێندەوە. لەکاتێکدا تەواو ئامادە بووم بۆ نرخاندنی "ململانێی مانەوە" (دەستەواژەیەك بوو مالتۆس بەکاری هێناوە) کە لە هەموو جێیەك روودەدات و لەکاتی سەرنجدانی دوور و درێژم لە ئاژەڵ و رووەکەکان بینیومە، دەستبەجێ ئەوە بەخەیاڵمدا هات کە لەژێر ئەو هەلومەرجەدا هەندێ جۆری باش بەرەو ئەوە

دەچن بمێننــەوە لەکاتێکدا ناباشــەکان لـەناو دەچـن، لەمـەیش رەگـەزێکی نـوێ بەرهەم دێ. دواجار، بیردۆزێکم وەرگرت کە دەکرێ بەگوێرەی کار بکەم.

بەهەمان ئاراستە والاس دەنووسێ:

"وتار" یەکەم کتێب بوو تا ئەوکاتە خوێندبێتمەوە کـە باسـی هـەر کێشـەیەك لـە زیدەوەرزانیی فەلسەفی دەکات. بنەما سەرەکیەکانی وەك زانیاریەکی درێژخایـەن و بۆ ماوەی بیست ساڵ لە مێشکمدا مانـەوە. چارەسـەرێکی لـەبارەی هۆکـارێکی بـەهێز لـە پەیـدابوونی توخمــە ئەندامیـەکان پــێ بەخشـیم کـە زۆر بەشـوێنیدا گەڕابووم.

کاتێ چاپی ساڵی ١٧٩٨ی کتێبەکە دەرچوو، نـارەزایی تـوورەی پیـاوانی ئـاینی و یاخیبە کۆمەڵایەتیەکانی بەدوای خۆیدا هێنا. بەڵام ماڵتۆس گوێی بە هەموو ئەوانە نەدا، بگرە بە بابەتەکەی خـۆی سەرسـام بـوو و عـەزمی جـەزم کـرد تـا ئەوپـەڕی لەگەڵی بڕوات. بۆ بەهێزکردنی بەڵگەکانیشی و بەدوای مادەیەکدا بـۆ کتێبەکـەی، ساڵی ١٧٩٩ گەشتێکی بە ئەورووپادا کرد. سەردانی هەریـەك لـە سـوید و نـەرویج و فینلەندە و بەشێك لە رووسیای کرد، ئەوانەیش هەموو ئەو دەوڵەتانە بوون کە لەو سـەروەختەدا لەبـەردەم گەشـتیارانی ئینگلیـزدا کـراوە بـوون. پاشـان لـەو مـاوە کەمەی ئاشتی کە ساڵی ١٨٠٢ هەبوو گەشـتێکی بـە فـەرەنسـا و سویسـرادا کـرد و لەو ماوەیەدا نامیلکەیـەکی بەناونیشـانی "لێکۆڵینـەوە لـە هۆکـانی بەرزبوونـەوەی نرخی مادە خۆراکیەکان لەم کاتەدا" بڵاو کردەوە. بۆچوونەکەی بەو شێوەیە بـوو کە نرخ و قازانج وەك بنەما بەگوێرەی ئەوەی ناوی نابوو "خواستی بەکار" (الگلب الفعال) مەزەندە دەکرێن.

پێنج ساڵ دوای دەرکەوتنی چاپی یەکەمی "وتار" چاپێکی دووەمی زۆر گەورە لە چاپخانە دەرچوو، کە لە جەڵـدێکی ٦١٠ لاپـەڕەیی پێکـدەهات. ئەمـەیان جـۆش و خرۆش و شێوازە سەرنجڕاکێش و سووربوونە گەنجانەکەی چاپی یەکەمی نـەبوو و

شـێوەی نامەیـەکی توێژینـەوەی ئـابووریی بـارگران بـە بەڵگەنامـە و پـەراوێزی وەرگرتبوو، ئەگەرچی جگە لە پەرەدان بە بیرۆکەی "خەفەکردنی ئەخلاقی" بنەما بنچینەییەکانی نەگۆڕابوون. لە ژیانی دانەردا کتێبەکە چوار جار چاپ کرا.

جگە لە "وتار"، بەهۆی سەرقاڵبوونی بە پاڵفتەکردنی ئەم کتێبەوە، تاکە دانـراوی گەورە کە ماڵتۆس دایناب کتێبێکە بەناونیشانی "بنەماکانی ئابووریی سیاسی لـە روانگەی جێبەجێکردنیانەوە" و ساڵی ١٨٢٠ بڵاو بووەتەوە.

ژیانی شەخسیی ماڵتۆس تا رادەیەك هێمن و ئارام بوو، لە ئەنجامـدانی توێژینـەوە ئابووری و نووسینەکانیدا ئازاد بوو، لەگەڵ کەمێك بەرپرسیاریتر تـا ئەوکاتـەی لـە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا ژنی هێنا. سـاڵی پـاش ئـەوە وەك مامۆسـتای مێـژووی نـوێ و ئـابووریی سیاسـی لـە کۆلێـژە نوێیەکـەی کۆمپانیـای هینـدی رۆژهـەڵات لـە شـاری هـەیلیبوری Hailybury دامـەزرا، تـا زانیـاریی گشـتی فێـری فەرمانبـەرە مەدەنییەکانی ئەو کۆمپانیایە بکات. ئەوە کۆنترین کورسیی ئابووریی سیاسـی بـوو کە لە کۆلێژ یان زانکۆیەکی ئینگلیزیدا دابمەزرێ. ماڵتۆس بۆ ماوەی سی سـاڵ لـە هەیلیبوری مایەوە تا لە ساڵی ١٨٣٤دا مرد، سێ منـداڵی خسـتەوە، کـە کوڕێـك و کچێکیان گەیشتنە تەمەنی پێگەیشتن.

پشـکۆی ئـەو ئـاگرەی مـاڵتۆس هەڵیگیرسـاند خـامۆش نـەبوو، مشـتومڕی نێـوان لایەنگران و نەیاران بەوپەڕی توندی مایەوە، ناونیشانی نوێ دەرکەوتن کە لایـەنی تیۆرەکەی ماڵتۆسیان دەگرت، لەوانە: "خەبات لەپێناو ئایندەی مرۆڤدا" و "رێگە بەرەو مانەوە" و "سـنوورەکانی زەوی" و "هەسـارە زەوتکراوەکـەمان"، ئـەویش لەنێو هەندێ وتاردا بەناونیشانەکانی "خەیاڵی وتارە ماڵتۆسیەکە" و "بەئەشتیاوە بخۆ" و "شـەڕی ماڵتۆسـی" و "مرۆڤایـەتی برسـی نـابێ". ئـەی بۆچـوونی نـوێی ئەمڕۆ کە لەسەر تیۆرەکانی ماڵتۆس بنیات مراوە چییە؟!

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە فاکتەرێك لە کێشەی تەقینەوەی دانیشتواندا پەیدا بوو، ئەویش ئەوە بوو خەڵك بەزۆری روویان لە شێوازەکانی رێگرتن لە سکپڕی دەکرد کە بەهۆیەوە بەشێوەیەکی سیستماتیك سنوور بۆ ژمارەی ئەندامانی خێزانەکان دانرا، دیارە جگە لەو خێزانانەی ناهۆشیار بوون یان وەسوەسەی دینییان رێگر بوو لەوە.

بزاڤێك بەناوی جیاوازەوە سەری هەڵدا، لەوانە: "مالتۆسیزمی نوێ" و "سنووردارکردنی وەچە" و "دایکایەتیی پلانرێژ" و بەگشتی ناوی "گەورەترین بزاڤ بۆ سەرژمێرکردنی گەلان لە جیهانی نوێدا"ی لێنرا. بەڵام مالتۆس خۆی رقی لە بیرۆکەی رێگرتن لە سکپڕی بوو و بەشتێکی قۆڕی دادەنا و لە سەردەمی ئەودا بە شتێکی "خراپ و نامۆ و ناسروشتی" دادەنرا. لەگەڵ ئەوەیشدا بوو بە یەکێك لە رێگە سەرەکییەکانی راگرتنی هەڵاوسانی دانیشتوان لە کۆمەڵگەی نوێدا. بەوەیش مالتۆس فاکتەرێکی چوارەمی بۆ سیانە تایبەتەکەی: واتە بێڕەوشتی و نەهامەتی و چەپاندنی ئەخلاق، زیاد کرد.

لە ساڵی ١٨٠٠ کاتێك مالتۆس کتێبەکەی دەنووسی، ژمارەی دانیشتوانی جیهان بە ملیارێك کەس مەزەندە کرا. لە سەد و پەنجا ساڵی پاشتردا ژمارەکە گەیشتە دوو ملیار و نیو (ئێستا لە ساڵی ٢٠١٥ ژمارەی دانیشتوانی جیهان زیاتر لە شەش ملیار کەسە–وەرگێڕ). ئەوەیش رێژەیەکی بەرزی گەشەی دانیشتوانە کە زیاتر بەرهەمی درێژیی تەمەنە تا ئەوەی زادەی هەر دیاردەیەك بێ لە بەرزبوونەوەی رێژەی لەدایکبوون، چونکە لە نەتەوە پێشکەوتووەکانی دنیادا بەهۆی پێشکەوتنە تەندروستی و کۆمەڵایەتیەکانەوە ژیانی زۆر کەس رزگار کراوە، شۆڕشی پیشەسازیش لە ئینگلتەرا بەرهەمهێنانی کاڵا پیشەسازیەکانی بە رادەیەکی زۆر زیاد کرد، هەموو هۆکانی گواستنەوە باش بوون و خێراتر بوون، بەوەیش لە رێی کۆچکردنەوە زیادەی دانیشتوان گوێزرایەوە بۆ کیشوەرە تازە پەیدابووەکان و

پێشبینییە درێوەکانی مالتۆس سەبارەت بە جیهانی خۆرئاوا دواکەوت، یان لانیکەم بۆ هەتاهەتایە دوا کەوت.

لەگەڵ ئەوەیشدا، رووبەرێکی بەرفراوانی گۆی زەوی بەتەواوی تیۆرەکانی مالتوس بەرجەستە دەکەن.. رۆژهەلاتی نزیك و زۆربەی قارەی ئاسیا و دەولەتانی ئەمەریکای ناوەڕاست و ئەمەریکای باشور ئاستێکی بەرزی بەپیتیی سێکسییان هەیە، لەبەرانبەر رێژەیەکی بەرزی مردن. ئەو رۆحانەی پزیشك و ئامرازە تەندروستیەکان لەو رووبەرانەدا رزگاریان دەکەن، هەژاری و برسێتی مەترسیی لەناوچوونیان رووبەڕوو دەکاتەوە.

بەپێچەوانەی ئەم هەلوێستە، هەندێ لە گەلانی زۆر پێشکەوتوو و شارستانی سەر زەوی، پێیان ناوەتە سەردەمێك لە سەقامگیری یان کەمکردنی ژمارەی دانیشتوان، گرنگترینیان فەرەنسا و ئایسلەندە و ئوسترالیا و ئینگلتەرا و وێلز و ئێرلەندەن. ئەم سەقامگیرییە بەرهەمی دابەزینی پلەی بەپیتیی سێکسی و کەمبوونەوەی ژمارەی لاوان و درێژبوونی تەمەن بووە.

لە سەردەمی مالتۆسەوە خواردن بە رێژەیەکی زۆر زیادی کردووە. دەولەتان کۆکن لەسەر ئەوەی لە ئایندەدات لەتواناادا دەبێ لەرێی گرتنەبەری رێگەی بەکارتری بەرهەمهێنانەوە، زیاتریش بکرێ، وەك ئاودێری و چاککردنی زەویی بەوار و بەکارهێنانی خواردنی رووەکی لەباتیی خواردنی ئاژەلی، هەروەها بە بەرەنگاریکردنێکی باشتری ئافاتەکانی کشتوکال. دەکرێ زیادە بەرهەمی هەریەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا بەلگەیەك بێ لەسەر هەلەیەك لە بنەماکەی مالتۆسدا، بەلام سەرەرای ئەوەی خۆراکێکی بێئەندازە بەرهەم دێنین، دەبینین ملیۆنان مرۆڤ لە رۆژهەلاتی و ناوچەیتر بەهۆی برسێتیەوە لە لێواری مەرگدان یان لە ئاستی قوتی زەروریدان. ئەوەی کە سێ-یەکی دانیشتوانی جیهان بەدەست بەدخۆراکی و قاتوقری و خراپیی باری تەندروستی و نەخۆشیەوە دەنالێنن،

بەڵگەی ئەوەیە ئەو تیۆرەی مالتۆس بەر لە سەدە و نیوێك وروژاندی، ئەمڕۆیش وەك ئەوکات راست و زیندووە.

تەنانەت ئەو رەخنەگرانەیش کە دەڵێن تیۆرەکەی مالتۆس بەهۆی ئەو پەرەسەندنانەی روویانداوە و لە سەردەمی مالتۆسدا نەبوون و بەو هۆیەوە نەیتوانیوە پێشبینییان بکات، لە هەندێ لایەنی دیاریکراوەوە لاواز بووە، ئەوانیش هاوڕان لەسەر ئەوەی ئەنجامی گەورە لە بیرۆکەکانی کەوتوونەتەوە. وەك هۆبهاوس Hobhouse دەڵێ "تیۆرەکەی مالتۆس یەکێك بوو لەو فاکتەرانەی بووە مایەی شکستپێهێنانی ئەوەی پێشبینیی رووداني دەکرد. باوەڕبوون بەوەی ژمارەی دانیشتوان زۆر بەخێرایی زیاد دەکات، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاری بۆ راگرتنی ئەو زیادبوونە کرد".

لەو کۆمێنتەرە زۆرانەی قسەیان لەسەر "وتارێك لەبارەی بنەمای دانیشتوان"ی مالتۆس کردووە، کەس ستایشێکی دادپەروەرانەتر و بەرچاو روونترانەی وەك ئەوەی (جۆن مینارد کینیس)ی نەنووسیوە کە باوەڕی وابووە: "ئەو کتێبە شایستەی ئەوەیە شوێنی خۆی لەنێو ئەو کتێبانەدا هەبێ کە کاریگەرییەکی مەزنیان لە پێشکەوتنی فیکردا هەبووە. بەقووڵی رۆچووەتە نێو نەریتە ئینگلیزەکان بۆ زانستە مرۆییەکان –لە نەریتەکانی بیری ئوسکتلەندی و ئینگلیزی کە بەبڕوای من بەردەوامبوونێکی سەیری هەستکردنە لە سەدەی هەژدەیەمەوە تا ئێستا. ئەو ئەو نەریتانەی ناوەکانی وەك لوك Locke و هیوم Hume و ئادەم سمیپ و پالی Paley و بێنتام Bentham و داروین و میل Mill پێشنیاریان کردووە. نەریتگەلێك کە بە خۆشویستنی حەقیقەت و سەلامەتیەکی ئاسایی و خاڵی لە هەر سۆز یاخود میتافیزیکایەك و هەروەها بە چێژنەبینینی مەزن و گیانی میللی ناسراوە. ئەو دەستەواژانە بەردەوامییان تێدایە، نەك هەر لەبارەی شعورەوە، بەڵکو لەبارەی مادەی واقیعیشەوە. مالتۆس سەر بەم رەوتەیە".

## ٥- "یاخیبوونی مەدەنی"
## هێنری دەیڤید تۆرو Henry David Thoreau
### سەرپێچیکردنی یاسای ستەمکارانە

ناوی هێنری دەیڤید تۆرۆ وێنەی کەسێکی بەوردی سەرنجدەر لە سروشت، شەیدای گۆشەگیری و ژیانی چۆڵەوانی و نموونەی ژیانی سادە و شاعیرێکی سۆفی و مامۆستایەکی شێوازی پەخشانی ئینگلیزی، لە خەیاڵدا دەکێشێ.

زۆر جار خەڵك تۆرۆ وەك دانەری یەکێك لە پەرگیرترین راپۆرتەکان لە مێژووی ئەمەریکیدا یاد دەکەنەوە، هەروەها وەك پارێزەرێك، بەگوتەی یەکێك لە ژیاننامەنووسانی، خاوەن "گەورەترین رێبازی ئاشکرای بەرەنگاریکردنە، کە پێشتر لەم کیشوەرە دەرکەوتووە". پتر لە تۆماس جافرسۆنیش رۆیشت کە گوتبووی "حکومەتی باش ئەوەیە تا دەکرێ کەمتر حوکم بکات. بەڵام تۆرۆ بەو دەرەنجامە گەیشت کە "حکومەتی باش ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك حوکم ناکات".

ئەم گوتانە پێشەکی وتارە بەناوبانگەکەی تۆرۆ بوون "یاخیبوونی مەدەنی" کە سەرەتا لە ئایاری ١٨٤٩، لە گۆڤارێکی دەوریی ناپوون و تەمەن کورتدا دەرکەوت، ئەویش گۆڤاری ئێلیزابێس پیبۆدی Elizabeth Pebody بوو بەناونیشانی "رۆژنامەکانی فەلسەفەی هونەرەکان". ناونیشانی ئەسڵی بریتی بوو لە "بەرەنگاریکردنی مەدەنیانەی حکومەت"، پاشان ئەم ناونیشانە گۆڕا بۆ "لەبارەی ئەرکی یاخیبوونی مەدەنی"، دوای ئەوە بوو تەنها بە "یاخیبوونی مەدەنی". کاتێك بۆ یەکەم جار بڵاو کرایەوە، زۆر نەبووە جێسەرنج و کەسانێکی

کەم خوێندیانەوە، بەڵام لە ماوەی سەد ساڵی دواتردا هەزاران کەس خوێندیانەوە و کاری لە ژیانی ملیۆنان مرۆڤ کرد.

ئاخۆ تۆرۆ کەسێکی فەوزەوی و لە بیروباوەڕیدا فەلسەفی بوو؟ بە شیکردنەوەی وتارەکەی "یاخیبوونی مەدەنی"، بنچینە و رابردووی، دەگەینە وەڵامی ئەم پرسیارە ئاڵۆزە.

دەربارەی تۆرۆ خۆیشی، لە سەرەتای ژیانیدا هیچ شتێکی وا بەدیناکرێ کە بکرێ کەسێکی یاخیی کۆمەڵایەتی بەرهەم بێنێ. ئەو ساڵی ۱۸۱۷ لە باوك و دایکێك، کە یەکێکیان فەرەنسی و ئەویتریان ئوسکوتلەندی بووە لە شاری کۆنکۆرد لە ویلایەتی ماساچوستس لە دایك بووە. لە ژینگەیەکی موحافیزەکاری هەژار و باش پەروەردەکراودا گەورە بوو.. چوار ساڵی لە هارڤارد بەسەر برد کە هیچ شتێکی جیاوازی پێوە دیار نەبوو، ئەگەرچی شتێکی سەیری کرد کە دەشێ ئاماژە بێ بۆ خۆنەبەستنەوەی ئەو کەسە بە کەنیسەوە، ئەویش کاتێ پاڵتۆیەکی سەوزی لە کەنیسە لەبەر دەکرد "سیستم وابوو دەبوو پاڵتۆی رەش لەبەر بکات".

کاتێکی زۆری لە کتێبخانەی کۆلێژدا بەسەر دەبرد. لەرێی دوو لە مامۆستا باشەکانیەوە کە ئێدوارد ت. چانینگ و جۆن فێری بوون، چێژی بۆ خوێندنەوەی دەکرێتەوە. تۆرۆ بە گەڕانەوە بۆ کێڵگە سەوزەکان و دارستانەکەی کۆنکۆر بەختەوەر بوو و پاشتر بە هەندێ سەردانی کورت نەبێ بەجێی نەهێشتووە.

ژمارەیەك کاری جۆراوجۆری کرد. پاش ئەوەی بەنابەدڵی ماوەیەکی کەم لە قوتابخانەیەکی میللیدا وانەی دەوتەوە، ماوەی سێ ساڵ لە گەڵ جۆنی برای لە بەڕێوەبردنی قوتابخانەیەکی تایبەت بەخۆیان شەریك بوو. دوای ئەوە ناوبەناو لە کاری خێزانەکەی لە دروستکردنی قەڵەمی رەساسدا یارمەتیی باوکی دەدا. وەك فەرمانبەرێکی گشتی لە کۆمەڵگە و رووپێو لە شارۆچکەیەك و ناوبەناو موحازەرەدان کاری دەکرد و هەوڵیدا ببێتە دانەرێکی پرۆفیشناڵ.

تۆرۆ دوو ماوەی کورت لە ماڵی راڵف والدۆ ئێمرسۆن ژیاوە، ئاشنایی لەتەك ئەندامانی ئەو یانەیەدا پەیدا کردووە و چالاکانە بەشداری لە موناقەشەکانی ئەو تاقمە بەناوبانگە لە نووسەر و بیرمەندان لە ویلایەتی نیو ئینگلاند کردووە. ئیمرسۆن کاریگەرییی بەهێزی لەسەر گەشەکردنی بیر و هۆشی هەبوو و هەندێ لە بۆچوونەکانی نێو کتێبی "یاخیبوونی مەدەنی" لەوێوە سەرچاوەیان گرتووە.

تۆرۆ بەهیچ شێوەیەك چاوی لە کۆکردنەوەی سامان یان کردنی هەر کارێك زیاتر لەوەی پێویستییە بنچینەییەکانی بۆ دەستەبەر بکات، نەبووە. مەراقی ئەوە بوو کاتی بەتاڵی دەست بکەوێ بۆ ئەو شتانەی بەلای ئەوە بایەخی بنچینەییان هەیە، لەوانە گەڕان بەنێو کێڵگەکانی کۆنکۆرد و وردبوونەوە لە سروشت و بیرکردنەوە و خوێندنەوە و نووسین و کردنی ئەو شتانەی حەزی لێیانە. دەیتوانی بەبێ ئەوەی پەنا بۆ کاری قورس ببات -وەك ئەوەی دەیبینی هاوسێکانی دەیکەن- پێویستییە سادەکانی دەستەبەر بکات. هەربۆیە بەپێچەوانەی ئەو ئایەتەی تەورات کە دەڵێ "شەش رۆژ ئیشکردن و رۆژی حەوتەم بۆ پشوودان"، تۆرۆ وای پێ باش بوو رێژەکە پێچەوانە بکاتەوە و تەنها رۆژی حەوتەمی بۆ ئیشکردن تەرخان دەکرد. بەکورتی، بەپێچەوانەی رێنماییەکانی ئادەم سمیپ و ئەو حوکمەی فرانکلین لە کتێبی "ریچاردی هەژار" باسی کردووە و ئەو پەندە ئەمەریکییە تەقلیدیانەی هانی مرۆڤ دەدەن بۆ کاری قورس و دەوڵەمەندبوونی خێرا، جولاوەتەوە.

بۆ بەرجەستەکردنی بیرۆکەکەی لەبارەی ژیانی سادە و خاڵی لە هەموو شتە رووکەشەکان، تۆرۆ دوو ساڵی لە والدین پۆند لە نزیك کۆنکۆرد بەسەر برد، کوخێکی دروست کرد و بەچاندنی فول و پەتاتەوە خەریك بوو و سادەترین خواردنی دەخوارد (گرنگترینیان برنج و ئاردی گەنم و پەتاتە و هەنگوینی رەش بوون). بەتەنیا و دوور لە کۆمەڵگە دەژیا.

ئەوە ماوەی بیرکردنەوە و تۆمارکردنی بیرۆکەکانی بوو. توانی یەکێك لە مەزنترین کتێبەکان لە ئەدەبی ئەمەریکیدا بەرهەم بێنێ، ئەویش کتێبی "دارستان" Walden یان "ژیان لە دارستانەکان" بوو لە ساڵی ١٨٥٤.

بەشانازیەوە، کتێبی "دارستان" تۆماری ژیانی تۆرۆ بوو لە ژیانی لادیدا و تەژی بوو لە وەسفی یادەوەریانەی وەرزەکان و دیمەنە سروشتیەکان و ژیانی ئاژەڵ لە دەورووبەری. بەڵام "دارستان" تەنیا کۆمەڵێ سەرنجی زانایەکی سروشتی نەبوو وەك چۆن کتێبی "راوچیی ماسیی تەواو"ی ئیسحاق والتۆن تەنیا نامیلکەیەك نەبوو لەبارەی راوکردنی ماسی، بەڵکو قسە لەسەر شتە روکەشەکان و سنوورەکانی کۆمەڵگە و حکومەت دەکات، هەربۆیە گرنگیەکی جیهانی پەیدا کرد. بەتێپەڕینی ساڵان، رەخنەی کۆمەڵایەتی، هاوشێوەی ئەو بەشانەی باسیان لە مێژووی سروشتی دەکرد، خوێنەرێکی زۆریان کێش کرد. ئەو کتێبە بەڵگەنامەیەکی پەرگیرە، وەك کتێبی "یاخیبوونی مەدەنی" کە بەر لەو بڵاو کراوەتەوە و زۆر لەیەك دەچن.

لەوکاتەی تۆرۆ ساڵی ١٨٤٢ پاش نیشتەجێبوونی لە پۆند سەردانی کۆنکۆردی دەکرد، بەهۆی باجنەدانەوە دەستگیر و بەند کرا. ئەو لە باجنەداندا رێچکەی برۆنسۆن ئالکۆت باوکی "خانمە بچوکەکان"ی دەگرتە بەر کە دوو ساڵ پێشتر بەهەمان تۆمەت دەستگیر کرا. هەردووکیان بۆ دەربڕینی نارەزایی لە پشتگیرکردنی حکومەت لە بازرگانیی کۆیلە ئەو ئامرازانەیان بەکار دەهێنا. تۆرۆ تەنیا بۆ ماوەی شەوێك بەند کرا، پوری هات و –ئەگەرچی ئەو رازیش نەبوو بەوە– باجەکەی لەباتیی ئەودا.

تۆرۆ لە وتاری "یاخیبوونی مەدەنی"یەکەیدا باسی ئەو کێشمەکێشەی لەتەك حکومەت بەهۆی باجنەدانیەوە نەکرد، پاش چەند ساڵێك نەبێ. خۆی ئەو وتارە لە بنەڕەتدا ساڵی ١٨٤٨ وەك موحازەرەیەك نووسراوە و ساڵی دوای ئەوە بە

چاپکراوی دەرچوو. ساڵی ١٨٤٦-١٨٤٧ ماوەیەکی کورت بوو جەنگی مەکسیکی تەواو بووبوو کە بازرگانیکردن بەکۆیلە یەکێك لە ئەنجامەکانی بوو. هەروەها یاسای کۆیلە هەڵاتووەکان کە تۆرۆی بەشێوەیەکی تایبەت تووڕە کردبوو لە دەرچووندا بوو. ئەمە جگە لە شەڕی باجی سەر (سەرانە)، کە ئەویش بزوێنەرێك بوو بۆ نووسینی "یاخیبوونی مەدەنی".

هەموو جەنگێك بەلای بەهاکانی تۆرۆوە دزێو بوو ئیتر چ جای جەنگی مەکسیکی کە زۆر رقی لێی بوو، چونکە بەبڕوای ئەو تاکە ئامانجی دابینکردنی کۆیلەی زنجی بوو بۆ بازرگانیی کۆیلە بۆ ناوچەی نوێ، کە زۆر رقی لەو بازرگانییە بوو. تۆرۆ دەپرسی: بۆچی دەبێ کۆمەکیی ماڵی حکومەتێك بکەین کە بەم ستەم و گەمژەییانە تاوانبارە؟ لێرەوە رێبازەکەی لەبارەی یاخیبوونی مەدەنی لەدایك بوو. تۆرۆ کە بە قەلب و قاڵب سیاسی بوو، بڕیاریدا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە سروشتی دەوڵەت و حکومەتەکەی تاقی بکرێتەوە. دەبێ پەیوەندیی تاك بە حکومەت و حکومەت بەتاکەوە دەبێ چۆن بێ؟ لەم روانگەوە فەلسەفەکەی تۆرۆ، بە وەفا شەخسیەکەی و پێگە ئینسانیەکەی لە کۆمەڵگەدا، سەری هەڵدا.

تۆرۆ نووسی: "حکومەت لە باشترین وێنەیدا تەنیا ئامرازێکە، بەڵام زۆربەی حکومەتەکان هەندێ جار ئامراز نین. ئەو بەرهەڵستیانەی دژی سوپای ئێستا کراون کە زۆر و بەبایەخن، شایانی ئەوەن دژ بە حکومەتی ئێستایش روو بدەن".

تۆرۆ رایگەیاند حکومەتی ئەمەریکی تا رادەیەك باش بووە. بەڵام ئەم حکومەتە لەخۆیەوە هیچ پرۆژەیەکی جێبەجێ نەکردووە، بەڵام بۆ لادانی ئەو پرۆژەیە لەبەردەمی چالاك و خێرایە. حکومەت پارێزگاری لە ئازادیی دەوڵەت نەکردووە، پرسی خۆرئاوای چارەسەر نەکرد و فێرکردنی بڵاو نەکردەوە. ئەوە ئاکاری جوانی گەلی ئەمەریکییە کە هەموو ئەو پرۆژانەی ئەنجام داوە کە کراون و ئەگەر حکومەت هەندێ جار خۆی هەڵنەقورتاندایە دەیتوانی زیاتریش بکات..

تۆرۆ پاش ئەوەی بابەتی "ئەوەی حکومەت نەبێ"ی تا رادەیەك راستەوخۆ خستە روو، دەرکی بەوە کرد مرۆڤ هێشتا نەگەیشتۆتە پلەی کەماڵ کە بکرێ حکومەت بەهیچ شێوەیەك نەبێ، بۆیە دەستی دایە گۆڕینی بۆچوونی خۆی و گوتی: بۆ ئەوەی لە رووی کردارییەوە قسە بکەم، من وەك هاوڵاتییەك، بەپێچەوانەی ئەوانەی خۆیان ناودەنێن پیاوانی "ناحکومەتی"، داوا ناکەم ئێستا حکومەت نەبێ، بەڵکو ئێستا داوای حکومەتێکی باشتر دەکەم. پێویستە هەر کەسێك جۆری ئەو حکومەتە روون بکاتەوە کە بەلایەوە جێی رێزە، ئەوەیش هەنگاوێك دەبێ بۆ پێشەوە بەرەو بەدەستهێنانی.

تۆرۆ جەختی لە مافی کەمینەکان لە حوکمکردن دەکرد و لەبارەی هەڵەبوونی حوکمی زۆرینەوە دەڵێ "زۆرینە حوکم دەکات نەك لەبەرئەوەی رێی تێدەچێ ئەو لەسەر هەق بێ، نەك لەبەرئەوەیش کە ئەوە بۆ کەمینە بەئینسافانەترە، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو لە رووی سروشتییەوە بەهێزترە، بەڵام ئەو حکومەتەی لە هەموو شتێکدا زۆرینە حوکمی دەکەن، ناکرێ حوکمکردنەکەی لەسەر بنەمای دادپەروەری بێ، تەنانەت ئەگەر لەسەر ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤیش بێ". ئەو باوەڕێکی بەهێزی بەوە هەبوو هاوڵاتی بۆ یاسادانەر دەست لە ویژدانی خۆی هەڵناگرێ... پێویستە سەرەتا پیاو بن پاشان رەعیەت. هیچ پێویست نیە بەو شێوەیەی گەشە بە رێزگرتنی هەق دەدەین، گەشە بە رێزگرتنی یاسا بدەین.

تۆرۆ بەچاوی سووك تەماشای چینی سیاسییەکان دەکات و دەڵێ "زۆربەی یاسادانەر و سیاسی و پارێزەر و وەزیر و فەرمانبەرانی دەوڵەت بە سەریان خزمەتی دەوڵەت دەکەن. لەو رووەیشەوە مەگەر بەکەمی ئەگینا هیچ جیاوازییەکی ئەخلاقی لەخۆیان پیشان نادەن، ئەوا بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن بەلای خزمەتکردنی شەیتاندا دادەشکێن. کەمێکی کەم وەك پاڵەوانەکان و ئەوانەی بۆ نیشتمان پەرۆشن و شەهید و ریفۆرمخوازان و پیاوان بە ویژدانیشیان خزمەتی

دەوڵەت دەکەن، بۆیە گرنگە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەرەنگاریی حکومەت بکەن، لەبەرئەوە حکومەت بەگشتی وەك دوژمن مامەڵەیان لەتەك دەکات.

دوای ئەوە تۆرۆ دەست دەکات بە هێرشکردنە سەر حکومەتی ئەمەریکی ئەو سەردەمە و دەڵێ: "ناتوانم بۆ یەك ساتیش دان بەوەدا بنێم ئەو دامەزراوە سیاسییە حکومەتی منە، کە حکومەتی کۆیلەکانیشە". ئەرکی هاوڵاتییە بەرەنگاریی خراپە لە حکومەتدا بکات تا رادەی یاخیبوونی ئاشکرا و بەئەنقەست لە یاساکانی.

ئەگەر نەتەوەیەك بەڵێنیدا ببێتە پەناگەی ئازادی و شەشیەکی دانیشتوانەکەی کۆیلە بوون.. ئەوە بزانە کاتی ئەوەیە کەسە بەڕێزەکانی ئەو گەلە یاخی ببن و شۆڕش بکەن.. پێویستە ئەوانە دەست لە بوونی کۆیلە و پەلاماردانی مەکسیك هەڵبگرن، با ئەوە ببێتە سەرەخۆرەیشیان وەك مرۆڤ.

تۆرۆ شیوەن بۆ ئەو هاوڵاتییە دەکات کە گومانی وایە تەنها بە دەنگدان ئیتر بە تەواوی ئەرکی سەرشانی هەستاوە.

هەموو دەنگدانێك وەك دامە و تاوڵە جۆرە قورمارکردنێکە، لەگەڵ خستنەسەری مەسحەیەکی ئەخلاقیی سادە.. ئەوە یاریکردنە بە هەق و ناهەق، بە پرسە ئەخلاقیەکان و بەو گرەوەی بەتەبیعەتی حاڵ یاوەریەتی. دەنگی دەنگدەران لە مەترسیدا نیە.. تەنانەت دەنگدان لەسەر هەق هیچ لەپێناو هەقدا ناکات، بەڵکو تەنیا ویستی تۆ بۆ باڵادەستیی هەق بۆ خەڵك دەردەبڕێ... تەنیا چاکیەکی کەم لە کاری ئاپۆرای بەشەردا هەیە.

تۆرۆ باسی ئەو رێگە دروستە دەکات کە پێویستە هاوڵاتی بەرانبەر یاسا ستەمکارانەکان بیگرێتە بەر. ئایا واباشترە چاوەڕوان بکات تا زۆرینە کار بۆ گۆڕینی یاساکان دەکەن، یان دەبێ دەستبەجێ سەرپێچییان بکات،؟ وەڵامی یەکلای تۆرۆ ئەوە بوو: "ئەگەر حکومەت ویستی داردەستی بێت بۆ ستەمکردن لە

کەسێکیتر، ئەوکاتە پێت دەڵێم: یاسا بشکێنە.. خۆم ناسپێرم بەو ستەمەی رقم لێیەتی و دژایەتی دەکەم.

تۆرۆ گوتی، لە تایبەتمەندیی حکومەتە کە بەرەنگاریی هەموو گۆڕان و هەموو چاکسازیەك بکات و بەخراپی لەگەڵ ئەوانەی رەخنەی دەکەن مامەڵە بکات. دەپرسێ: "بۆچی هەمیشە مەسیح لەخاچ دەدات و کۆپەرنیکۆس و لۆسەر بێوەری دەکات و واشنتۆن و فرانکلین بە یاخیبوون وەسف دەکات؟".

تۆرۆ دەڵێ پێویستە ئەوانەی بەرەنگاریی بازرگانیی کۆیلە دەکەن "دەستبەجێ هەر ئێستا پاڵپشتیی شەخسی و مادییان لە حکومەتی ماساشوزتس بکێشنەوە و چاوەڕوان نەکەن تا دەبنە زۆرینەی هەرەزۆر بەر لەوەی ببینن بەهۆی ئەوانەوە هەق بالادەست بووە. پێم وایە ئەوەندە بەسە خوایان لەگەڵ بێت و چاوەڕوانی ئەو زۆرینەیە نەکەن. زیاد لەوەیش، هەر پیاوێك لە هاوسێکەی زیاتر لەسەر چەسپاندنی هەق سوور بێ، ئەوە خۆی لەخۆیدا زۆرینەیە".

وەك دروشمێکی یاخیبوونی مەدەنی کە ڕێگەیەکی کراوەیە لەبەردەم هەموو هاوڵاتیەکدا، تۆرۆ باوەڕێ وایە دەبێ هاوڵاتی رازی نەبێ باج بدات، ئەگەر هەزار کەس یان کەمتر بەو ڕێگەیە بێزارییان لە حکومەت دەربڕی، ئەوا بە بۆچوونی تۆرۆ چاکسازی بەدوای ئەوەدا دێ. تەنانەت ئەگەر بەرەنگاریکردنی دەسەڵاتداران سزادانیش بگەیەنێ ئەوا "لە سایەی ئەو حکومەتەی کەسێك بە ستەم بەند دەکات، جێگەی راستەقینەی مرۆڤی دادپەروەریش بەندیخانەیە.. ئەگەر حکومەت سەرپشك بکرێ لەنێوان هەڵبژاردنی بەندکرنی هەموو دادپەروەران، یاخود وازهێنان لە جەنگ و بازرگانیکردن بە کۆیلە، ئەوا لە هەڵبژاردندا دوودڵ نابێ.. ئەگەر هاوڵاتی باجی بە حکومەتێکی نادادپەروەردا، بەوکارەی چاوپۆشی لەو ستەمانە دەکات کە حکومەت ئەنجامیان دەدات.

سەریاری ئەمە، تۆرۆ پێی وایە موڵکداران سەرکێشیەکی گەورە دەکەن ئەگەر یاخی بن، لەبەرئەوەی "پیاوی دەوڵەمەند –بەبێ بەراوردکردنێك کە ببێتە مایەی توورەکردن– هەمیشە بەو دامەزراوەیە دەفرۆشرێ کە ئەوی دەوڵەمەند کردووە. بەدەربڕینێکی چڕتر، تا پارە (سامان) زیاتر بێ فەزیلەت کەم دەکات، چونکە پارە هەمیشە لەنێوان مرۆڤ و ئامانجەکانیدا دەوەستێ و بەدییان دێنێ بۆی".

تۆرۆ لەبەرئەوەی دەوڵەمەند نەبوو، دەیتوانی بەرەنگاری بکات "یاخیبوونم لە حکومەت، بەهەموو مانایەك، کەمتر لەسەرم دەکەوێ لە گوێڕایەڵیکردنی. هەست دەکەم لەم حاڵەتەی دواییدا یەکسانم بە کەمتر".

تۆرۆ هەروەها کەسێکی واقیعی بوو لە بینینی بەهای ئەو بەرهەڵستییە ئابووریانەی رێگر بوون لەوەی حکومەتەکەی ماساشوزتس کارێك دژی بازرگانیی کۆیلە بکات.

ئەگەر لەلایەنی پراکیتیکەوە قسە بکەین، دەبینین نەیارانی چاکسازی لە ماساشوزتس سەد هەزار سیاسی نین لە باشور، بەڵکو سەد هەزار بازرگان و کشتیارن لێرە، زیاتر لە بایەخدانیان بە مرۆڤایەتی بایەخ بە بازرگانی و کشتوکاڵ دەدەن. ئامادەیش نین لەتەنیشت قەدەغەکردنی بازرگانیی کۆیلە و بەرهەڵستیکردنی جەنگ دژی مەکسیك بوەستەوە "ئیتر هەرچی رووبدات".

تۆرۆ بۆ ماوەی شەش ساڵ دەستی بە پرنسیپەکانیەوە گرت و بڕیاریدا هیچ سەرانەیەك نەدات. ئەو ماوە کورتەیش کە زیندانی کرا وای لێنەکرد دەست لە تۆمەتبارکردنی حکومەت هەڵبگرێ، بگرە وای لێ کرد گوێ بە زیندان نەدات.

بینیم حکومەت نیوە زیرەکە، ترسنۆکە وەك ئافرەتێك کە بە کەوچکە زیوینەکانیەوە بەتەنیا بەجێ هێڵرابێ. دۆست و دوژمنی لێك جیا ناکاتەوە، لەبەرئەوە هیچ رێزێکی لام نەماوە. بەم شێوەیە حکومەت بەئەنقەست رووبەڕووی هەستە زەینی یان ئەخلاقیەکانی مرۆڤ نابێتەوە، بەڵکو تەنها رووبەڕووی جەستەی

دەبێتەوە نەك هەستەكانی. حكومەت پڕچەك نیە نە بە زیرەكیەكی زۆر و نە بەئەمانەت. بەڵكو تەنیا بە هێزێكی جەستەیی گەورە پڕچەكە. بۆ ئەوە لەدایك نەبووم تا ناچار بكرێم. بەو شێوەیە هەناسە دەدەم كە پێم خۆشە.

تۆرۆ جیاوازی لەنێوان جۆری باجەكاندا دەكرد "هەرگیز لە دانی باجی رێگە، باجی قوتابخانەكان دووا نەكەوتووم، لەبەرئەوەی حەز دەكەم بەئەندازەی ئەوەی رەعیەتێكی خراپم، دراوسێیەكی باش بم". ئەو پێی وابوو دانی باجی گشتی پاڵپشتیكردنە لە بازرگانیی كۆیلە و جەنگ "بەسادەیی، دەمەوێ (لەم شتانەدا) هاوپەیمانیكردن لەتەك حكومەت رەت بكەمەوە و بكشێمەوە و بەشێوەیەكی كاریگەر خۆمی لێ دوور بگرم".

تۆرۆ حەزی نەدەكرد وەك شەهید یان قدیسێك بوەستێ، بەڵكو دەڵێ "حەز ناكەم بەگژ هەر كەس یان نەتەوەیەكدا بچمەوە، نامەوێ جیاكاری لەنێوان كەسێك و كەسێكیتردا بكەم یان خۆم بە باشتر لە هاوسێكەم دابنێم، بەڵكو بۆ عوزرێك دەگەڕێم وا بكات شانبەشانی یاساكانی وڵات بڕۆم. من تەواو ئامادەم بەپێی ئەو یاسایانە بڕۆم. لەڕاستیدا هۆیەكم هەیە بۆ گومانكردن لە خۆم لەم بابەتەدا. هەموو ساڵێك، كاتێك وەختی كۆكردنەوەی باج دێ، هەست دەكەم ئامادەم بۆ خستنەڕووی یاساكان و هەڵوێستی حكومەتی گشتی و حكومەتی ویلایەت و گیانی گەل، تا بەڵگەیەك بۆ شانبەشانچوونی یاساكان بدۆزمەوە".

زیاد لەوەیش، تۆرۆ دانی بەوەدا دەنا كە سەرەڕای دابەزینی یاساكان لە ئاستە نموونەییەكە، ئەوا "دەستوور، بەهەموو هەڵەكانیشیەوە، زۆر باشە و یاسا و دادگەكان حورمەتیان هەیە. تەنانەت حكومەتی ئەم ویلایەتە و حكومەتی ئەمەریكی لە زۆر رووەوە نایاب و دەگمەنن بەڕادەیەك ئێمە سوپاسگوزارییان قەرزارین".

سەرەڕای رەخنەگرتنیشی لە رێسای زۆرینە، ئەو هەندێ باوەڕیشی بە حوکمی گەل هەیە. بە بڕوای ئەو یاسادانان توانای ئەوەی نیە سەرکەوتووانە چارەسەری "بابەتە تا رادەیەك سادەکانی باج و دارایی و بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵ بکات. ئەگەر هەموو خۆمان بەتەواوی ببەستینەوە بە قسەکانی یاسادانەران لە کۆنگرێس تا رابەرایەتیمان بکەن بەبێ ئەوەی ئەزموونە وەرزیەکان یان سکاڵا کاریگەرەکانی گەل راستیان بکاتەوە، ئەوا ئەمەریکا ناتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ پارێزگاری لە پێگەی خۆی لەنێو گەلاندا بکات".

تۆرۆ وتارەکەی "یاخیبوونی مەدەنی" بە خستنەڕووی بۆچوونی خۆی سەبارەت بە حکومەتی تەواو (کامل) و پێداگرتنی لەسەر باوەڕی بە کەرامەت و بەهای تاك کۆتایی پێدێنێ. "بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکانی حکومەت پڕاوپڕ دادپەروەرانە بن... پێویستە رەزامەندی و پیرۆزبایی ژێردەستەکان بەدەست بێنێ. ناکرێ زیاتر لەو ئەندازەیەی خۆم پێی رازیم مافێکی رەهای بەسەر سەر و سامانمەوە هەبێ. پێشکەوتن لە پاشایەتیی رەهاوە بەرەو پاشایەتیی سنووردار و لە پاشایەتیی سنووردارەوە بەرەو دیموکراسی پێشکەوتنە بەرەو رێزگرتنێکی راستەقینەی تاك.. ئاخۆ دیموکراسی بەو شێوەی ئێمە دەیناسین دوایین باشبوونی رێتێچووی حکومەتە؟. ئایا ناکرێ هەنگاوێك بەرەو داننان بە مافەکانی مرۆڤ و رێکخستنی بنێین؟. دەسەڵاتێکی ئازاد و روناکی راستەقینە نایەتەکایە تا ئەنجومەنی پیران وەك هێزێکی سەربەخۆی باڵا دان بە تاکدا نەنێ و هەموو هێز و دەسەڵاتی خۆی لەوەوە وەربگرێ و لەسەر ئەو بنچینەیە مامەڵە لەتەك ئەو تاکەدا بکات. من چێژ لە بیرکردنەوە لە حکومەتێك دەبینم کە دەکرێ لەتەك هەموو خەڵك دادپەروەر بێ، هەروەها بەرێزەوە و وەك هاوسێیەك مامەڵە لەگەڵ تاك بکات وەك ئەوەی بەگونجاوی نەزانێ بۆ ئاسوودەیی ئەو کە کەسانێکی کەم دوور لە حکومەت بژین و دەست نەخەنە کاروباری حکومەتەوە و ئەو حکومەتەی ئەرکی خۆی بەرانبەر

هاوسێ و هاڕێکان جێبەجێکردوە، لە ئامێزیان نەگرێ. ئەو حکومەتەی ئەم جۆرە بەروبومە بەرهەم دێنێ و رێگە دەدات هەر بە گەیینی بەربێتەوە، رێگە بۆ حکومەتێکی تەواوتر و شکۆدارتر خۆش دەکات. بیرم لەمەیش کردۆتەوە، بەڵام لە هیچکوێ نەمدیوە.

بەکورتی دژبەریی تۆرۆ بۆ حکومەت لەو کتێبەدا ئەوە بوو کە حکومەت بۆ تاکەکان بژی نەك تاکەکان لەپێناو حکومەتدا بژین. نابێ کەمینە ملکەچی زۆرینە بێ ئەگەر ئەو ملکەچییە پێویست بە دەستکاریکردنی بنەما ئەخلاقیەکان بکات. پاشان حکومەت مافی ئەوەی نیە ئازادیی ئەخلاقی ئەتك بکات بەوەی هاوڵاتییان ناچار بکات پاڵپشتی لە ستەمکاریەکان بکەن. پێویستە مرۆڤ هەمیشە ویژدانی خۆی رۆحی باڵا و رێنوێنی بێ.

دەکرێ کاریگەریی "یاخیبوونی مەدەنی" لە سەردەمی تۆرۆ خۆیدا فەرامۆش بکرێ، نووسەرانی سەردەمی خۆی لە نووسینەکانیاندا ئاماژەیان پێنەداوە. ئەگەر شەڕی ناوخۆ دە ساڵ یان کەمێك زیاتر روویدا، ئەوا دەکرێ گریمانەی ئەوە بکرێ کە ئەو وتارە ژێیەکی هەستیاری میللی پێکاوە. ئەوە روونە لەژێر تەوژمی بەخوڕی ئەدەبی لایەنگرانی هەڵوەشاندنەوەدا بووە بەژێرەوە و تا سەدەی پاشتر بەلێڵی و لەبیرکراوی مایەوە.

ئێستا دیمەنەکە بۆ باشوری ئەفریقیا و هیند دەگوێزرێتەوە. ساڵی ١٩٠٧ کۆپیەکی کتێبی "یاخیبوونی مەدەنی" کەوتە دەست پارێزەرێکی هیندی لە ئەفریقیا بەناوی موهانداس کارامچاند گاندی. گاندی پێشتر بیری لە تایبەتمەندیەکانی (بەرەنگاریی ئەرێنی) دەکردەوە وەك بەرگریەك لە گەلەکەی. ئەمەی خوارەوە گێڕانەوەی ئەو رووداوەیە وەك مەهاتما گاندی بیست و دوو ساڵ دواتر بۆ (هێنری ساڵت)ی باس کردوە، کە یەکێك بووە لە نووسەرانی ژیانی:

وابزانم یەکەم دیدارم لەگەڵ کتێبەکەی تۆرۆ ساڵی ۱۹۰۷ بوو کاتێك لە گەرمەی کێشمەکێشی بەرەنگاریی ئەرێنیدا بووم. هاورێیەکم کۆپییەکی "یاخیبوونی مەدەنی" بۆ ناردم. کتێبەکە بەقووڵی کاری تێکردم. هەربۆیە بەشێکیم بۆ خوێنەرانی رۆژنامەی "رای هیندی لە باشوری ئەفریقیا" وەرگێڕا کە من ئەوکاتە دەرمدەکرد و هەندێ برگەیم بۆ بەشی ئینگلیزیی رۆژنامەکە گواستەوە. هەستم کرد پێویستە زیاتر لەبارەی تۆرۆ بزانم. هەربۆیە کتێبەکەی تۆم دەربارەی ژیانی، هەروەها کتێبی "دارستان"ی تۆرۆ و هەندێ کورتە وتاریترم دەست کەوت و بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە خوێندنمەوە و سوودێکی زۆرم لێ بینین.

چیرۆکێکیتر هەیە کەمێك لەمە جیاوازە و هاورێیەکی نزیکی گاندی لە باشوری ئەفریقیا گێڕایەوە، ئەویش هێنری پۆلاکە:

ئێستا (۱۹۳۱) ناتوانم بیرم بێتەوە کە ئاخۆ ساڵی ۱۹۰۷ گاندی کۆپییەکی وتارەکەی تۆرۆ (کە کتێبخانەی سکۆت بڵاوی کردبووەوە)ی دەست کەوت یان من دەستم کەوت، بەڵام هەردووکمان زۆر پێی سەرسام بووین و کاری تێکردبووین، ئەویش لەبەرئەوەی مانای بەرەنگاریی ئەرێنی پربەپێستی یاخیبوونی مەدەنی بوو.. پاش راوێژ لەگەڵ مستەر گاندی لەبارەی ئەرکی یاخیبوونی مەدەنی وتارەکەم لە ستوونەکانی رۆژنامەی "رای هیندی" نووسی و وەرگێڕدرایە سەر زمانی گوجاراتی کە رۆژنامەکە بەو زمانە دەردەچوو، هەروەها بە ئینگلیزیش دەردەچوو. پاش ئەوە، ئەو وتارە لە شێوەی نامیلکە یان نەشرەدا بڵاو کرایەوە. هەمان ساڵ رۆژنامەی ناوبراو پێشبرکێیەکی لە نووسینی وتار لەبارەی "فەلسەفەی ئەخلاقیی بەرەنگاریکردنی ئەرێنی" ساز کرد، لەگەڵ ئاماژەدانێکی تایبەت بە وتارەکەی تۆرۆ، کە سەرنجی مستەر گاندی راکێشابوو.

لەو رووەوە مستەر گاندی زاراوەی "بەرەنگاریکردنی ئەرێنی" بەدڵ نەبوو، لە هەمان کاتدا زاراوەیەکیتری جێگرەی گونجاوی نەدۆزیەوە، دەستبەجێ رازی بوو

بە خواستنی "یاخیبوونی مەدەنی" بۆ وەسفکردنی بزاڤەکەی. بڕیاریدا ئەم زاراوەیە گوزارشت لە بنەمای توندی (صلابة) دەکات بەبێ توندوتیژی، لەگەڵ دەستگرتن بە حەقیقەت و دادپەوەریەوە، ئەوەیش سیاسەتێکی دیپلۆماسی بوو کە بەتەواوی لەگەڵ فەلسەفەی گاندیدا دەگونجا. "یاخیبوونی مەدەنی" لە دەستی مەهاتما گاندیدا بوو بە ئینجیلی بەرەنگاریکردن. گاندی زاراوەیەکی هاوتای بۆ شوێنکەوتە هیندۆکیەکان داڕشت ئەویش زاراوەی ساتیگراها Satygraha بوو کە لە دوو وشەی سانسکریتی پێکدێ بەمانای "هێزی رۆح" یان "هێزی بەرهەمهاتوو لە حەقیقەت و خۆشەویستی، یاخود ناتوندوتیژی" دێ. کریشنالال شریدهارانی کە یەکێکە لە نووسەرانی ژیانی گاندی دەڵێ "خەباتی تۆرۆ دژی بازرگانیکردن بە کۆیلە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، گاندی پڕ کرد لە باوەڕ بەوەی لە "هێزی رۆح"دا ژمارەی بەرەنگاری گرنگ نیە، ئەوەی گرنگە بێگەردیی "رۆحی قوربانیدانە". گاندی پێی وابوو: فەرمانەکان مەحاڵن کاتێك لەناو ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی بێزاردا قەتیس بن، هەروەها ماندوکەرن کاتێك پێویست بێ دژی زۆر لە کەسانی دەروون باڵا جێبەجێ بکرێن، کە هیچ گوناهێکیان نەکردووە و وەك بەرگریکردن لە پرنسیپ ئامادە نین باج بدەن. کاتێك تاکە لاتەریکەکان بۆ دەربڕینی نارەزاییان پەنا بۆ ئەم رێگەیە دەبەن، لەوانەیە زۆر نەبنە جێی سەرنج. بەڵام نموونە دیارەکان رێگەی سەیر بۆ خۆجارانکردن دەگرنە بەر. بەرگەی جارِدان دەگرن و لەبری ناڵاندن بەدەست رقەوە، پیرۆزبایی بەدەست دێنن. خەڵکانێك لە نموونەی تۆرۆ توانییان بە بەها کەسیەکانیان بازرگانیی کۆیلە هەڵبوەشێننەوە.

گاندی بەم دەربڕینانە وشەکانی تۆرۆی لەبارەی هێزی کەمینەی بچوکی خاوەن عەزیمەتی نەگۆڕ دەگوتەوە. بەوەیش، وەك شریدهارانی دەڵێ "تۆرۆ تەنها چەکی یاخیبوونی مەدەنی کە رێسایەکی گشتییە لە "هێزی رۆح"ەکەی گاندیدا، بەڵکو

هێـزی هاوکارینەکردنیشـی زەق کـردەوە، کـە پاشـتر گانـدی وەك ئامرازێـك بـۆ تێکشکاندنی حکومەتێکی خراپ، گەورەی کرد".

گانـدی بەدرێـژایی سـاڵی ١٩١٤ لـە باشـوری ئـەفریقیا مایـەوە و سـەرکردایەتیی شەڕێکی دەکرد دژی هێزەکانی حکومەت کە ژەنراڵ جـان سمـوتس سـەرکردایەتی دەکردن. ئەو هەڵمەتـە بـە چەوسـاندنەوە و توندوتیـژیی هەمـەجۆر و بەنـدکردن و هـەموو ئـامرازە بەردەسـتەکانی حکومـەتێکی ملـهوڕ لـە هـەوڵی سـەرکوتکردنی کەمینەیەکی نابەناوبانگدا، دەناسرایەوە. ڕێگـەکانی گانـدی لـە هاوکارینـەکردن و بەرەنگارینـەکردن و یـاخیبوونی مـەدەنی یـان "هێـزی رۆح" سـوودی هـەبوو. سـەرەنجام سـەرۆك وەزیـران سمـوتس و حکومەتەکـەی لەسـەر هـەموو داوا گرنگـەکانی هیندیـەکان قایـل بـوون، لەوانـە هەڵوەشـاندنەوەی یاسـای مـۆری پەنجەکان، هەڵوەشاندنەوەی باجی سێ جونەیە بـۆ هـەر کەسـێك، پەسـەندکردنی هاوسەرگیریی نێوان هینـدۆس و موسـڵمانەکان، لابردنـی کـۆت و بەنـدەکانی سـەر کۆچـکردنی هیندیـە خوێنـەوارەکان و بەڵێنـدان بـە پاراسـتنی مافـە شـەرعیەکانی هاوڵاتیانی هیندی.

ئەنـدروز کـە نووسـەرێکیتری مێـژووی ژیـانی گاندییـە، پێـی وایـە پێویسـتە هەڵمەتەکەی باشوری ئەفریقیا "نەك تەنها بە یەکـەم نموونـە دانـەنرێ، بـەڵکو بـە نموونەیەکی کلاسیکی دابنرێ بـۆ بـەکارهێنانی بەرەنگارینـەکردن لـەرێی ئـاپۆرای ڕێکخراوی خەڵك، بەمەبەستی لادانی ستەم".

بەگوێرەی قسەی شریدهارانی، تەفسیرەکەی گاندی بۆ یاخیبوونی مەدەنی ئەوەیە کە:

تەنیا ئەوانەی حەزیان لە گوێڕایەڵیکردنی یاسایە.. مافی ئەوەیان هەیە دژ بە یاسا نادادپەروەرەکان پەنا بۆ یاخیبوونی مـەدەنی ببـەن. ئەمـەیش تـەواو جیـاوازە لـە ڕەفتـــاری لەیاســـا دەرچـــووان، لەبەرئـــەوەی ئـــەوان بەئاشـــکرا و پـــاش

ئاگەداركردنەوەیەكی پێشوەخت گونجاو یاساشكێنی دەكەن.. كەواتە هیچ شیاو نیە برەو بە نەریتی یاساشكێنی یاخود دروستكردنی كەشوهەوایەكی بێسەروبەری بدرێ، بەڵكو تەنیا ئەوكاتە پەنای بۆ دەبەن كە هەموو رێگەكانیتری وەك سكاڵاكردن و دانوستان و داوەریخوازی بۆ لادانی ئەو ستەمەی هەیە، داد نادەن.

گاندی لە سەرەتاكانی ساڵی ١٩١٥ گەڕایەوە هیندستان و هەر لەوێ مایەوە تا كوژرانی لە ساڵی ١٩٤٨. ئەوە بوو لەو كاتەی سەركردایەتی ئەو هێزانەی دەكرد كە ئازادییان بۆ هیند و پاكستان هێنا لەلایەن تاوانبارێكی بەدفەڕی هیندۆكیەوە تیرۆر كرا. پشێوی و قەسابخانەكاری و سزادان بۆ بەندكردن بۆ ماوەی درێژ درێژ و سەركوتكردنی ئازادیی مەدەنی و یاسای ستەمكارانە دژی خەباتكردن لەپێناویاندا هاتەكایە. لەو ساڵانەدا یاخیبوونی مەدەنی بەزۆری بەكار هات و گاندی زیاتر بەهێزی كرد تا كردی بە چەكێكی زۆر كاریگەر. هەنگاوە بەراییەكان شلۆقی و خۆپیشاندان و دانوستان و ئەگەر بكرایە داوەریخوازیش بوون. ئەگەر ئەمانە ئەنجامیان نەبوو، پەنایان بۆ رێگە ئابووریەكان دەبرد وەك بایكۆتی بازرگانی و پەناگیری. یەكێك لە رێگەكانیش نەدانی باج بوو.

لە ئابی ١٩٤٧ بەریتانیا مافی بڕیاردانی چارەنووسی بەخشییە هیندی هیندۆكی و پاكستانی ئیسلامی.

بەدڵنیاییەوە ئایندە زۆر سوودیتری بەكارهێنانی بنەماكانی یاخیبوونی مەدەنی دەبینێ وەك كە تۆرۆ داینا و گاندی قووڵی كردەوە. هێزی گەلانی ستەمدیدە لە هەموو جێیەك، تەنانەت لە سایەی رژێمە دیكتاتۆرییە نوێ وەحشیەكانیشدا بەم ئامرازانە دەتوانن دەسەڵاتداران ناچار بكەن هەستیان پێ بكەن. لەوانە خەباتی گەلانی رەشپێستی باشووری ئەفریقیا دژی حكومەتی ستریجدۆن، كە نوێكردنەوەی خەباتی گاندییە.

گانــدی دەڵــێ "تەنانــەت زۆردارتــرین حکومەتــەکانیش بــەبێ ڕەزامەنــدیی ژێردەستەکان دروست نابن، کە زۆرداران بەزۆری ئـەو ڕەزامەندییـە بـەزەبری هێـز بەدەست دێنن. خەڵك دەستبەجێ ترسیان لە هێزە زۆردارەکە دەشکێ. ئـیتر ئـەو زۆردارە هەیبەتی شکا و دڵەکان لەباتیی لەرزین لەبەرانبەریان وورە پەیدا دەکەن".

تۆرۆ دژ بە حکومـەتی خۆسـەپێن و حکومـەتی ڕەهـا بـوو لـە هـەر فۆرمێکدا بـن. یەکبین دژی کۆمۆنیزم و سۆشیالیزم و هەر ڕێبازێکیتر بوو کە حکومـەت لەسـەروو مافەکانی تاکەوە دابنێ.

پـارینگتۆن دەنووسـێ "فەلسـەفەی تاکگـەرایی لـە سـەدەی هەژدەیەمـدا و ئـەو ئیباحیەتە بەهێزەی جان جاك ڕۆسۆ رایگەیاند و لـە نیـو ئینگلانـد لـەڕێی تـۆرۆوە گەیشــتە لوتکــە، بەرجەســتەکردنی تــەواوی پەرچــەکرداری بنــەمای "ئــازادیی مامەڵەکردن" بوو بەسەر ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیـەی لەلایـەن هێـزی سـەربازیەوە پشــتیوانی دەکـرێ، هــەروەها تونـدترین ڕەخنەیـە لـە ئابووریـەکانی دنیـا کـە خەونەکانی ئازادیی مرۆڤ لەبار دەبەن.."



### ٦- "كوخەكەی مام تۆم"
### هاریت بیچەر ستۆ Harriet Beecher Stow
### سەركێشیەك لە پێناو هەژاراندا

هەڵسەنگێنەرانی "كوخەكەی مام تۆم" چ ئەوانەی ستایشیان كردووە و چ ئەوانەی تانەیان لێداوە، لە خاڵێكدا كۆكن. ئەویش ئەوەیە هەموو بەبێ جیاوازی دانیان بە كاریگەریی گەورەی ئەو كتێبە لەسەر سەردەمی خۆی و ڕۆڵی بەهێزی لە هاندانی شەڕی ناوخۆدا ناوە. یەكێك لەوانەی تانەیان لێداوە وەسفی كتێبەكەی كردووە بەوەی "شێواندنێكی وەحشیانەیە كە بەرهەمی دەمارگیرییە بۆ هەڵوەشاندنەوەی كۆیلایەتی، بابەتێكە بۆ نانەوەی ناكۆكی لەنێوان بەشەكاندا". یەكێك لە نووسەرە بەناوبانگەكانیش لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا دەڵێ "كتێبی كوخەكەی مام تۆم زیانێكی وای بەجیهان گەیاند كە هیچ كتێبێكیتر بەو ئاستە نەگەیشتووە".

بەپێچەوانەی ئەم دووانە، ژمارەیەكی زۆر لە سەرسامبووان خۆشحاڵیی خۆیان بە گوتارێكی لونجفلو دەربڕی كە كوخەكەی مام تۆم" وەسف دەكات بەوەی "یەكێكە لەو سەركەوتنە مەزنانەی مێژووی ئەدەب تۆماری كردووە، ئەمە جگە لە كاریگەرییە ئەخلاقیەكەی". هەندێكیتر كتێبەكەیان بە "سەركەوتنی حەقیقەت" و "نەمر" و نووسەریان بە "خاتوونێكی بێ دوودڵی هەڵكەوتوو" وەسف كردووە.

هیچ كتێبێكیتر لەم كتێبە بابەتیتر و لە رووی ئەركەوە كاتەكەی باشتر نەبووە. گوڕ و تینی خەبات لەپێناو پرسی كۆیلایەتی توندتر كرد، پەسەندكردنی یاسای كۆیلە هەڵاتووەكانیش توندتری كرد. ئەوانەی داوای هەڵوەشاندنەوەی كۆیلایەتییان دەكرد ماوەی بیست ساڵ رای گشتییان دژی كۆیلایەتی هان دەدا،

کۆنگرێس، بەزیادبوونی ژمارەی ئەو پیاوە ئاینیانەی نەیاری کۆیلایەتی بوون لە باکور و باشور، کە لە بڵندگۆکانیانەوە ئایەتی پیرۆزیان دەهێنایەوە کە بوون و بەکارهێنانی کۆیلەیان حەرام دەکرد، بوو بە دوو بەشەوە. دۆخە هەڵچووەکە گەیشتبووە لوتکە و تەنیا چاوەڕوانی پریشکێکی دەکرد بۆ ڕوودانی تەقینەوەیەك کە هەموو جیهان دەهەژێنێ. کتێبی کوخەکەی مام تۆم ئەو پریشکەی پێدان.

وەختەکە نەك هەر گونجاو بوو، بگرە بۆماوە و ژینگە پێکەوە کەسی پڕبەپێستیان بۆ وروژاندنی سەرکێشی دژی بەکۆیلەکردنی مرۆڤ پێك دەهێنا.

هاریت بیچەر ستۆ کچی پیاوێك بوو لەوانەی پیرۆزییان گەورەترین ناوبانگی هەبوو لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەویش لایمان بیچەر بوو، خوشکی مۆچیار (واعظ)ێکی لە باوکی عاتیفیتر بوو ئەویش هێنری وارد بیچەر بوو، هەروەها ژنی مۆچیارێکیش بوو، هەروەك خوشك و دایکی زۆر مۆچیاریتر بوو و هەموو ژیانی لە کەشێکی ئاینیی ڕووتدا بەسەر بردبوو. زیاد لەوەیش خوێندنە ئاینییەکەی گلڤنیەکی توند و وابەستە بە ڕۆحی جۆناپان ئێدواردز و ساموێل هۆپکنز و سۆفییانیتری نیو ئینگلاند بوو. هەروەها هەر لە منداڵیەوە ڕێنماییە لاهوتیەکان "وەك ئاگر و کبریت" دەوریان دابوو.. هاریت مەگەر چۆن ئەگینا نەیدەتوانی مۆچیار نەبێ، جا ئەگەر لەسەر مینبەریش نەبێ لانیکەم بەقەڵەم.

بنچینە ئاینیەکە لە سەرجەم دانراوە هەمەجۆرەکانیدا، لەوانە کوخەکەی مام تۆم.

هاریت بیچەر ستۆ لە لیچفیلد لە ویلایەتی کۆنێکتیکوت لە ساڵی ١٨١١ لەدایك بووە و لە هارتفۆرد هەندێکی خوێند باشتر لەوەی واباوە ئافرەتان لە سەردەمی ئێمەدا بەدەستی بێنن. دوو لە سێی خوێندنەکەی بەسروشت ئاینی بوو. شەیدای خوێندنەوە بوو. جگە لە زانستی لاهوت، سەرسام بوو بە هەریەك لە بایرۆن و سکۆت و کاریگەریی گەورەیان لە شێوازی نووسینیدا هەبووە.

بیچەر و خێزانەکەی زۆر لە هاتوچۆدا بوون لە لیچفیلدەوە بۆ ئەبروشیەیەك لە بۆستن. ئەوکاتە هاریت تەمەنی چواردە ساڵ بوو. چەند ساڵێك پاشتر بۆ دووەم جار گواستیانەوە بۆ سیسیناتی و هاریت تا ساڵی ١٨٥٠ لەوێ مایەوە و لە قوتابخانەیەکدا وانەی دەوتەوە. مێردی کرد بە ئەندامێکی کۆلێژی ئەو مەجمەعە ئەویش گاڵڤن ستۆ بوو و شەش لە حەوت منداڵەکەی لەو پیاوە بوو. ناوبەناو وێنەی دەکێشا و چیرۆکی دەنووسی بەمەبەستی بڵاوکردنەوەیان لە گۆڤارەکانی ئەوێ.

ئەو ساڵانەی لە سینسیناتی بەسەری بردن لە زۆر لاوە شکڵی بوون. سینسیناتی دەکەوێتە سەر روباری ئۆهیۆ لە بەرانبەر مەزراگەلێکی بەرفراوان کە کۆیلەکان لە ویلایەتی کەنتەکی Kentucky کاریان تێدا دەکرد و ناوەندی بزاوتێکی هەڵچوو بوو دژی کۆیلایەتی. هەرچی و پەرچییانی نەیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی بەشەقامەکانیدا دەگەڕان و چاپخانەکانی نەیاری کۆیلایەتییان دەشکاند و بەخراپی مامەڵەیان لەتەك زنجییە ئازادەکان دەکرد. وتاری توندوتیژ بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دران، هەروەها سنسناتی پەناگەی کۆیلە هەڵاتووەکان بوو لەڕێگەیاندا بە شەمەندەفەر بۆ باکور، بۆ ئازادی لە کەنەدا. هەمان مەجمەع هەستی دژ بەکۆیلایەتی برەو پێدەدا. تەنیا شوێنەکەی لە شەقامێکی سەخت و قووڕاویدا کە دوو میل لە شار دوور بوو لە دەستی هەرچی و پەرچییەکان دەیپاراست. ماڵی لایمان بیچەر لە چەندین بۆنەدا پەنای هەڵاتوانی داوە. هاریت راستەوخۆ لە زاری کۆیلە هەڵاتووەکانەوە چیرۆکی لەبەریەك هەڵوەشانی چەندین خێزانی بەهۆی دڵڕەقیی سەرپەرشتیارانی کارکردنی کۆیلەکانەوە و دیمەنە دزێوەکانی شوێنی مەزاتکردن و کارەساتەکانی راوەدوونانی هەڵاتووان، دەبیست.

خاتوو ستۆ یەك جار بەچاوی خۆی كاركردن لە سیستەمی گلدانەوەی كۆیلەكانی بینی. ئەوە بوو لە سەردانێكی كورتیدا بەیاوەریی هەندێ هاوڕێی بۆ شاری مایزڤیل لە ویلایەتی كەنتەكی لە ساڵی ١٨٣٣، ژمارەیەك مەزرای بینی كە ژمارەیەكی زۆر ماڵی لادێیی و كوخی كۆیلەیان تێدا بوو. لێرە نموونەی ئەو مەزرایەی دۆزیەوە كە بۆ كتێبی "كوخەكەی مام تۆم"دا بەخەیاڵیدا هات، ئەویش مەزرای شەلبی بوو. بیرۆكەی كرداری لەبارەی سیستەمی كاری كۆیلەكانی دەست كەوت. هەروەها زانیاریی زۆریشی لە چارلزی برای دەست كەوت كە وەك بزنسمان كاری دەكرد و سەفەری بۆ نیو ئۆرلیانز و ریفی روباری سوور دەكرد و چیرۆكی جەرگبڕی لەبارەی كۆیلایەتی لەوپەڕی باشوور بۆ دەهێنایەوە. هاریت قەرزاری چارلزە بۆ نموونەی پاڵەوانی كوخەكەی مام تۆم، واتە سیمۆن لێگری، كە دڕندەیی سەرپەرشتیاری كۆیلەكان بەرجەستە دەكات و چارلز لەسەر كەشتیەك لە رووباری میسیسیپی چاوی پێی كەوت.

هاریت لە ماوەی ئەو ساڵانەی لە سنسناتی بوو، لەو كەسانە نەبوو كە زۆر بۆ هەڵوەشاندنەوەی كۆیلایەتی بەجۆش بێ، رەنگە ئەویش هاوڕای باوكی بووبێ لەوەی كە هەڵوەشاندنەوەكە پێكدێ لە "سركە و ترشی نیتریك ترشی كبریتیتك، لەگەڵ كبریت و خوێی بارود و خەڵوزی رووەكی، تا بتەقێتەوە و مادە بخۆرەكە پرزە پرزە ببێ". راستیەكەی خاتوو ستۆ زیاتر تەماشاكەر بوو لەوەی پاڵەوانێك بێ لە شەڕی كۆیلایەتیدا، تا گەڕایەوە نیو ئینگلاند و گالڤین ستۆی وەك مامۆستا لە كۆلێژی بۆدوین لە ویلایەتی مەین دامەزرا، ئەویش ساڵی ١٨٥٠بەخێزانەكەیەوە باری كردە ئەوێ.

سەرتاسەری نیو ئینگلاند لە رقی پەسەندكردنی یاسای كۆیلە هەڵاتووەكان پڕ و تووڕە بوو، بەتایبەت دژی هەندێ رووداوی پەیوەندار بە جێبەجێكردنی ئەو یاسایە لە بۆستن. خاوەن كۆیلەكانی باشور دەیانتوانی لەنێو ویلایەتە ئازادەكاندا

کۆیلە هەڵاتووەکان راو بنێن و بیانگرنەوە، فەرمانبەرانی ئەو ویلایەتانەیش دەبوو لە گێڕانەوەی کۆیلەکانیان یارمەتییان بدەن. زیاد لەوەیش، ئەو زنجیانەی ماوەیەکی درێژ بوو بەیاسا تامی ئازادییان کردبوو، کۆکرانەوە و گێڕدرانەوە بۆ خاوەنە پێشووەکانیان و لەو پرۆسەیەدا بەزۆری لە خێزانەکانیان جیا دەکرانەوە.

هاریت ستۆ وتارێکی لە براژنەکەیەوە، خاتوو ئیدوارد بیچەرەوە پێگەیشت، تێیدا تکای لێدەکرد شتێك بنووسێ تەواوی نەتەوەیەك هەست بە مەرگەساتی کۆیلایەتی بکەن. بەپێی دابونەریتی بنەماڵەی ستۆ، هاریت گوتی: "ئەگەر خوا تەمەنی پێدام بەیارمەتیی خوا شتێك دەنووسم". لەو سەروەختەدا ئیدواردی برای لە کەنیسەی بۆستن دژی کۆیلایەتی گڕی گرتبوو، براکەیتریشی هێنری ئێدوارد سەرقاڵی سەردانەکانی کەنیسەکەی بوو لە شاری بروکلین بۆ رزگارکردنی کۆیلەکان و ئازادکردنیان.

بەشی یەکەمی کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" کە هێشتا لە قۆناغی نووسیندا بوو، ئامانجی بابەتەکە بوو و وەسفی مردنی تۆم دەکات. کاتێك خاتوو ستۆ لە کەنیسەی برونسویك لەکاتی دابەشکردنی قوربانیی پیرۆزدا ئامادە بوو، کۆی دیمەنە کەڵەکەبووەکانی لە چاوی زەینیدا گێڕایەوە. ئێوارەی هەمان ئەو رۆژە چووە ژوورەکەی و دەرگاکەی کڵۆمدا و دەستی کرد بە نووسینی بینینەکەی تا کاغەزی نووسینی لێ بڕا و کاغەزی پێچانەوەی رەنگ قاوەیی بەکارهێنا و چیرۆکەکەی تەواو کرد. ئەوە بوو بە دەروازەیەك بەناونیشانی "شەهید" لە کتێبی "کوخەکەی مام تۆم".

کاتێ بۆ مێرد و منداڵەکانی خوێندەوە، بەقووڵی کاری لە هەرهەموویان کرد. دەڵێن گالڤین ستۆ هاواری کردووە: "ئەمە لوتکەی چیرۆکی کۆیلایەتییە کە بەڵێنت بە خوشکەکەمدا بینووسیت. لە سەرەتاوە دەست پێبکە تا دەگەیتە کۆتایی".

پاش چەند هەفتەیەکی کەم هاریت نامەیەکی نارد بۆ گامالیل بایلی Gamaliel Bailey سەرنووسەری رۆژنامەی "سەردەمی نەتەوەیی" کە رۆژنامەیەك بوو پشتیوانی لە هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی دەکرد لە واشنتۆن. بایلی بنەماڵەی بیچەری لە سنسناتی دەناسی، ئەوکاتیش رۆژنامەیەکیتری دژ بە کۆیلایەتی دەردەکرد بەناونیشانی "خێر" تا بەتوندوتیژیەکی زۆر لەوێ دەرکرا. خاتوو ستۆ لە نامەکەیدا باسی ئەوەی کرد کە بەنیازە چیرۆکێك بنووسێ بەناونیشانی "کوخەکەی مام تۆم" لەبارەی "ئەو پیاوەی شتێك بوو" (ئەم ناونیشانە پاشتر گۆڕدرا بۆ "ژیان لەناو هەژاران") بەشێوەی زنجیرە، کە لەوانەیە سێ بۆ چوار ئەڵقە ببێ. بایلی پاداشتی سێسەد دۆلاری خستە بەردەمی وەك مافی نووسین و رۆژنامەکە لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥١ دەستی بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکە کرد.

خاتوو ستۆ پێشبینی دەکرد ئەو کتێبە لە مانگێکدا تەواو ببێ، بەڵام ئەو دیمەن و رووداو و کەسایەتی و دەمەتەقێیانەی لە ئەزموونەکانی رابردووی لە مێشکیدا کەڵەکە بووبوون، یان ئەوانەی بەلێشاو بۆی دەهاتن لەو کاتەی هێزی خەیاڵ و داهێنانی تاویان سەندبوو، کتێبەکە تادەهات درێژ دەبوویەوە. ئەڵقە هەفتانەکان بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێك درێژ بوونەوە بەر لەوەی ژنە نووسەرە ماندووەکە بتوانێ بگاتە کۆتایی کتێبەکە. پاش ئەوە پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی خوا خۆی ئەوەی نووسیوە و ئەو تەنیا ئامرازێك بووە بەدەستیەوە.

پلانی ئەسڵیی چیرۆکی "کوخەکەی مام تۆم" ئاڵۆز نەبوو گەرچی ژمارەیەك کەسایەتیشی تێدایە. لە دیمەنی دەروازەی کتێبەکەدا: مستەر شلبی، کە خاوەن کۆیلەیەکی پیاوچاکی خەڵکی کەنتەك بوو، بۆ ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە ناچار بوو هەندێ لە باشترین کۆیلەکانی بفرۆشێ، لەناویاندا فرۆشتنی مام تۆم بە کۆیلەفرۆشێك لە نیوئۆرلیانز بەناوی هەیلی. ئافرەتێکی نیوە زنجیش بەناوی

ئێلیزا گوێی شل کرد و زانی هاری‌ـی منداڵی ئەویش دەفرۆشرێ. لە تاریکیی شەوی ئەنگوستەچاودا کوڕەکەی هەڵگرت و بەئومێدی ئازادبوون روباری بەستەڵەکی ئۆهیۆی بەرەو کەنەدا بڕی. مێردەکەی، جۆرج هاریس کۆیلە بوو لە مەزرایەکی نزیک، ئەویش هەڵهات و گەیشتەوە پێی. دوای چەندین سەرکێشی لەگەڵ هێزەکانی دەستگیرکردنەوەی کۆیلە راکردووەکان، بەیارمەتیی ئەندامانی کۆمەڵەی هاوڕێیان کە جۆرج فۆکس دایمەزراندبوو و هەندێ خەڵکیرتی سپیپێست، کە لەو رێگەیەدا بەزەییان پێیاندا دەهاتەوە، گەیشتنە کەنەدا، دوای ئەوەیش بۆ ئەفریقیا.

بەڵام مام تۆم بەدبەخت بوو. بۆ ئەوەی گەورەکەی شپرزە نەکات رازی نەبوو رابکات، لە ژن و منداڵەکانی جیا کرایەوە. لە گەشتی نێوان روباری میسیسیپی بۆ نیو ئۆرلیانزدا تۆم ژیانی کچۆڵەیەکی بەناوی ئیڤا Eva لە مردن رزگار کرد، باوکی کچەکە، سەینت کلەیر St, Klair وەك سوپاسگوزاریەك بۆ تۆم، لە کۆیلەفرۆشەکەی کڕیەوە.. دوو ساڵی پاش ئەوە بۆ تۆم ماوەی بەختەوەری بوو وەك خزمەتکار لە ماڵی سەینت کلەیر و ئیڤای کچی لە نیو ئۆرلیانز و هاوڕێ زنجییە بچوکەکەی تۆپسی Topsy. ئیڤا دەمرێ، لە یادکردنەوەیدا کلەیر بەنیاز دەبێ تۆم و کۆیلەکانیتری هاوڕێ ئازاد بکات، بەڵام لەوکاتەی ناوبژیوانی لەنێوان دوو بەشەڕهاتوو دەکرد دەکوژرێ. پاشتر ژنەکەی فەرمان دەکات تۆم ببەن بۆ بازاڕی کۆیلەکان تا بەمەزاتی ئاشکرا بیفرۆشن. جوتیارێکی سەرخۆش و دڕ لە ناوچەی روباری سوور بەناوی "سیمۆن لجری" دەیکڕێتەوە. سەرەڕای هەڵسوکەوتی نەرمی تۆم و هەوڵدانی تەواوی بۆ رازیکردنی گەورە دڵڕەقەکەی، لجری هەر زوو دەکەوێتە رقەوە لە تۆم و زۆرجار قامچیکاری دەکات.

جارێکیان دوو کچی کۆیلەی لجری بەناوەکانی کاسی و ئێملین هەوڵ دەدەن لە مەزراکە هەڵبێن و لە شوێنێك خۆیان بشارنەوە. لجری تۆم بە یارمەتیدانیان

تۆمەتبار دەكات و گومانی لێدەكات كە ئەو دەزانێ لەكوێ خۆیان شاردۆتەوە. كاتێك تۆم رازی نابێ هیچ زانیاریەك بدركێنێ، تۆم لە قامچیكاریكردنی بەردەوام دەبێ تا لە هۆش خۆی دەچێ، دوو رۆژ پاش ئەوە جۆرج شلبی بچوك كوڕی خاوەنی پێشووی تۆم دێت تا بیكڕێتەوە و بیباتەوە، بەڵام دوای چی. تۆم بەهۆی برینی لێدانەكانی ئەو وەحشە بكوژەوە گیانی سپاردبوو. لە رقی ئەوە جۆرج بەتوندی دای لە لجری و كەوتە زەوی و گەڕایەوە بۆ كەنتەكی و بەناوی مام تۆمەوە هەموو كۆیلەكانی ئازاد كرد و بڕیاریدا باقیی ژیانی بۆ پرسی هەڵوەشاندنەوەی كۆیلایەتی تەرخان بكات.

ئەگەرچی تیراژی رۆژنامەی "سەردەمی نەتەوەیی" گەورە نەبوو، بەڵام كتێبی "كوخەكەی مام تۆم" لە ماوەی چەند مانگێكدا رەواجێكی زۆر و بەجۆشی پەیدا كرد. بەر لە بڵاوبوونەوەی دوایین بەشی بەرهەمەكەی

خاتوو ستۆ لە دووتوێی كتێبێكدا چاپ كرا. دامەزراوەی جۆن ب. جیویت لە بۆستن بەترسێكی زۆرەوە، لەلایەك لەبەر درێژیی بابەتەكە و لەلایەكیترەوە لەبەرئەوەی دانەرەكەی ئافرەت بوو و دەترسا رەواجی نەبێ، ئەركی ئەو كارەی گرتە ئەستۆ. جیویت بۆ ئەوەی حساب بۆ هەر زیانێكی ماڵی بكات، پێشنیاری بۆ خاتوو ستۆ كرد ٥٠٪ی قازانجەكەی بۆ ئەو بێت بەو مەرجەی نیوەی تێچوونی بەرهەمهێنانی بگرێتە ئەستۆ. بەڵام بنەماڵەی خاتوو ستۆ لەباتیی ئەوە وای باباش زانی ١٠٪ی قازانجی فرۆشراوەكانی بداتێ. ئەو بڕیارە دەسكەوتنی سامانێكی لەكیسدان.

چ بڵاوكار و چ دانەریش بە سەركەوتنی "كوخەكەی مام تۆم" گەشبین نەبوون. خاتوو ستۆ خوازیار بوو لەو كتێبە هێندە پارەی دەست بكەوێ بەشی كڕینی دەستێكی نوێ جلی ئاوریشم بكات. چاپە ئەسڵیەكە تیراژی ٥٠٠٠ دانە بوو لە دوو بەرگدا. لەسەر بەرگی كتێبەكەش وێنەی كوخێكی زنجی كێشرابوو.

لـە یەکـەم ڕۆژی بڵاوکردنەوەیـدا ۳۰۰۰ دانـەی لـێ فرۆشـرا، باقیەکـەی لـە ڕۆژی دووەمدا تەواو بوو. داواکاریش تادەهات زیـاتر دەبـوو. لـە مـاوەی هەفتەیەکدا ۲۰ هــەزار دانــەی لــێ فرۆشــرا. لــە کۆتــایی ســاڵی یەکەمــدا تــەنها لــە ویلایەتــە یەکگرتووەکان ژمارەی فرۆشی گەیشتە ۳۰۰۰۰۰ دانە. هەشت ئـامێری چـاپ شـەو و ڕۆژ کاریان دەکرد بۆ پڕکردنەوەی خواست. سێ کارگەی کاغـەزیش هـەوڵیان دەدا کاغەزی پێویست دابین بکەن. لەگەڵ ئەوەیشدا، هێشتا بڵاوکارەکـە پێویسـتی بـە هەزاران دانەیتر هەبوو بـۆ پڕکردنـەوەی خواسـتەکان. پێدەچـێ هەرکـەس توانـای خوێندنەوە و نووسینی لە دەوڵەتەکەدا هەبووە کتێبەکەی خوێندۆتەوە.
ناوبانگی "کوخەکەی مام تۆم" لـە دەرەوە لـە ڕادەی فرۆشـی نـاوخۆ زیـاتر بـوو. فەرمانبەرێکی بچوک لای پوتنام دانەیـەکی بـۆ بڵاوکـارێکی ئینگلیـزی نـارد، پێـنج جەونەیە هەقدەستی وەرگرت. هەربۆیە چەندین چاپی دزراو پەیـدا بـوون، چـونکە یاسایەکی نێودەوڵەتی نـەبوو بـۆ پاراسـتنی مـافی دانـەر. لەبەرئـەوە زۆری نـەبرد هەژدە دامەزراوەی ئینگلیزی لە چل چاپدا داخـوازیی بازاڕیـان دابـین دەکـرد. لـە مـاوەی سـاڵێکدا ملیـۆن و نیوێـك دانـەی لـە بـەریتانیا مـەزن و کۆلۆنیەکانـدا لـێ فرۆشرا. لەکاتێکدا بڵاوکارانی ئەورووپی سەرقاڵبوون بە چـنینەوەی بـەروبومی ئـەو بەرهەمی زێڕینە، مسز ستۆ هیچی لە پارەی ئەو هـەموو فرۆشـە دەسـت نەکـەوت. ئەو کتێبە لانیکەم بۆ بیست و دوو زمان تەرجەمە کـرا، هـەمان سـەرکەوتن کـە لـە دەوڵەتانی زمان ئینگلیزیدا بەدەستی هێنا، لـە هەریـەك لـە فەرەنسـا و ئـەڵمانیا و سوید و هۆڵەندە و دەوڵەتانیتردا بەدەستی هێنا.
زیاد لەوە، ئەو ڕۆمانـە کرایـە شـانۆگەری و بـوو بـە یـەکێك لـە بـەناوبانگترین ئـەو شانۆگەریانەی لـە شـانۆ ئەمەریکیەکانـدا نمـایش کـران. بێشـومار کـۆپی لـێ بـڵاو بوویەوە کە چەندین گرووپی شـانۆیی کـە بـەدەوری جیهانـدا دەسـووڕانەوە، پێـی هەڵدەستان. جارێکیتریش خاتوو ستۆ هیچ شتێکی دارایی لەمـە دەسـت نەکـەوت،

لەبەرئـەوەی ئـەو یاسـای چـاپ و بڵاوکردنەوەیـەی سـاڵی ١٨٥٢ بـاو بـوو مـافی سەرپەرشـتیکردنی گـۆڕینی ڕۆمانەکـەی بـۆ شـانۆگەری پـێ نـەدەدا. بەهـەرحاڵ، خاتوو ستۆ بەباشی نەدەزانی بکرێتە شانۆگەری و ڕازی نەبوو مۆڵـەت بـە گـۆڕینی کتێبەکەی بۆ شانۆگەری بدات.

بەگشتی ئەو ناوبـانگ و قازانجـەی "کوخەکـەی مـام تـۆم" بەدەسـتی هێنـا، هـیچ کتێبێکیتر لە مێژووی مرۆڤدا بەدەسـتی نـەهێناوە، جگـە لـە تـەورات کـە ژمـارەی پێوانەیی لە فرۆشدا شکاندووە. ئەم کتێبە بوو بە موڵکی ملیۆنان کەس لە وێنـەی جۆراوجۆری خـەیاڵی، شـانۆیی، شـیعری و مۆسـیقی، هـەروەك بـەدەوری جیهانـدا سووڕایەوە.

کاریگـەریی کتـێبی "کوخەکـەی مـام تـۆم" لەسـەر ڕا و سـۆزی هاوچـەرخ وەك فرۆشەکەی گەورە بوو. پاشتر کوڕی خاتوو ستۆ و کوڕەزاکەی خرۆشـی خـەڵك بـۆ کتێبەکە ە کردنەوەی ئاگرێکی گـەورە وەسـف دەکـەن کـە "ئاسـمانی بـە لافـاوی سـۆزە جۆشـاوەکان گەشـاندەوە، هـەموو شـتێکی لەبـەردەم خۆیـدا ڕامـاڵی و ئۆقیانووسیشـی بـڕی، تـا واهاتـە پـێش چـاو کـە جیهـان هـیچ شـتێکیتری نیـە لەبارەیەوە بدوێ ئەو کتێبە نەبێ".

بـەڵام گـەردەلولێکی سەرشـێت لـە تـووڕەیی و بۆڵـەبۆڵ و تانـە و تەشـەر لـە باشوورەوە هەڵیکرد، کە دانەری "کوخەکەی مام تـۆم"ی کـردە ئامـانج. سـتوونی ڕۆژنامـەکان پـڕ بـوون لـە ڕەخنـەی دوور و درێژ بەمەبەسـتی دەرخسـتنی وێنـای هەڵـەی مسـز سـتۆ بـۆ کۆیلایـەتی. ڕۆژنامەیـەك کتێبەکـە بـە "بەدڕەوشـتیەکی تاوانکارانە بۆ ئەرکە باڵاکانی خەیاڵ" وەسف دەکـات. خـاتو سـتۆ خـۆی هـەزاران نامەی تووڕە و جوێننامەی پێ گەیشت.

لە سەرەتادا کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" بەئازادی لە باشوور بڵاو دەبوویەوە، بەڵام دوای ئەو کاردانەوە توند و سەختە، بوونی کۆپیەکی ئەو کتێبە خۆی لە خۆیدا مەترسیەکی گەورە بوو.

شتێکی گاڵتەجارانەیە کە بگوترێ خاتوو ستۆ خۆی ئومێد و باوەڕی وابوو رۆمانەکەی "کوخەکەی مام تۆم" دەشێ ببێتە ئامرازێك بۆ چارەسەری کێشەی درێژخایەنی کۆیلایەتی. کاتێك هاوڕێیەکی باشووری ئەو کتێبەی خوێندەوە، بۆی نووسی "کتێبەکەت دەبێتە موسڵیحێکی مەزن کە باشور و باکور یەکدەخات"..

خاتوو ستۆ لە کتێبی "کوخەکەی مام تۆم"دا هەوڵی داوە دادپەروەرانە وێنەی هەردوو لایەنی کێشەکە لە مشتومڕی کۆیلایەتیدا بخاتە روو.. لەو کتێبەدا وێنەی دوو خاوەن کۆیلە پیشان دەدات، ئەوانیش مستەر شلبی و ئۆگەستین سەینت کلەرین، کە دوو برای باشووریی خاوەن چاکەی گەورەن. رەنگە ئیڤای کچۆڵە، کچی سەینت کلەیر فریشتانەترین منداڵ بێ لە هەموو ئەدەبدا. بەڵام گەورە پیاوخراپ سیمۆن لجری پیاوێکی مولحیدی ویلایەتی ڤێرمۆنتە. کتێبەکە قسە لە دوو کەسایەتیتر دەکات لە نیو ئینگلاند، ئەوانیش خاتوو ئۆفێلیا و مارکسن. خاتوو ستۆ ئەوەی بەڕوونی باس کردووە کە خەڵکی باکور هۆشیاریی پێویستیان لەبارەی زنجیەکان نیە. لەگەڵ ئەوەیشدا لەوانەیە بەهەندێ لێڵیەوە بەزەییان پێیاندا بێتەوە.

بەڵام ئەم دانپێدانانە بەس نەبوو بۆ رازیکردنی بێزاریی باشور. لە هەموو لاوە هێرش دوای هێرشی توند دەهات و خاتوو ستۆ بە شێواندنی راستیەکان تۆمەتبار دەکرا. بۆ نموونە باسیان لەوە دەکرد کە یاساکانی باشور وەك چۆن لەئاست کوشتنی سپیپێستەکاندا توند و مولزیمن، بەهەمان شێوە لەئاست کوشتنی کۆیلەیشدا توند و مولزیمن. رێنماییەکان جیاکردنەوەی منداڵانی خوار دە ساڵ لە

دایکیان قەدەغە دەکەن. هەروەها کۆیلەیش وەك موڵکە گرانبەهاکانە و نابێ بە فۆر بەخراپی مامەڵە بکرێ.

بەڵام لە باکور کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" پێشوازیەکی تێکەڵی لێکرا: تەنانەت ئەوانەیش رقیان لە کۆیلایەتی بوو ئەم کتێبەیان تۆمەتبار دەکرد، ئەویش لەترسی ئەوەی ببێتە مایەی هەڵگیرسانی شەڕێکی ناوخۆ. ئەو خەڵکانەی باکوریش کە وەبەرهێنانیان لە کاری لۆکەی باشوور دەکرد، لەترسی لەدەستچوونی کەسابەتەکەیان سەرکۆنەیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەیشدا خوێنەرانی باکور بەگشتی "کوخەکەی مام تۆم"یان بە تۆمەتبارکردنێکی راست بۆ سیستمی کۆیلایەتی دادەنا. کاتێك جگە لەوە هیچیتر بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی نەکرا، ویژدانی نەتەوەیی و غەریزە مرۆڤایەتیەکان بزوان و ئەم چیرۆکەیان وروژاند، جا ئاهەنگی دەربڕینە ئاینیەکانی ئامانجی خۆی پێکا، کە دەیوست بڵێ کۆیلایەتی لە رۆحی مرۆڤ دەدات.

یەکێك لە ئاسەوارەکانی "کوخەکەی مام تۆم" ئەوە بوو ئیتر پەسەندکردنی یاسای کۆیلە هەڵاتووەکان بوو بە مەحاڵ و هاوکارینەکردن لەتەك یاساکە، لە دەرەوەی باشور کۆدەنگی پەیدا کردو. لەوەیش توندتر، ئەو کتێبە سۆزێکی زۆری دژی کۆیلایەتی تاودا بەشێوەیەك هەڵگیرسانی شەڕێکی ناوخۆ بکاتە شتێکی حەتمی. بەدڵنیاییەوە ئەو کتێبە هۆی هەرە گەورەی ئەو پێکدادانە بوو کە بە کارەسات تەواو بوو. دەشێ ئەبراهام لنکۆڵن دەرکی بەمە کردبێ، هەربۆیە کاتێك مسز ستۆ ساڵی ١٨٦٢ سەردانی کۆشکی سپی کرد و تەوقەی لەتەك کرد، گوتی "ئەمە ئەو خاتوونە بچوکەیە کە ئەو کتێبەی نووسی و بووە هۆی ئەم جەنگە گەورەیە". چارلز سەمنەریش باوەڕی وابوو "ئەگەر کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" نەنووسرایە، ئەبراهام لینکۆڵن بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵنەدەبژێردرا.

هەرچی بەهای ئەدەبیی "کوخەکەی مام تۆم"ە، لە سەرەتادا بایەخێکی روکەشانەی پێدرا، ئەگەرچی رەخنەگران پاشتر قسەیان لەسەر کرد. مێژوونووس جەیمس فۆرد رۆدز پێی وایە "شێوازەکەی عادییە، زمانەکەیشی زۆربەی جار کرچ و کاڵ و شپرز و بێ رەونەقە، هەندێ جاریش بەزۆر لەخۆکردنەوە دەگۆڕێ بۆ زمانی عامی و گاڵتەجاڕی".

رەخنەگرێکی باشوری کە ستارك یۆنگە قسە لەسەر بەکارهێنانی شێوەزاری زنجیەکان لەلایەن مسز ستۆوە دەکات و دەڵێ "(ئەو) زۆر لە رەشپێستانی دیوە، بەڵام وای لێ نەکردوون قسە بکەن. ئەو هەستی بە کاریگەری و زیندوویی زمانەکەیان نەکردووە".

ڤان ویك بروکس ئاماژە بۆ "کەموکوڕییە رۆشنەکانی کتێبەکە لە رووی رێکخستن و سۆزەوە" دەکات. لەگەڵ ئەوەیشدا بە "بەڵگەنامەیەکی ئینسانیی مەزن" وەسفی دەکات.

رەخنەگرێکیتر بەناوی خاتوو کاپارین ئەنتۆنی پێی وایە "کوخەکەی مام تۆم چیرۆك و وێنەی ئەخلاقی ئەمەریکییە و ... بەبێ گومان شایستەی رێزگرتنێکی باڵایە. ئەوە روونە مسز ستۆ سەرسامە بە باشور. لەکاتێکدا رقی لێیە لەبەرئەوەی لایەنگری کۆیلایەتییە، دەبینین بە گەرمی و سۆزەوە وێنەی کەشوهەواکەی دەکێشێ. پێشڕەوی نووسەرانی ئەمەریکییە لە باسکردنی پرسی زنجیەکان بەشێوەیەکی لێبڕوانە، کە بیری لە چیرۆکێك کردۆتەوە پاڵەوانەکەی پیاوێکی رەشپێستە. ئەگەرچی کتێبەکە بۆ ئامانجێکی ئەخلاقی نووسراوە، دانەر لە پەلکێشبوونی بەدوای گێڕانەوەی چیرۆکەکەیدا، هەندێ جار ئامانجە بنەڕەتییەکەی بیر چووە".

لەرووی مێژووییشەوە بێگومان ئەم رۆمانە بایەخێکی مەزنی هەیە زیاتر وەك بەڵگەنامەیەکی کۆمەڵایەتی تا وەك کارێکی هونەری ئەدەبی یان کلاسیکی.

بەدڵنیاییەوە وەك "كاو" دەڵێ، كتێبەكە لە چیرۆكێك زیاترە و "پڕە لە كوشتن و بڕین و شەهوەت و ئەوینی حەرام و خۆكوشتن و ئەشكەنجەدانی دڵڕەقانە و پیسی و مەستی.. ".

كتێبی "كوخەكەی مام تۆم" دەستبەجێ ناوبانگێكی جیهانی بۆ خاتوو ستۆ پەیدا كرد. هەر ساڵێ پاش ئەوە سێ گەشتی بۆ دەرەوە ئەنجامدا، تێیدا سەردانی هەریەك لە ئینگلتەرا و ئسكوتلەندەی كرد، سەدان لە خانەدانان و ئەندامانی بنەماڵەی شاهانە و گەورە پیاوانی بینی و پێشوازییان لێكرد، لەنێویاندا شاژن ڤیكتۆریا و شازادە ئەلبێرت و دیكنز و جۆرج ئەلیۆت و كنگزلی و روسكین و ماكولی و گلادستۆن.

لەو گەشتە سەركەوتووەدا خەڵك بە حەماسێكی زۆرەوە پێشوازییان لێكرد و بە قارەمانی هەژارانیان دەبینی.. هیچ نووسەرێكی ئەمەریكی پێشتر ئەو ورووژاندنە گەورەیەی دروست نەكردووە و بەو گەرمییە لە دورگە بەرتانیەكان پێشوازی لێ نەكراوە.

خاتوو ستۆ زۆر هەوڵیدا بیسەلمێنێ ئەو وێنەیەی لە كتێبەكەیدا بۆ كۆیلایەتی كێشراوە، هیچ زیادەڕەویەكی تێدا نیە و "زادەی درۆ و دەلەسە" نیە وەك كە هەندێ كەس تۆمەتباریان دەكرد بەوەی ئەو درۆ و دەلەسانەی كەڵەكە كردووە تا بیانكاتە كلیلێك بۆ كوخەكەی مام تۆم كە بەگوتەی ستۆ "هەموو راستیە ئەسڵیەكان و ئەو رووداو و بەڵگەنامانە لەخۆ دەگرێ كە چیرۆكەكەی لەسەر بنیات دەنرێ، لەگەڵ هەندێ چیرۆكی خۆش و كاریگەر و گونجاو بۆ چیرۆكەكەی مام تۆم".

ئەم كتێبە بۆ چوار بەش دابەش دەبێ، سەرەتا بە وەسفكردنی كەسایەتیەكان دەست پێدەكات تا بیسەلمێنێ ئەوانە كەسانی راستەقینەی ژیانی واقیعین. بەشی دووەم باسی یاساكانی كۆیلەكان دەكات و ئاماژە بەوە دەكات یاساكانی ئێستا

کۆیلە ناپارێزن. پاشان دێتە سەر گێڕانەوەی ژیانی تاك تاکی کۆیلەکان و شکستی ڕای گشتی لە پاراستنی کۆیلە و قسەکردن لەسەر ئاسەواریی نائەخلاقیی کۆیلایەتی لەسەر کارە ئازادەکان لە باشور. دواجار بەهۆی هەڵوێستی پەرت و ناکاریگەریان بەرانبەر کۆیلایەتی، پەنجەی تۆمەت بۆ کەنیسەکانیش درێژ دەکات.
بڵاوکراوەی "کلیل" لاواز بوو، عەیبی گەورەیشی ئەوە بوو مادەکانی پاش دەرکەوتنی "کوخەکەی مام تۆم" کۆکرانەوە و زۆر لەو مادەیە لەسەر وتی وتی دامەزرابوو. لەبەرئەوە سەرکەوتن جەماوەری بەدەست نەهێنا و هێزێکی ئەوتۆی نەخستە سەر ڕۆمانی "کوخەکەی مام تۆم" زیاد نەکرد. وەك نموونەیەکیش لەسەر دادپەروەریی ئیلاهی، ئەو بڵاوکارە ئینگلیزیەی "کوخەکەی مام تۆم"ی دزی و لە ئینگلتەرا چاپی کرد، پەنجا هەزار دانەی لە "کلیل" چاپ کرد بەتەمای ئەوەی بەختێکیتر بێ، بەڵام بووە مایەی هەڵشکان و مایەپوچبوونی.
مسز ستۆ بەقەڵەمە بەبرشتەکەی کتێبیتری دەربارەی کۆیلایەتی نووسی، ئەویش ڕۆمانی درێد Dred بوو، کە "چیرۆکی زەلکاوە گەورە شوومەکەیە" و ساڵی ١٨٥٦ بڵاو کرایەوە و لە چوار هەفتەدا سەد هەزار دانەی لێ فرۆشرا، ئەگەرچی نەکەیشتە ئاستی ناوبانگی "کوخەکەی مام تۆم".
بیرۆکەی دانەر لە "درێد"دا بریتی بوو لە ئاسەواری خراپی سیستمی کۆیلایەتی لەسەر پیاوی سپی، واتە هەریەك لە خاوەن زەوی و ئەو سپی پێستە هەژارانەی لەوەرگەکانیان بەئیجار دەگرت. تێکەڵکردنی هەردوو ڕەگەز و ئەنجامە خراپەکانی لەسەر هەموو کەس شتێکی درامی بوو. ڕۆمانی درێد پڕە لە وێنەی هەژارانی سپی پێست و ژیانی جوتیاران و هەروەها ئەو مۆچیارانەی داوای بوژاندنەوەی هەژارانیان دەکرد. بەڵام کەسایەتیەکی بنچینەیی وەك مام تۆمی تێدا نەبوو، کە سۆزی خوێنەر بەدەست بێنێ.

خاتوو ستۆ لەوکاتەوە کە تاکۆتایی ژیانی کە ٥٣ ساڵ بوو، لێشاوێکی بێکۆتای لە ڕۆمان و چیرۆك و ژیاننامە و وتار و بابەتی ئاینی نووسی. بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ، تێکڕای بەرهەمی نووسینی لانیکەم یەك کتێب بوو لە ساڵێکدا. لەکاتی شەڕی ناوخۆدا گرنگترین بەشداریی ئەو بریتی بوو لە وتارێك بۆ ئافرەتانی ئینگلتەرا و تێیدا بیری خستنەوە کە بەر لە هەشت نۆ ساڵ چ پێشوازیەکیان لە کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" کرد و سەرزەنشتی دەکردن لەسەر هاوسۆزییان لەگەڵ باشور و کارەکانیان پاش هەڵگیرسانی جەنگەکە.

لەئاکامی ئەو وتارەدا ژمارەیەك کۆبوونەوەی گەورە لە دورگە بەریتانیەکان گرێ دران بەمەبەستی گۆڕینی رای گشتیی باڵادەست بەرەو پرسی یەکگرتن. لەبەرئەوە، دەشێ وتارەکەی خاتوو ستۆ رۆڵێکی گرنگی لە رێگرتن لە دەستێوەردانی ئینگلیزی گرتبێ لەو وەختەی دەکرا ئەو دەستوەردانە باکوریەکانی ئەمەریکا تووشی مەترسی بکات.

لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی پێگەی هاریت بیچەر ستۆ لە مێژوودا، کیرك مۆنرۆ دەڵێ خاتوو ستۆ "تەنها لە پێشی ریزی پێشەوەی ئافرەتانی جیهانەوە ناوەستێ، بەڵکو لە پێکهێنانی چارەنووسی گەلی ئەمەریکیدا لە ماوەیەکی زۆر شلۆقی مێژوویاندا هەژموونی لە هەر کەسێکیتر بەهێزتر بوو... بەدڵنیاییەوە هیچ کەسێك ناتوانێ بەتەنیا کۆیلایەتی قەدەغە بکات، هیچ کەسێکیش ناکرێ ئەوە بکات،". مۆنرۆ لەبارەی ئەو رەگەزانەی سەرکەوتنی کۆتاییان بەدیهێنا دەڵێ "بەڵام گەورەترینی ئەو رەگەزانە و بەهێزترینیان بریتییە لە کوخەکەی مام تۆم".

رەنگە کۆتا نرخاندن کە بکرێ پاش سەدەیەك بۆ کتێبی "کوخەکەی مام تۆم" بکرێ، ئەوە بێ ژنە دانەرێکیتر بەناوی کۆنستانس رورك کردوویەتی کە دەڵێ " ئەو کتێبە سەرباری تێکشکانی بەهۆی ئەو هات و هاوارەی پاشتر روویدا،

سەرباری کەموکوڕیەکانی لە هەندێ شتی بنچینەییدا، بەڵام هێشتا پارێزگاری لە سیفەتگەلێك کردووە کە وەك پەیامێك بۆ سەروو پێگەی هاوچەرخی خۆی بەرزی دەکاتەوە، سیفەتگەلێك تۆمەتی زێدەڕۆییکردن کە تۆمەتێکی ئاسان و ئاساییە، پوچەڵ دەکات. ئەوە روونە کە ئەم کتێبە واقیعیەتی راستەقینەی تێدا نیە، بەڵام رەنگە پێویست بێ هەرگیز حوکمی واقیعیبوونی بەسەردا نەدەین. ئەوە روونە ئەم کتێبە ئەو تۆکمەیی و روونبینیەی تێدا نیە کە بۆ نووسینی مەزن پێویستن. عاتیفیەتەکەی هەر ئازاد نیە بەتەنیا، بەڵکو لە رووی عەقڵیەوە رەق و وشك و بەگوێرەی هەڵبژاردن نەخۆش و عاتیفییە. لە پێشبڕکێیەکی بێکۆتادا دەڕوا و پێدەچێ ئەوەیش زادەی هیستریا بێ. بەڵام هێزی دروستی ئەو عاتیفەیە فراوانیی پەلهاویشتن و هاوسەنگیی حساب بۆنەکراوی بەرهەم هێناوە... هەروەها بەر لە هەموو شت بە جوڵەی کاریگەری بەرەو ئامانجگەلێکی نەزانراو لە پانتاییەکی دوور و درێ دەناسرێتەوە، کە دەبێتە بیرۆکەیەکی بەهێز بۆ گێڕانەوەی هەرە مەزن کە لێرەدا بە عاتیفەی قووڵ باس کراوە، لەبەرئەوەی سەرکێشیکردن هەرگیز ئازاد نیە، بەڵکو هەمیشە لە کۆتایدا دێتە برین یان بەرەو مەترسی پەلکێش دەکرێ".

فان ویك بووکسیش دەڵێ، "کوخەکەی مام تۆم" لەو کەشوهەوایەی تێیدا نووسراوە گوێزراوەتەوە، سەرباری ئەوەیش وەك وێنەیەکی مەزنی میللی بۆ سەردەم و نەتەوەیەك مایەوە.



## ٧- "سەرمایە"

## کارل مارکس Karl Marx

### عەرافی چینی کرێکار

فریدریك ئەنگڵز لە لاواندنەوەی کارل مارکسدا دەڵێ "مارکس، بەر لە هەموو شت، کەسێکی شۆڕشگێڕ بوو، ئامانجی مەزنی لەژیاندا ئەوە بوو بەم یان بەو شێوە، هاوکاری بکات بۆ تێکشکاندنی کۆمەڵگەی سەرمایەداری و دامەزراوەکانی ئەو حکومەتەی دروستی کردووە". بەم دەربڕینە کورتە وشانە یاریدەدەر و قوتابی و دڵسۆزترین هاوڕێکانی، هێزی بزوێنەری ژیانی ئەو مرۆڤە یاخییە کۆمەڵایەتییە بەناوبانگە چڕ دەکاتەوە.

مارکس لە سەردەمێکی پڕ لە کێشمەکێشدا لەدایك بوو. کەشوهەواکە بە یاخیبوون و دڵەڕاوکێ بارگاوی بوو. هێشتا یادی شۆڕشی فەرەنسی لە خەیاڵدا مابوو، ڕوودانی شۆڕشێکیتریش نزیك بوو. دە ساڵی پاش ئەوە، بە سەختیەکی سەرتاسەری و بەرفراوان و بێزاری و ڕەخنەگرتن لە حکومەتی ئارا جیا دەناسرێتەوە. ساڵی ١٨٤٨ ئەم حاڵەتە گەشەی کرد بۆ هێزێکی تەقینەوە و شۆڕشەکان لە ئەوروپا هەڵگیرسان. تەنانەت لە ئەوروپا بزوتنەوەی کرێکاران سەری هەڵدا و داوای بەشدارکردنی لە سیاسەت و هەڕەشەی لە حکومەتی ئەوکات دەکرد. لە هەموو جێگەوە پاڵەپەستۆ دروست بوو بەمەبەستی سووککردنی ئەو مامەڵەی خراپەی لە بنەما نوێیەکەی کرێکارانەوە سەرچاوەی گرتبوو و هەڵوەشاندنەوەی پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی. کاتەکە زۆر لەبار بوو بۆ مەیلە تێکدەرانە و دژ بە کەنیسەکەی مارکس.

مارکسی بچوک یاسا و فەلسەفەی لە بۆن و بەرلین خوێند بەمەبەستی بەدەستهێنانی پۆستی ئوستادی. بەڵام بەهۆی بۆچوونە بەپێچوپەنا و رووڵە گەشەکانیەوە دەرگا بەڕوویدا داخرا و رووی کردە رۆژنامەوانی. رۆژنامەیەکی نوێ لە ساڵی ١٨٤٢ دامەزرا بەناوی Rheinische Zeitung و مارکس بوو بە یەکەم نووسەری و زۆری نەبرد بوو بە سەرنووسەری. بەهۆی هێرشی چەندبارەی رۆژنامەکە بۆ سەر حکومەتی پروسیا و ئاراستە پەرگیرەکەی بەگشتی، تەمەنی هێشتا کەمێك لە ساڵێك زیاتر بوو لە دەرچوون راگیرا.

مارکس چوو بۆ فەرەنسا تا سۆشیالیزم بخوێنێ و بۆ رۆژنامەیەکیتری تەمەنکورتی دەنووسی بەناوی Franco-German Year Books. لەوێ ئاشنایی لەگەڵ گرنگترین نوێنەری فیکری سۆشیالیزم (ئیشتراکیەت) و کۆمۆنیزم (شیوعیەت) پەیدا کرد. گرنگترین رووداوی ژیان و ئایندەیشی سەرەتای هاوڕێیەتی بوو لەگەڵ فریدریك ئەنگلز، کە پیاوێکی ئەڵمانیی تا رادەیەك دەوڵەمەند و کوڕی خاوەن کارگەیەکی لۆکە بوو، ئەویش وەك مارکس لایەنگری بەها ئیشتراکیەکان بوو. ئەو دۆستایەتییەی مارکس و ئەنگلز بەدرێژایی ژیانی بەردەوام بوو.

ئەنگلز ساڵی ١٨٤٥ بنچینەی کتێبی "سەرمایە" Das Kapitalی مارکسی دانا، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی کتێبی "دۆخی چینی کرێکار لە ئینگلتەرا".

مارکس لە وروژاندنی بۆچوونەکان دژی حکومەتی پروسی بەردەوام بوو، دەسەڵاتدارانی فەرەنسی بە بیانییەکی چارە نەویستراویان دانا و لە وڵات وەدەریاننا. پەنای بردە برۆکسل و سێ ساڵ لەوێ مایەوە، پاشان بۆ ماوەیەکی کورت گەڕایەوە ئەڵمانیا، بۆ جاری دووەم دوور خرایەوە و لەکاتی شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨دا گەڕایەوە پاریس. لەو ساڵەدا، بەهاوبەشی لەگەڵ ئەنگلز نامیلکەی بەناوبانگی "مانیفستۆی شیوعی"یان نووسی و بڵاو کردەوە، کە یەکێکە لە کارە

ئەدەبییە پەرگیر و زۆر کاریگەر و توندوتیژەکان کە لە چاپخانەکان دەرچووبێ.
نامیلکەکە قسەکانی بە هاوارێکی هاندان بۆ شۆڕش کۆتایی دێنێ کە دەڵێ:
"کۆمۆنیستەکان پێیان وایە شاردنەوەی را و نیازەکانیان شتێکی رووکەشانەیە. ئەوان راشکاوانە بڕیارد دەدەن کە بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ ژێراوژوورکردنی تەواوی سیستمی کۆمەڵایەتیی هاوچەرخ ئامانجەکانیان بەدی نایەن. دەبا چینە حوکمڕانەکان لەبەردەم شۆڕشی کۆمیۆنیزمدا بلەرزن. کرێکاران جگە لە کۆت و زنجیرەکانیان هیچ لەدەست نادەن، هەموو دنیایشیان لەبەردەمدایە تا بیبەنەوە. کەواتە، کرێکارانی جیهان یەکگرن!".
مارکس رووی لە هەرکوێ بکردایە، کەسێکی پڕ چالاکی و وروژێنەرێکی شەڕەنگێز بوو، بزوتنەوە کرێکاریەکانی رێك دەخست و سەرنووسەریی رۆژنامە کۆمۆنیستیەکانی دەکرد و یاخیبوونی بەرپا دەکرد.
تێکچوونی شۆڕشە ئەورووپیەکان لە ساڵانی ١٨٤٨ و ١٨٤٩ وای کرد دنیا زۆر بەرتەسك بێتەوە و جێگەی مارکسی تێدا نەبێتەوە. لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا چوو بۆ ئینگلتەرا و رۆژە کۆتاییەکانی ژیانی لە لەندەن بەسەر برد. بەر لەوە هاوسەرگیری لەگەڵ جینی ڤۆن ویستفالین کچی فەرمانبەرێکی پروسی کرد، نزیکەی چل ساڵ وەك شەریکێکی بەوەفا لەگەڵیدا مایەوە. ماوەکانی هەژاریی نووتەك و نەداری و بێچارەیی لەگەڵدا بەش کرد و لە شەش منداڵەکانیان تەنیا سێیان ژییان. دوان لەوانەیش خۆیان کوشت.
گومان لەوەدا نیە سێ ساڵ سەختیی ژیان بەسەر بۆچوونەکانی مارکسدا رەنگی داوەتەوە و لەو رق و هەناسەساردیەی لە نووسینەکەیدایە بەرپرسە. زۆرجاریش ئەوەی خێزانەکەی مارکسی لە مردنی راستەقینە لەبرسا رزگار کردووە یارمەتییە داراییەکانی فریدریك ئەنگلز بووە. تاکە داهاتی مارکس یەك جونەیە بوو لە هەفتەیەکدا کە لە رۆژنامەی نیویۆرك تریبۆن New York Tribon

وەریدەگرت، لەگەڵ ئەو پاداشتە پچرپچڕەی لە نووسینی هەندێ بابەتی کورت کورت دەستی دەکەوت.

سەرباری نەهامەتی و قەرزاری و نەخۆشی و نەداری کە بەردەوام بەرۆکیان گرتبوو لە ناوچەی پیس و پۆخڵی سۆهۆ Soho لە لەندەن کە تێیدا دەژیا، وەك نەریتی هەمیشەی خۆی، ساڵ بەساڵ لە پێشڕەویکردنی لە پرسی ئیشتراکیەتدا کۆڵی نەدەدا. سەردانی مۆزەخانەی بەریتانی دەکرد و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کە هەندێ جار دەگەیشتە شازدە سەعات لە رۆژێکدا دەمایەوە و بڕێکی زۆر مادەی خاوی بۆ کتێبەکەی، واتە کتێبی "سەرمایە" Das Kapital کۆ دەکردەوە. بە حسابنەکردنی ئەو ماوانەی بەهۆی نەخۆشی یان کاریترەوە دەستی لە نووسین هەڵدەگرت، دانانی ئەو کتێبە زیاتر لە هەژدە ساڵی خایاندووە. هەرچی ئەنگڵزە کە لەو ماوەیەدا ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەی مارکسی لەئەستۆ گرتبوو، لە تەواوکردنی کتێبەکە بێئومێد بوو. ئەو و مارکس پێکەوە بە "کتێبە نەفرەتییەکە" ئاماژەی بۆ دەکەن. مارکس دانی بەوەدا دەنا کە ئەو کتێبە "کابووسێکی راستەقینەیە".

گەورەترین رووداو لە ژیانی مارکس لەو چەند ساڵەدا دامەزراندنی یەکەمین کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بوو بۆ کرێکارانی پیاو لە ساڵی ١٨٦٤، کە ئێستا بە بەناوی کۆمۆنەی یەکەم "الدولیة الاولی" ناسراوە. ئەوە کۆششێکی گەورە بوو بۆ کۆکردنەوەی چینی کرێکار لە هەموو جیهاندا لە کۆمەڵەیەکی نێودەوڵەتیدا. ئەگەرچی مارکس لەناو ئاپۆرای جەماوەردا نەبوو، بەڵام هێزی بزوێنەر بوو لەپشت تەختەوە و زۆربەی نووسراوەکانی کۆمەڵەکە و ناونیشان و پێڕەو و بەرنامەکەی ئەو دەینووسین. بەڵام کێشمەکێشی ناوخۆیی لەسەر سەرۆکایەتی و ئەو کێشەیەی پاش شکستی یاخیبوونەکەی پاریس لە ساڵی ١٨٧١ کۆمەڵەکەی تێکەوت، بوونە مایەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکە. دوای ئەو کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی دووەم

(کۆمۆنــەی دووەم) هــات و نوێنەرایــەتیی گرووپــە ئیشــتراکییە خۆرئاواییــەکانی دەکرد. پاشان کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی سێیەم یان کۆمینتێرن Comentern بۆ دنیای کۆمۆنیزم.

سەرەنجام ماوەی دانانی کتێبی "ســەرمایە" تــەواو بــوو. ئــەوە بــوو لــە کۆتاکـانی ساڵی ١٨٦٦ دەستنووسی بەشی یەکەم نێردرا بۆ هامبۆرگ. لە سەرەتاکانی ساڵی دوای ئەوەدا کتێبەکە بەچاپکراوی بەزمانی ئەڵمانی لە چاپخانە دەرچوو. تـا دوای نزیکەی بیست ساڵ وەرگێڕانی بە زمانی ئینگلیزی نەبوو. یەکەمین وەرگێرانـی بـۆ زمانێکیتر لەبەر تیشکی رووداوەکانی ئایندەدا، بـە زمـانی رووسـی بـوو لـە سـاڵی ١٨٧٢.

لە سەردەمی مارکسدا ئینگلتەرا یەکەمین شانۆی کارەکانی رژێمی سـەرمایەداری (کاپیتالیزم) بـوو. لەبەرئـەوە نزیکـەی هـەموو ئـەو نموونانـەی بـۆ روونکردنـەوەی تیـۆرە ئابووریـەکانی بـەکاری هێنــاون، لــەو مەملەکەتــە وەرگــیراون. نموونــە سامناکەکان زۆر بوون، چونکە رێکخستنی سەرمایەداری لە ناوەڕاستی سـەردەمی ڤیکتۆریـدا لـە خـراپترین دۆخیـدا بـوو، بـاری کۆمەڵایـەتیی کرێکـارانی کارگـەکان بەرادەیەك خراپ بوو وەسفکردنی دژوارە. لەو رووەوە مارکس لە توێژینەوەکانیـدا پشتی بە راپۆرتە رەسمییەکانی پشکنەرانی حکومەت دەبەست، بۆیە راستیەکانی بەوردی لە کتێبی "سەرمایە"دا خستۆتە روو.

ژنــان لــە تۆکەندەکانــدا بــەهێزی شــانەکانیان کەشــتیەکانیان بەدرێــژایی رێگــە رادەکێشا. هەروەك چۆن وڵاخ بە عەرەبانەوە دەبەسترا بۆ گواستنەوە خـەڵوز بـۆ دەرەوەی کانەکانی بەریتانیا، هەر ئاوا عەرەبانـە لـە ژنانیش دەبەسـترا. منـداڵان بوون لە تەمەنی نۆ یان دەساڵیدا لە کارگەکانی چنیندا رۆژانـە بـۆ مـاوەی پـازدە سەعات کاریان دەکرد. کاتێك نۆرەی کـارکردنی شـەوانە داهـات، ئـەو پێخەفانـەی منداڵانیان تێیدا دەخەوتن هەمیشە گەرم بوون و سارد نەدەبوونەوە، لەبەرئـەوەی

بەتۆرە بەكار دەهێنران. نەخۆشیی سیل و زۆر نەخۆشیتری شوێنە جەنجاڵەكان چرنوكی خۆیان لێ گیر كردن و ژمارەیەكی زۆری لێ كوشتن.

دیارە تەنیا ماركس نەبوو كە ناڕەزایی دژی ئەم دۆخە ئابووریە دەردەبڕی، زۆر نووسەریتری هەستناسكی تایبەت بە مەسەلە ئینسانیەكانی وەك چارلز دیكنز و جۆن رسكین و تۆماس كارلیل بەحەماسێكی زۆرەوە زۆر شتیان دەنووسی و داوای چاكسازییان دەكرد. سەرەنجام پەرلەمان گەرم كرا تا یاسایەك بۆ چاكسازی دەربكات.

ماركس بە شیكردنەوە زانستییەكەی بۆ پرسە ئابووری و كۆمەڵایەتیەكان درەوشایەوە. وەك ئەنگلز دەڵێ "وەك چۆن داروین یاسای پەرەسەندنی لە سروشتی ئەندامیدا دۆزیەوە، ماركسیش یاسای پەرەسەندنی لە مێژووی ئینسانیدا دۆزیەوە". ماركس باس لەوە دەكات كە دەكرێ دیاردە ئابووریەكان "بەهەمان وردیی زانستە سروشتیەكان تێبینی و تۆمار بكرێن". زۆر ئاماژە بۆ نووسراوەكانی زانایانی زیندەوەرزانی و كیمیا و فیزیا (سروشت) دەكات. دیارە بەئاوات بووە ببێتە "داروینی كۆمەڵناسی" یان رەنگە "نیوتنی ئابووری". ماركس بە شیكردنەوەی زانستیانەی كۆمەڵگە، باوەڕی وابوو ئەوەی دۆزیوەتەوە كە چۆن چۆنی دەكرێ جیهانی سەرمایەداری بگۆڕێ بۆ جیهانێكی كۆمەڵایەتی.

رێگە "زانستی"یەكەی ماركس رۆڵی زۆری بینی لەوەی خەڵك بەبەرفراوانی لێی تێبگەن، لەبەرئەوەی بیرۆكەی پەرەسەندن لە هەموو بوارەكاندا خەیاڵی سەدەی نۆزدەیەمی داگیر كردبوو. تیۆرەكەی لەبارەی ململانێی مێژوویی بە تیۆرەكەی داروین لەبارەی پەیدابوون یان پەرەسەندنەوە دەبەستێتەوە، بەوە سام و هەیبەتی بە بۆچوونەكانی بەخشی. لە هەمان كاتیشدا وای لێكرد، بەبڕوای خۆی، قابیل بە پووچاندنەوە نەبن.

بەبۆچوونی مارکس و شوێنکەوتوانی، بەشداریی گەورەی لە توێژینەوەی ئابووری و مێژوو و باقیی زانستە کۆمەڵایەتیەکانیتردا، پێشکەوتنێکە بۆ بنەمایەك کە ناویان ناوە ماتریالیزمی دیالێکتیك" (المادیە الجدلیە)، کە زاراوەیەکی تەمومژاوییە و لێحاڵیبوونی زەحمەتە ئەگەرچی بەتێروتەواوی لە نووسینی پێشتردا شەرح کراوە. کتێبی "سەرمایە" بەدرێژی ئەم تیۆرە بەکار دێنێ.

مارکس رێگە فەلسەفە دیالێکتیکیەکەی لە فەیلەسوفی ئەڵمانی هیگلٚ Hegel وەرگرت. کە جەوهەرەکەی بریتییە لەوەی هەموو شتێك لە دنیادا لە حاڵەتی گۆڕانێکی بەردەوامدایە و پێشکەوتن بە کارلێکی نێوان هێزە ناکۆکەکان دێتە دی. بۆ نموونە: بە ناکۆکیی سیستەمی ئیستیعماریی ئینگلیزی لەگەڵ شۆڕشی ئەمەریکیدا ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرهەم هات. وەك لاسکی Laski لەوبارەوە دەڵێ "یاسای ژیان بریتییە لە ئەزموونی دژیەکەکان، لەوەیش گەشەکردن بەرهەم دێ".

ئەم دەستپێکە مارکسی بەرە گەڵاڵەکردنی تیۆرەکەی دەربارەی "ماتریالیزمی مێژوویی" (المادیە التاریخیە) یان "تەفسیرکردنی ئابوورییانەی مێژوو" برد. مارکس و ئەنگلز دەڵێن "مێژووی هەموو کۆمەڵگەی ئێستا هیچ نیە جگە لە مێژووی خەباتی چینەکان: ئازاد و کۆیلە، خانەدان و عەوام، سەرگەورە و بنگەورە، سەرۆکی دەزگا و کرێکار. بەکورتی، هەریەك لە زاڵم و مەزلوم بەرانبەر یەکدی وەستان و جەنگێکی بەردەوام لەنێوانیاندا بەرپا بوو".

ئەنگلز لە پەسنی مارکسدا دەڵێ مارکس "ئەو راستییە سادەیەی دۆزیەوە کە لەژێر گژوگیا فیکریەکاندا شاردرابوویەوە. ئەویش ئەوەیە مرۆڤەکان بەر لە هەموو شت و بەر لەوەی چێژ لە سیاسەت و زانست و هونەر و ئاین و شتیتر وەربگرن، پێویستە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك وماڵیان دەست بکەوێ. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ بەرهەمهێنانی پێویستییە زەروریەکانی ژیان و قۆناغی پێشکەوتنی

ئابووریی ئێستای گەلێك یان قۆناغێکی مێژوویی، دەبێتە ئەو بنچینەیەی حکومەت تێڕوانینە یاسایی و بیرۆکە هونەری و ئاینیەکانی ئەو پسپۆڕانەی لەسەر بنیات ناوە".

بەکورتی و بەکوردی، ململانێ لەپێناو خواردن و ماڵ و ماوادا ململانێیەکی زۆر توندە و بڕیار لەسەر هەموو شتێك لە کاروباری مرۆڤدا دەدات.

بەلای مارکسەوە، مێژووی مرۆڤایەتی بەر لە هەموو شت چیرۆکی چەوساندنەوەی چینێکە بۆ چینێکیتر. لە چاخەکانی بەر لە مێژوودا کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی یان ناچینایەتی هەبوو. بەڵام –مارکس دەڵێ– لە چاخە مێژووییەکاندا "چینەکان دروست بوون و ئاپۆرای دانیشتوان یەکەم جار بوونە کۆیلە پاشان بە خزمەتکار (حاڵەتی دەرەبەگی)، پاشان کۆیلە بەکرێ کە هیچیان نەبوو (سەردەمی سەرمایەداری)". مارکس گەیشتبووە ئەو باوەڕەی بە جێبەجێکردنی تیۆری "ماتریالیزمی دیالێکتیکی" هەنگاوی حەتمیی پاش ئەوە یاخیبوونی کرێکاران و "دیکتاتۆریەتی چینی پڕۆلیتاریا" و پاش ئەوەیش مەشاعیەتی موڵکایەتی و گەڕانەوە دەبێ بۆ سیستمی کۆمەڵگەی ناچینایەتی.

مارکس لە کتێبی "سەرمایە"دا پرسەکەی دژی سیستمی سەرمایەداری پەرەپێدا، تا بیسەلمێنێ لەناوچوون و نەمانی ئەو سیستمە شتێکە هیچ گومانی تێدا نیە.

لێرەدا ئەوەی گەڵاڵە کرد کە شیوعیەکان بەگشتی بە دووەم بەشداریکردنی زۆر گرنگی مارکسی لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا دادەنێن، ئەویش تیۆری بەهای کارە (قیمة العمل). لەڕاستیدا ئەم تیۆرە لە بنەڕەتدا زادەی بیری مارکس نەبوو، چونکە ئەو لەسەر ڕێبازی زانایانی ئابووریی لە خۆی بەتەمەنتر دەڕۆیشت، لەوانە ئادەم سمیث و دەڤید ریکاردۆ و جەختی لەوە کرد کە کار سەرچاوەی هەموو بەهاکانە.

مارکس گوتەیەکی بینجامین فرانکلینی باس کردووە کە سەدەیەك پێشتر تێبینی ئەوەی کردبوو "بازرگانی هیچ نیە جگە لە ئاڵوگۆڕکردنی کارێك بە کارێکیتر.

نرخـی هـەموو شـتێکیش بـە کـار دەپێـورێ". پێناسـەی "سـەرمایە"یشـی لـە (سمیث)ەوە وەرگرت کە بریتییە لە "بڕێکی دیاریکراو لە کار، کە تۆپـەڵ کـراوە و وەك یەدەگ پارێزراوە". هەروەها ریکاردۆ پێـی وابـووە "پێویسـتە نـرخ و بـەهای هەر کاڵایەك، بەگوێرەی بڕی ئەو کارەی تێیدا کراوە مەزەندە بکرێ".

مارکس ئەم گوتانەی وەك پێـوەر وەرگـرت و تیۆرەکـەی خـۆی لـەبارەی "بـەهای زیادە" یاخود "زێدە بەها" بنیاتنا و سەرەتا لە وتارێکیـدا بەناونیشـانی "رەخنـە لە ئابووریی سیاسی" (سـاڵی ١٨٥٩) باسـی کـرد، پاشـان پێیـدا چـووەوە و وێنـە پاڵفتەکراوەکـەی لـە کتـێبی "سـەرمایە"دا بـاس کـرد. لـەو رووەیشـەوە کرێکـار خاوەنی هیچ نیە، هەربۆیە تەنیا یەك کاڵای هەیە بیفرۆشێ، ئـەویش کارەکەیـەتی. جا بۆ ئـەوەی لەبرسـا نـەمرێ، پێویسـتە ئـەو کـارەی بفرۆشـێ. بـەپێی سیسـتمە ئابوورییە باوەکە، خاوەنکار ئەم کاڵایە بە هەرزانترین نرخ دەکڕێ. کەواتـە بـەهای راسـتەقینەی کـار زۆر لـەو کرێیـەی لەبەرانبـەری دەدرێ زیـاترە. ئـەو کرێکـارەی خاوەنکـار رۆژانـە چـوار شـلن کرێـی دەداتـێ، ئـەو بـڕە پارەیـە تـەنیا لـە شـەش کاتژمێردا بەدەست دێنێ (واتە نرخی شەش کاتژمێر کارە)، بەڵام داوای لێدەکرێ دە کاتژمێر کار بکـات، کەواتـە خـاوەن سـەرمایەکە ئـەو چـوار سـەعات زیـادە لـە رەنجـی کرێکارەکـە دەدزێ. کاتێـك شـتەکە بـەم شـێوەیە لێکبدرێتـەوە، ئـەوا قازانجەکان و سـوودی گوژمـە پارەکـان و کاغـەزە داراییـەکان و کرێـی ماڵـەکان و شـتی لـەو جۆرانـە، هـەر هـەموویان لـە بـەهای رەنجـی زیـادەی کـاری دزراو لـە کرێکارەوە پەیدا دەبن. کەواتە، دەکرێ بەشێوەیەکی لۆژیکی بەو ئەنجامە بگـەین کە سیستمی خاوەن سـەرمایە هـیچ نیـە جگـە لـە رێگەیـەکی پیاوخراپانـە کـە بـۆ چەوساندنەوە و دزیکردن لە چینی کرێکاران دانراوە.

ئەگەرچی تیۆرەکانی مارکس لەبارەی بەها و زێدە بەها بۆ مەبەسـتی پروپاگەنـدە و هاندان بۆ شۆڕش و راپـەڕین بەنرخ بوون، بەڵام زانایانی ئابووری بەگشتی ئێسـتا

بە ناڕاست و بێبابەخیان دادەنێن. لەو هۆکارانەی وای لێکردوون بێبایەخی بکەن زیابوونی بەکارهێنانی ئامێرەکانە کە جۆری زۆر زیاتر لە بڕی کاری پێویست بۆ کاڵا جیاوازەکان بەرهەم دێنن. فریهۆف دەڵێ "کیمیاناس یەك دۆزینەوە دەربارەی بەپیتیی خاك دەدۆزێتەوە، بەوە بەرهەمی دە ملیۆن کرێکاری کشتیار سەد قات زیاد دەکات. کەواتە ئەوە کیمیاناسەکە بوو کە هێزی بەرهەمهێنانی دروست کرد".

رەخنەگرێکیتر لە پوچەڵکردنەوەی ئەم تیۆرەدا دەڵێ "خەڵك لەپێناو مرواریدا دەچنە قووڵایی، لەبەرئەوەی بەهای مەزنە. بەڵام مرواریەکان گرانبەها نین لەبەرئەوەی خەڵك لەپێناویاندا دەچنە قووڵایی.".

مارکس باسی ئەوەی نەکردوە کە زانست یان تەکنەلۆژیا یا هونەر و رێکخستن، هیچ شتێك بۆ بەها و نرخ زیاد دەکەن.

لەڕاستیدا زانایانی ئابووری سەرەڕای دوو سەدە لە بیرکردنەوە و نووسین لەو بابەتەدا، قەت لەسەر رێگەیەك بۆ پێوانەکردنی بەها رێك نەکەوتوون. پێدەچێ خواست و کەڵك دوو پەسەندترین پێوەر بن لە مەودایەکی فراواندا.

بارزونیش دەڵێ "ئابووریناسیی نوێ تیۆری مارکسی تێکشاند، بەڵام تیۆرێکی زانستی پێشکەش نەکرد کە جێی بگرێتەوە".

هەرچی بیردۆزەکەی مارکسە سەبارەت بە زێدە بەها، بەرەو هەنگاوی پاشتری گریمانەکەی پەلکێشی کرد. هەر سەرمایەدارێك بۆ ئەوەی رووبەڕووی رکابەریی وەحشیانە بوەستێتەوە، هەوڵ دەدات بە رێگەی جۆراوجۆر زێدەبەهای زیاتر دەربهێنێ، وەك درێژکردنەوەی سەعاتەکانی کار، یان کەمکردنەوەی کرێ یان بەکارهێنانی رێگەی راکێشان Stretch out. ئامێری زیاتر و زیاتر بەکار دێنێ تا کار کەم بکاتەوە و بەرهەم خێرا بکات. بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی لە بەڕێوەبردندا پێویستیان بە هێزی جەستەیی کەمتر هەیە. هەروەها دەکرێ لە

جێی پیاوان، کار بە ئافرەت و منداڵان بکات کە کرێیان هەرزانترە. مارکس ئەنجامی ئەمە بەم شێوەیە وەسف دەکات:

"ئەوان کار دەشێوێنن بۆ بەشێك لە پیاو و بۆ ئاستی پارچەیەکی زیادەی ئامێرەکە دایدەبەزێنن. هەر جۆرە جوانیەك لە کارەکەیدا دەکوژن و دەیگۆڕن بۆ زەحمەتکێشانێکی ناخۆش. هەروەها بەهەمان ڕێژەی بوونی زانست لەو کارەدا وەك هێزێکی سەربەخۆ، هێزە عەقڵیەکانی پرۆسەی کارکردنی لێ دوور دەخەنەوە. ئەو بارودۆخە دەشێوێنن کە (پیاوەکە) کاری تێدا دەکات و لە میانەی کارکردنیدا و لە بێنرخبوونیدا، دووچاری ملهوڕیەکی زۆر بێزراوی دەکەن. تەمەنی دەگۆڕان بۆ کاتی کار و ژن و منداڵەکەی لەژێر تایەی پەیکەری سەرمایەدا ڕادەکێشن".

بەم شێوەیە مارکس پێداگری لەوە دەکات کە بەکارهێنانی ئامێرەکان بۆ خێراکردنی بەرهەمهێنان و زیادکردنی، نەك تەنیا لە خۆشکردنی بەختی کرێکاردا شکست دێنێ، بەڵکو ئاسەواری زیانبەخشی هەیە، وەك دروستکردنی بەتاڵە و زیادکردنی بەرهەمهێنانی کاڵاکان لە ئەندازەی پێویست و کوشتنی چێژبینینی کرێکار لە کارەکەی. مارکس درێژەی دەداتێ و دەڵێ:

"ئامێرەکان بوونەتە چەکێك بۆ سەرکوتکردنی مانگرتنەکان کە یاخیبوونی دەوریی چینی کرێکارانە دژی دەسەڵاتی رەهای سەرمایە.. ئامێری هەڵمی هەر لە سەرەتاوە دژبەرێك بووە توانای بە بابای سەرمایەدار بەخشیوە داواکارییە رووڵەزیادەکانی کرێکاران بخاتە ژێر پێ، کە هەڕەشەی بەرپاکردنی قەیرانێکیان لە سیستمی تازە پەیدابووی کارگەکان کرد. دەکرێ مێژوویەکی تەواو لەبارەی ئەو ئامێرانە بنووسرێ کە لە ساڵی ١٨٣٠ەوە بۆ تاکە ئامانجێك پەیدا بوون، ئەویش دەستەبەرکردنی چەکێکە بۆ سەرمایە دژی یاخیبوونەکانی چینی کرێکاران".

بە شێواندنێكی دیاریكراوی تیۆرەكەی مالتۆس، ماركس دەڵێ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان هەمیشە شوێن ڕێگەی سەرمایەداری دەكەون. ئەم سیستمە پێویستی بە "سوپایەكی پیشەسازیی یەدەگ" هەیە بۆ سەردەمەكانی پەلهاویشتنی بەرهەمهێنانی زەبەلاح لەكاتی دروستكردنی پیشەسازیی نوێ یان زیندووكردنەوەی پیشەسازییە كۆنەكان. بەپێی سروشتی شتەكان، پێویستە هێزی زیادەی كار بەرگەی ماوەی درێژ درێژی بەتاڵی بگرێ. پاش ئەوە گەورەترین نەفرەتی سەرمایەداری دەردەكەوێ، ئەویش بێبازاڕی (كساد) و ترس و بیمە. لەو ڕووەوە كرێكاران كرێیەكی وا وەردەگرن كە بەئاستەم بەشی نانەسكی دەكات، بۆیە ناتوانن هەموو ئەو شتانە بكڕن كە كارگەكان بەرهەمیان دێنن، ئەوكاتە بازاڕەكان پڕ دەبن لە شمەك و هێزی كار كەم دەبێتەوە و بێبازاڕییەكی توندی بەدوادا دێ.

سەرمایەدار بۆ ئەوەی بەدوای دەرچە بۆ ساغبوونەوەی شمەكە زۆر و تەپەدراوەكەی لە ئەمبارەكانیدا بگەڕێ، ڕوودەكاتە دەرەوە و هەوڵ دەدات بازاڕ لە دەوڵەتە دواكەوتووەكانی دەرەوەدا بدۆزێتەوە، تا ئەو كاڵایانەیان بۆ بار بكات كە كرێكارەكانی ناتوانن بیانكڕن. ئەم هەوڵە و گەڕان بەدوای مادەی خاودا تا كارگەكانی بتوانن بەبێ وەستان لە كاركردن بەردەوام بن، دەبێتە هۆی پێكدادانە نێودەوڵەتیەكان و جەنگە ئیمپریالییەكان.

ماركس باوەڕی وابوو كۆتا ئەنجامی هەڵپەهەڵپ و هەرا و زنای سەرمایەدار، زیادبوونی چڕبوونەوە (ی سامان لای چەند سەرمایەدارێك) و قۆرخكردنە. لەبەرئەوەی "یەكێك لە سەرمایەداران هەمیشە زۆر كەس دەكوژێ". كاتێك گەورە سەرمایەدارەكان بچوكەكانیان قووت دەدەن چینی ناوەڕاست لەناو دەچێ. دواجار تەنیا مشتێك گەورە سەرمایەدار دەمێننەوە كە ڕووبەڕووی ئاپۆرای كرێكاران دەبنەوە. كاتێكیش ئەو كاتە دێ، ئیتر كرێكاران هەلیان دەست

دەكەوێ. یەكێك لە بڕگە هەرە زیندووەكانی كتێبی "سەرمایە" كە شایانی بیركەوتنەوەیە، باسی ئەو هەنگاوانە دەكات كە دەبنە هۆی چارەسەری ئەو كێشەیە:

"لەكاتێكدا كەمبوونەوەیەكی بەردەوام لە ژمارەی خانەدانە سەرمایەدارەكاندا هەیە، لەبەرانبەردا زیادبوون لە ژمارەی هەژاران و لە ستەم و بەكۆیلەكردن و بەرەلایی و چەوساندنەوە هەیە. بەلام لە هەمان كاتدا تووڕەیی چینی كرێكاران تادێ توندتر دەبێ، ئەو چینەی ژمارەی زیاد دەكات. گوێڕایەڵ و یەكگرتوو و بەهەمان میكانیزمی رێگەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری رێك خراوە. هەروەها قۆرخكاریی سەرمایەداران خەریكە دەبێتە كۆتێك رێگەی بەرهەمهێنان كە بەو و لە سایەی ئەودا گەشەی كردبوو، زنجیر دەكات. سەرەنجام مەركەزیەتی ئامرازەكانی بەرهەمهێنان و ئیشتراكیەتی كار دەگەنە خاڵێك، ئیتر ناتوانن لەتەك مانەوەی سەرمایەداری هەڵبكەن. ئەمە دەتەقێتەوە و زەنگی مەرگی سامانە تایبەتەكانی سەرمایەداری لێ دەدات..

ململانێی چینەكان بە سەركەوتنی چینی كرێكاران (واتە پرۆلیتاریا) كۆتایی دێ. كاتێ كرێكاران دەستیان بەسەر حكومەتدا گرت، دیكتاتۆریەتەكەیان چەسپاند. لەگەڵ ئەمەیشدا، ماركس پێشبینی كرد ئەم قۆناغە "تەنیا ماوەیەكی راگوزەر و گواستنەوەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو چینەكان و هێنانەكایەی كۆمەڵگەیەكی ئازاد و یەكسان". ئەو كاتەی دیاری نەكرد كە بۆ بەردەوامبوونی دیكتاتۆریەت پێویستە. ئەمەیش خاڵێكە بەدڵی دەسەلاتدارانی سۆڤیەتی بوو كە دەیان ساڵە دەستیان لە دەسەلات توند كردووە و هیچ ئاماژەیەك نادەن كە هەندێ دەستی لێ شل بكەن.

لەڕاستیدا ماركس لە وەسفكردنی سروشتی كۆمەڵگەی چینەكانی تەواو ناڕوونە. (بەپێی تیۆرەكەی) پاش ئەوەی دەوڵەت بە رۆڵی خۆی لە فێركردن و رێكخستن

هەڵدەستێ، حکومەت دەپووکێتەوە و هیچ دەسەڵات یان پەیوەندیەك نامێنێ، ئاشتی و خۆشگوزەرانی باڵ بەسەر ژیانی هەموو تاکێکدا دەکێشن و ئامانجی سەرەکی کۆمەڵگە بریتی دەبێ لە: "پەرەسەندنی تەواو و ئازاد بۆ هەموو تاکێك" و بنەمای رابەر بریتی دەبێ لە: "لە هەموو کەسێکەوە بەپێی توانای خۆی، بۆ هەموو کەسێکیش بەپێی پێویستیی خۆی".

زۆر لە رەخنەگران قسەیان لەسەر دژیەکیی ئەم خەونە خەیاڵییە ئەرخەوانییە، ئەو دژیەکییە بریقەدار و نارێکەی قۆناغی رابردوو، قۆناغی خوێناوی و وەحشیانەی چینایەتی کردووە. هالیت Hallet دەنووسێ: کۆمەڵگە ناچینایەتیەکەی مارکس کۆمەڵگەیەکی تەومژاوییە بەئەندازەی تەومژاویی ئاسمانیی ڤیکتۆرییە ئەرسۆزۆکسەکان و تەنیا کەمێك لە متمانە و کەمێك لە حەماس دەبەخشێ. هەر هێندەی شۆڕشە جیهانییەکە سارد بوویەوە و خرایە لاوە، ئیتر ئاستەمە لەنێو ئێسکی وشکی مارکسیزمدا شتێك بدۆزیتەوە کە حەماسی خەڵك ببزوێنێ، یان بەرەو هێزی ئەگەرێکی نوێ یان هەوڵێکی نوێ پەلکێشیان بکات.

سەرباری ئەمەیش، مارکسیزم بەلای ملیۆنان کۆمۆنیست و لایەنگری کۆمۆنیزمەوە هێزی ئاینی هەیە. هەرچی ماتریالیزمی دیالێکتیکە دەشێ ببێتە عەقیدەیەك لەسەروو هەموو عەقیدەکانیترەوە. مارکس دەڵێ ئاینە کۆنەکانی وەك مەسیحیەت، مرۆڤ فێری باوەڕێکی ئەرێنی دەکەن بەو پشکەی لە ژیاندا بۆیان بەش کراوە، هەروەك ستایشی ملکەچی و بێزیانی و سەرکزی دەکات. کەواتە وەك "تلیاکی خەڵك" کار دەکات و کرێکاران کوێر دەکات و بەرەو مەرگیان دەبات و کۆسپی گەورە دەخاتە بەردەم شۆڕش.

مارکس تا چ رادەیەك پێکاویەتی؟ ئەمە پرسیارەکە مێشکی زۆر لە کۆمەڵناس و لاهوتی و نووسەر و بیرمەندانی بەدرێژایی سەدەی رابردوو بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە. لە زۆر شتی بنچینەییدا زەمەن هەڵەی جەوهەری لە تیۆر و

پێشبینیەکانیدا دەرخستووە و ئیتر هیچ زانایەکی ئابووریناسی نامارکسی نیە بەجدی تەماشای تیۆرەکانی لەبارەی کار بکات ئەوەی تایبەتە بە بەها و زێدە بەها، کە ئەوە خاڵێکی بنچینەییە لە فیکری مارکسیدا. لە هیچ دەوڵەتێکیشدا ململانێیەك لەنێوان چینەکاندا رووی نەداوە کە بووبێتە مایەی سەرهەڵدانی شۆڕشی پرۆلیتاریا، وەك کە مارکس پێشبینی کرد.

سیستمی سەرمایەداری رێگەیەکی تەواو جیاوازی گرتەبەر لانیکەم لەو نەتەوانەی کەمتر گەشاوەن، لەوەی مارکس پێشبینی کرد. لەباتیی نەهامەتی و نەداری و ئێش و ئازار لەنێو چینی کرێکاراندا، تەواو پێچەوانەی ئەوە روویدا. چەندین سەندیکای کاری بەهێز و سیستمی حکومی بەمەبەستی وەستاندنی زیادەی رکابەرییە سەرمایەداریەکان و رکابەریی پرۆژەکان دروست بوون.

وێڕای بەسووك سەیرکردنی مارکس بۆ "زانایانی ئابووری، خێرخوازان و ئەوانەی بەزەییان بە مرۆڤایەتیدا دێتەوە، ئەوانەی کار بۆ باشکردنی ژیانی چینی کرێکار دەکەن، رێکخەرانی کارە خێرخوازیەکان، ئەندامانی کۆمەڵەی بەزەییهاتنەوە بەئاژەڵ، هەوادارانی میانڕەوی و هەر جۆرە ریفۆرمخواز و توێژەرێك بەخەیاڵدا بێ"، بەڵام ئەم چەشنە خەڵکانە سەرکەوتوو بوون لە سووککردنی خراپترین خراپەکانی سەرمایەداری و وایان کرد سیستمەکە بە ئاسانیەکی ماقوڵ ببزوێ کە بکرێ دامەزراوەیەکی زۆر ئاڵۆزی دەستکردی مرۆڤ لە هەر ساتێکدا پێشبینی بکات.

هەروەها وەك راپۆرتێکی نوێ کە فەند Fund لە سەدەی بیستەمدا نووسیویێتی "لەنێو هەموو نەتەوە پیشەسازییە مەزنەکاندا، ئەو نەتەوەیەی وابەستەی سەرمایەداریی تایبەت بوو، لە هەموویان لە ئامانجە ئیشتراکیەکەوە نزیکتر بوو، کە لە کۆمەڵگەیەکی ناچینایەتیدا خۆشگوزەرانی بۆ هەموان دەستەبەر دەکات،

ئەوەیش ئاستێکە لە خۆشگوزەرانیی ماددی کە لەسەروو ئەوەیە بەشی هەرەزۆری دانیشتوانی جیهان پێی دەگەن".

مارکس ئومێدێکی بەهێزی بە لاوازکردنی پەیوەندیی نەتەوایەتی نێوان کرێکارانەوە بەستبوو، تا هەستکردن بە هەرەوەزیەکی نێودەوڵەتی لەنێوان کرێکارانی هەموو شوێنەکان دروست بکات. گەیشتن بەم ئامانجەیش لە دوو جەنگی جیهانیدا شکستی هێنا، ئەویش بەهۆی حەماسی نەتەوەیی کە لە دیمەنی ئێستای جیهاندا خۆ دەنوێنێت، کە وێنەکە لە روسیا و چین و وڵاتانیتری شیوعیشدا لەوە کەمتر نیە. بەگوێرەی لێکدانەوەی مارکس، شۆڕشی کرێکاران سەرەتا لە نەتەوە هەرە پیشەسازیەکاندا روودەدات، وەك ئینگلتەرا و ئەڵمانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان، نەك روسیا کە کەمتر بۆ یاخیبوون پێگەیشتووە. ئەوەیش پێشبینیەك بوو رووداوەکانی پاشتر نەیسەلماند.

ئەو رێگە جەدەلیەی مارکس بەکاری هێنا کاریگەریی زۆری کردە سەر مێژوونووسانی پاشتر، ئەگەرچی وەك ویلیەم هێنری چامبەرلین دەڵێ: "رێگەی ماتریالیزمی مێژوویی ناتوانێ ببێتە هۆی ئەو جیاوازییە رۆشنانەی لەنێو خەڵکانێکدان کە لە هەمان ئاستی گەشەی ئابووریدان. مارکس هەندێ فاکتەری زیندووی وەك جنس و ئاین و رەگەزنامەی فەرامۆش کردووە. حسابی بۆ گرنگیی مەزنی کەسایەتیی بەشەری نەکردوە. گومان هەیە لەوەی بکرێ بەپشتبەستن بە چەمکەکانی ئەم تیۆرە یەك تاکە رووداوی مێژوویی بەدروستی لێکبدرێتەوە یاخود تەفسیر بکرێ".

لەگەڵ ئەوەیشدا، لەکاتێکدا ئێمە لە هەڵەکانی نێو فیکری مارکس دەکۆڵینەوە، دەبینین ئاستەمە بەسەر کاریگەریی ئەو فیکرە بەسەر سەردەمەکەماندا زاڵ بین. کاریگەریشی لەسەر جیهانی سەرمایەداری لە هەندێ رووی دیاریکراوی گرنگەوە بەکەڵك بووە. بە زەقکردنەوەی عەیبەکانی سیستەمی سەرمایەداری و فێڵی

مەترسیی شۆڕشی کرێکاران چاکسازیی بنچینەیی کران. بەکورتی، دووپاتکردنەوەی بەردەوامی عەیبەکانی سەرمایەداری لەلایەن کۆمۆنیست و سۆشیالیستەکانەوە، سیستمەکەیان ناچار کرد زۆر لەو خراپانە راست بکاتەوە. بەوەیش ئەگەری روودانی ئەو یاخیبوونەی کرێکاران کە مارکس پێشبینی دەکرد، ئەگەر بەتەواوی بنبڕ نەکردبێ، زۆر کەمی کرد.

بەڵام شەپۆلی مارکسیزم بۆ روسیا و چین و ناوچە بەرفراوانەکانیتر و رامالینی نزیکەی نۆسەد ملیۆن کەس لەتەك خۆیدا، یەکێك بووە لە کێشە هەرە دەستەویەخەکان لە دنیای نوێدا. سەیر و سەمەرە ئەوەیە مارکس زۆر بەچاوی سووك سەیری روس بەگشتی و شۆڕشگێڕەکان بەتایبەتی دەکرد، کەچی ئەنجامگیرییەکەی لەبارەی حوکمی قەیسەری لە روسیای ئەو سەردەمەدا، کالاّ بەقەد بالاّی شیوعیەتەکەی خۆیەتی کە دەڵێ "سیاسەتی روسیا ناگۆڕێ، لەوانەیە رێگە و تاکتیك و مانۆڕەکانی بگۆڕێن، بەلاّم ئەستێرە قیبتیەکەی سیاسەتەکەی (سەروەریکردنی جیهان) ئەستێرەیەکی نەگۆڕە".

لەراستیدا ئێستا (مەبەست سەروەختی نووسینی ئەم کتێبەیە-وەرگێڕ) روسیا کەمێك لە بۆچوون و خەیالاّتەکانی مارکس دەربارەی شیوعیەت جێبەجێ دەکات. وەك سەرۆك ترومان ساڵی ١٩٥٠ تێبینی کرد، روسیا دەوڵەتێکی شیوعی (کۆمۆنیست) نیە، ستالینیش شیوعیەکی سوور نەبوو، ئەوەی هەیە دیکتاتۆریەتە لە حزبی شیوعیدا، یان راستتر بڵێین زیاتر دەسەلاّتێکی کەهەنوتییە تا ئەوەی دیکتاتۆریەتی راستەقینەی پرۆلیتاریا بێ.

مارکس دەڵێ، هەر زوو حاڵەتە سیاسیەکە "دەپوکێتەوە". بەلاّم بە تێپەڕینی کات زیاتر و زیاتر بوو. هەر لە لینینەوە سەرکردە کۆمۆنیستەکان هەستیان دەکرد ئامۆژگاریکردن بە بنەماکانی مارکس لە مومارەسەکردنیان ئاسانترە. لەکاتێکدا بەزارەکی سوور بوون لەسەر باسکردنی فەلەسەفەی مارکسی، بەکردەوە

بەگوێرەی خواستی هەلومەرجی سیاسی و ئامرازە لەبارەکان، گۆڕانکارییان لەو بیروباوەڕەدا دەکرد کە لە مارکسەوە بەمیرات بۆیان مابوویەوە. مارکس جارێکیان بە بینینی چالاکیی شوێنکەوتوانی گوتی "من مارکسی نیم". هیچ دوور نیە گومانی هەبووبێ لە بەکارهێنانی تیۆرەکانی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا. یەکێك لە پەندە ئیشتراکییە خۆشەکان دەڵێ "ئەگەر مارکس لە سەردەمی حوکمی ستالیندا بژیایە، زۆر نەدەژیا".

لە ژیانی مارکسدا تەنیا بەشی یەکەمی "ئینجیلی چینی پرۆلیتاریا" بڵاو کرایەوە. پاش مردنی مارکس لە ساڵی ١٨٨٣ ئەنگلز یاداشتە دەستنووسە ناتەواو و رێکنەخراوەکەی بەشی دووەم و سێیەمی برد، بەشی دووەمی ساڵی ١٨٨٥ و بەشی سێیەمی ساڵی ١٨٩٤ ساڵێك بەر لە مردنی ئەنگلز چاپ کران. ئەم دوو بەشە هەندێ پاکسازی و بەکارهێنانی تیۆرە بنچینەییەکانی تایبەت بە "ئاڵوێری سەرمایە" و "کۆی پرۆسەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری" لەخۆ دەگرن. ناوبانگی مارکس بۆ بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، هەرچی دوو بەشەکەیترن بەکەمی خوێنراونەتەوە. هەروەها کتێبێکیتری دەستوونسی هەبوو لەبارەی "تیۆری بەهای زیادە" کە بۆ بەشی چوارەمی کتێبی "سەرمایە" تەرخان کرابوو و کارل کاوتسکی گرتبوویە ئەستۆ و ساڵی ١٩٠٥–١٩١٠ لە ئەڵمانیا بڵاو کرایەوە.

لەراستیدا کتێبی "سەرمایە" خوێندنەوەی قورسە. رەخنەگر بارزۆن بەم شێوەیە هەڵیدەسەنگێنێ "دانانی کرچ و کاڵ و رێکخستنی خراپە و لە سیستم و لۆژیك و هەماهەنگیی مادەکان بێبەشە". رەخنەگرێکیتر بەناوی کرۆس Croce دەڵێ ئەو تێبینی "دانانی سەیر و نامۆی ئەو کتێبە و تێکەڵکردن لە تیۆرە گشتیەکە و جەدەل و گاڵتەجاڕیی سەخت و وێنە مێژووییەکان یان لادانەکانی کردووە... ئەم کتێبە نالێکچووە، بەخراپی رێك خراوە و هارمۆنیەتی تێدا نیە". رەخنەگری سێیەم ستاندین Standen دەڵێ "پلانی سێ بەشەکە زۆر نایابە، بەڵام شێوازی

پێشکەشــکردنی کتــێبی ســەرمایە بــەهۆی لادانــە توولانیــەکانی و خاوییــە ماندوکەرەکەیەوە، بێزارکەرە".

گومان هەیە لە مێژوودا کەسێك هـەبووبێ بۆچـوونی دژیـەکتری لـە کـارل مـارکس خستبێتە مێشکی خەڵکەوە. لـە رووی کرداریـەوە دەرخستەیەکی مامناوەنـد نیـە لەنێوان ئەو رایەی ئەو دەکاتە "جولەکەیەك شەیتان ئیلهامی بـۆ کـردووە و پلانـی بۆ خستنی شارستانێتی داناوە" و لەنێوان ئەو وێنەیەی کە تەواو دژی ئەم وێنەیـە و وەك "قدیسێکی خوێن شیرین پیشانی دەدات کە خۆی فەرامۆش کرد و ژیانی بۆ چینی نەدار لە سەدەی نۆزدەیەمدا تەرخان کرد". رەخنـەگرێکی زبـر لەبارەیـەوە دەنووسێ "باوەڕم وایە مـارکس بـەناوی پێشـکەوتنی مرۆڤایەتیـەوە پـتر لـە هـەر کەسێکیدیکەی سەر رووی زەوی، بووەتـە مایـەی مـەرگ و نەهامـەتی و تێکـدان و نائومێدی".

ئەی کەواتە نهێنیی ئەو هەژموون و هێزە سیحریەی لەسـەر ملیۆنـان کەسـی سـەر زەوی چییە؟ نێل Neill پێی وایە مارکس "سەرکردەی رەمزیی ئەوانەیە نـەدارن لە خەباتیاندا دژی ئەوانەی داران". بارزۆن پێی وایە "هێزی مارکس رێك لەوەدایـە بووەتـە هاوخـەم و هاوهەسـتی بەشـخوراوان. دەمـارگیریی یەکسـانی لـە قـووڵایی جگەریدا خۆی حەشار داوە و ... ئامادەیە بـۆ تێکشـکاندنی سیسـتمی ئـەخلاقیی ئێستا بەناوی سیستمێکی باڵاتر کە ئەو دەیبینێ".

هارۆڵد لاسکی لێکدانەوەیەکیتری هەیە و دەڵێ "سـۆزی سـەرەکیی شـاراوەی نێـو ناخی کە بزوێنەریەتی، شەیدابوونیەتی بۆ دادپەروەری. رەنگە بەتونـدی رقـی لـێ هەڵگیرابێ، وەلێ بەجەرگ و سەربەرز بووە. بەڵام بزوێنەری سەرەکیی ژیانی ئەوە بووە ئەو بارە قورسەی لەسەر شانی خەڵکە، هەڵبگرێ".

فریهۆف پەیامی مارکس دەنرخێنێ و دەڵێ "دیاریی مەزنی نووسینی کارل مارکس بۆ کۆمەڵگەی نوێ، جا ئیشـتراکی بـێ یـان سـەرمایەداری، بریتییـە لـە زەرورەتـی

هاتنەكایەی كۆمەڵگەیەكی خاڵی لە هەژاری و دەردیسەری. ئەم بەها باڵایە گژبەری (تحدی)یە بۆ هەموو سیستمێكی كۆمەڵایەتی، هەر سیستمێكی كۆمەڵایەتی، تەنانەت وەك سیستمەكەی ئێمەیش كە دژ بە تیۆرە ئابووریەكانیەتی، دەبێ ئەو بەها باڵایانە بە ڕێگەی تایبەتی خۆی قبوڵ بكات. بەم شێوەیە، ئەو پیاوە كە خۆی بەهەژاری ژیا، ئومێدێكی بەجیهان بەخشی بۆ بنبڕكردنی یەكجارەكیی هەژاری. ئەمەیە دەستكەوتی كارل ماركس و ئەمەیە ئەو شێوازەی عەقڵیەتی دنیای نوێی پێ گۆڕی".



## ٨- "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو"
### ئەلفرێد ت. ماهان Alfred T. Mahan
### زەبەلاحێکی دەریایی دژی فیل

رەخنەگرێکی هاوچەرخ کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو"ی کاپتنی دەریاوان ئەلفرێد ت. ماهان وەسف دەکات بەوەی "کتێبێکی سەرسوڕهێنە، بەڵام گەورەترین بۆمبی سووتێنەرە لە سەردەمە نوێکاندا. دووربینیەکی سەیری بەخەرج داوە. ماهان زیاتر لە هەر کەسێك هێزە دەرياییە نوێکانی جیهانی پیشان داوە.. قەڵەمەکەی لە هەر کەشتیگەلێك بەهێزترە، کەشتییە جەنگییە بەهێزەکان منداڵەکانی بوون، بۆردومانی تۆپە عەیار ١٦ بۆسەکان تەنیا دەنگدانەوەی دەنگی ئەو بوون". بەدڵنیاییەوە هیچ مێژوونووسێکیتر نەیتوانیوە وەك ماهان بە نووسینەکەی ئەو کاریگەرییە راستەوخۆ و بەرفراوانە بێنێتەکایە.

ماهان ئەوەی روون کردۆتەوە کە بەدرێژایی مێژووی تۆمارکراو، هێزی دەریایی فاکتەری یەکلاکەرەوە بووە لە باڵادەستیی جیهانیدا، چونکە هەر نەتەوەیەك بیەوێ رۆڵێکی گەورەتر لە کاروباری جیهانیدا بگێڕێت و لە هەمان کاتدا گەورەترین خۆشگوزەرانی و ئاسایش لە نیشتمانەکەیدا بەدەست بێنێ، پێویستی بەوەیە دەست بەسەر دەریادا بگرێ، چونکە هێزی وشکانی چەندە گەورە بێ ئەگەر بەدەریاوە نەبەسترابێ، چارەنووسی هەرەس و لەناوچوونە، لەبەرئەوەی وشکانی وەك ماهان ئاماژەی پێداوە "بەنزیکەیی هەموو بەربەستە، لەکاتێکدا دەریا بەنزیکەیی هەموو تەختی کراوەیە". ئەو نەتەوەیەی بتوانێ لەرێی هێزی

دەریاییەوە دەست بەسەر ئەو تەختاییەدا بگرێ و کەشتیگەلێکی بازرگانیی بەهێزی هەبێ، دەتوانێ سوود لە سامانەکانی جیهان وەربگرێ.

ماهان ساڵی ١٨٤٠ لەدایك بووە. کوڕی ئەندازیارێکی جەنگی و مەدەنییە لە وێست پۆینت. لە زانکۆی ئەناپۆلیس دەرچووە. ماوەیەکی درێژی ژیانی لەسەر یەك ریتم وەك ئەفسەری دەریاوانی کە بەتۆبەت کاری لە دەریا و وشکانی دەکرد، بەسەر بردووە. جگە لە کارێکی سنووردار لەکاتی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا هەرگیز نەکەوتۆتە ناو پێکداهەڵپڕژانی چەکداری. کارکردنی لە بەرازیل و ڕۆژهەڵات و گەشتەکانی بۆ ئەوروپا ئەزموونیان فراوان کردووە.

پازدە ساڵ بەسەر ئەو گەشتانەدا تێپەڕی بەبێ ئەوەی کارێکی جیاواز بکات جگە لە دانانی کتێبێکی بچوك بەناونیشانی "کەنداوی ئاوە کەناریەکان"، تایبەت بە مێژووی دەریای شەڕی ناوخۆ کە ساڵی ١٨٨٣ نووسینیان بە ماهان سپارد. دوای ئەوە ئیتر ئەو ماوەیە هات کە ناوبانگی دەرکرد و گۆڕانکاریەکی گەورەی لە ئایندەی ژیانیدا دروست کرد.

سەرکردەی دەریاوانی ستیفن ب. وس بانگهێشتی ماهانی کرد تا لەبارەی تاکتیك و مێژووی دەریایی لە کۆلێژی جەنگ کە تازە لە نیوپۆرت دامەزرابوو، وانە بڵێتەوە. ئەوە ڕێك لەو جۆرە دەرفەتانە بوو کە ماهان چاوەڕوانی نەدەکرد. کاتێك قەت وەك ئەفسەرێکی بەناوبانگی دەریاوانی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و لە ڕۆتینی دەریایی بێزار بوو و هێشتا پلەی کاپتنی هەبوو (پاش خانەشینکردنی پلەی بۆ سەرکردەی دواوەی کەشتیگەل بەرز کرایەوە)، وای دەهاتە بەرچاو ئەرکە نوێیەکەی لەلایەن خواوە بۆ ڕەوانە کراوە. بەر لەوەی بڕوات بۆ نیوپۆرت ساڵێك مۆڵەتی درایە بۆ خوێندنەوە و بیرکردنەوە. دوای ئەوە لە سێپتەمبەری ١٨٨٦ دەستی بە زنجیرەیەك موحازەرە کرد بۆ کۆمەڵێکی بچوك لە ئەفسەران. وا ڕێك کەوت چوار ساڵ دواتر ئەو موحازەرانە بەشێوەیەکی پاڵفتەکراوی وەك

کتێبێك بەناونیشانی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو" (١٦٦٠-١٧٨٣) بڵاو بکرێتەوە.

ماهان لە نامەیەکیدا بۆ بڵاوکارە ئینگلیزیەکەی کتێبەکەی نووسی کە ئەو زاراوەی "هێزی دەریایی Sea Power" وەك ناونیشان بۆ کتێبەکە هەڵبژاردووە تا زیاتر سەرنجراکێش بێ و دەستاوەدەستی پێ بکرێ، گوتی "بەتەواوی سیفەتی (کەشتیەوانی maritime)م لادا لەبەرئەوەی توانای سەرنجراکێشانی خەڵك و خۆهەڵواسینی بە زەینیاندا لاوازە".

دیارە وشەی هێز Power لە سەردەمی هەڵم و کارەبا و هێزی سیاسیدا لە ژێیەکی هەستیار دەدات. کەواتە ناونیشانی "کاریگەریی هێزی دەریایی" بەوریایەوە دەستنیشان کراوە تا هەستێکی تایبەت لە زەینی خوێنەراندا دروست بکات. ئەم کتێبە بەناوبانگە کە ناوبانگی ماهان زیاتر لەسەر ئەم وەستاوە، لە جەوهەردا گێڕانەوە و لێکدانەوەی باڵایی و پێشکەوتنی هێزی دەریایی بەریتانیایە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم تا کۆتایی جەنگەکانی ناپلیۆن.

بەڵام ماهان لە کۆمەڵێ هێڵی پان و بەریندا بەدووای پێشکەوتن و تێکچوونی هێزی مەزنی دەریاییدا دەچێ و بە دوور و درێژی باس لەو رەگەزانە دەکات کە بۆ نەتەوەیەك بیەوێ لە دەریادا بەهێز بێ، پێویستن. ماهان ئەو رەگەزانە لە شەش رەگەزدا پوخت دەکاتەوە کە بریتین لە: شوێنی جوگرافی، لەباریی سروشتی (لەوانە بەرهەمی سروشتی و کەشوهەوا)، درێژیی سنوور، ژمارەی دانیشتوان، جۆری گەل و جۆری حکومەت.

ماهان دێتە سەر باسکردنی "رەگەزەکانی هێزی دەریایی" و لە هەر نموونەیەکدا روونی دەکاتەوە کە چۆن چۆنی بەرتانیا بەسەر دوژمنەکانیدا سەرکەوتووە. بەگوێرەی لێکدانەوەکەی ئەو، هێزی دەریایی تەنیا بریتی نییە لە "هێزی جەنگیی دەریایی" چونکە هێزی دەریایی تەنیا کەشتیگەلی جەنگی ناگرێتەوە، بەڵکو

کەشتییە بازرگانییەکان و بنکەیەکی بەهێز لە نیشتمانیش دەگرێتەوە. ماهان دەڵێ "لەکاتێکدا مێژووی هێزی دەریایی بەمانا فراوانەکەی هەر شتێك دەگرێتەوە کە وا بکات نەتەوە لە دەریا یان لەتەنیشت دەریادا بەهێز بێ، ئەوا لە زۆر لە ماناکانیدا مێژوویەکی جەنگییە". لەگەڵ ئەوەیشدا هەمیشە جەختی لەوە کردووە هێزی جەنگیی دەریایی و هەڵمەت و شەڕەکان تەنیا کۆمەڵێ ئامرازن بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك. بەبێ یەکتر نە دەریاوانیی بازرگانی گەشە دەکات و نە دەریاوانیی جەنگی سەرکەوتوو دەبێ. خۆشگوزەرانیی نەتەوەیی لەسەر کۆی هەردوو هێزەکە دەوەستێ.

بەدیراسەکردنی شوێنی جوگرافی، کە بایەخێکی نێودەوڵەتی هەیە، ماهان جەخت لەو تایبەتمەندییە بەنرخانەی نەتەوەیەك دەکات کە شوێنەکەی بەشێوەیەکە "ناچاری ناکات لەڕێی وشکانییەوە بەرگری لە خۆی بکات، هەروەك هەڵینانێ بۆ فراوانکردنی رووبەری زەویەکەی لەڕێی وشکانییەوە.. بەبەراورد بە نەتەوەیەك یەکێك لە سنوورەکانی دەشتی کاکی بەکاکی بێ". "نموونەی ئەوەیش لەلای ئینگلتەرا و هەریەك لە فەرەنسا و هۆڵەندەیە. لەکاتێکی زووی مێژووی هۆڵەندەی نوێوە، ئەو وڵاتە برستی لە خۆی بڕی بەهۆی ناچاربوونی بۆ هێشتنەوەی سوپایەکی گەورە تا بتوانێ لەپێناو پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی خۆی شەڕی پێبکات. هەروەها فەرەنسا بەهۆی بەشکردنی سامان و هێزە مرۆییەکەی لەنێوان هێزێکی جەنگیی دەریایی و پرۆژەکانی فراوانبووندا لاواز بوو. هەروەها شوێنی فەرەنسا یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی زیاتر دووچاری هێرش ببێتەوە، لەبەرئەوەی کەنار لەسەر هەریەك لە ئۆقیانوس و دەریای ناوەڕاست هەبوو، ئەوەیش رێگر بوو لەوەی کەشتیگەلێکی یەکگرتوو بەکار بێنێ. ماهان ئاماژە بەوە دەدات شوێنی ویلایەتە یەکگرتووەکانیش لەسەر دوو ئۆقیانووس بەهەمان شێوە هەمان پێگەی لاوازی پێ دەبەخشێ. هەروەها شوێنی ناوەند و خاوەن بەندەری نزیك لە رێگە

گەورەکانی بازرگانی و بنکەی بەهێزی کارکردن دژ بە دوژمنانی بەهێز، سەرمایەیەکی ستراتیژیی گەورەیە. پاشان ئینگلتەرا بەهۆی باڵادەستبوونی بەسەر ڕێگەکانی بازرگانی لە دەریای مانش و لە دەریای باکور، توانیویەتی سەروەری لە دەریادا بەدەست بێنێ.

ماهان ڕەگەزی دووەم شی دەکاتەوە، کە ئەویش لەباریی سروشتییە و پێی وایە "کەناری دەوڵەت یەکێك لە بەرەکانیەتی و چەندە ئەم بەرەیە گەیشتن بە ناوچەی پشتەوە، کە لەم حاڵەتەدا دەریایە، ئاسان بکات، گەیشتنی ئەم دەوڵەتە بە باقیی جیهان لەڕێی ئەو بەرەیەوە ئاسان دەبێ". سەرباری ئەوە، بوونی بەندەری زۆر و قووڵیش گرنگیەکی زیندووی هەیە بۆی. کاتێك سروشت لە رووی خاك و ئاوهەواوە بەخشندانە مامەڵەی لەتەك ئینگلتەرا و هۆڵەندەدا نەکردووە، ناچار بوو رووبکەنە دەریا. لەکاتێکدا فەرەنسا بەختی بووە لە بوونی "زەویەکی بەپیتی جوان". هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانیش پیرۆز کراوە و ئیتر هیچکامیان چاویان لە بڕینی دەریا نەبووە.

ڕەگەزی سێیەم دواین ڕەگەزی سروشتیی کاریگەرە لە گەشەکردنی نەتەوە وەك هێزێکی دەریایی، ئەویش درێژبوونەوەی سنوورە.. مەبەستی ماهان لەم زاراوەیە "ژمارەی میلە چوارگۆشەکانی رووبەری ئەو دەوڵەتە نەبووە، بەڵکو مەبەستی درێژیی کەنارەکەی و سروشتی بەندەرەکانی بووە". هەروەها ژمارەی دانیشتوانی نەتەوەیەك بەبەراورد لەگەڵ درێژیی کەنارەکەیشی بایەخێکی گەورەی هەیە. بۆ ئەوەیش نموونەی لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا هێناوەتەوە:

ئەگەر گەلی باشور هاوشێوەی توانا جەنگیەکەی بووایە، هەروەها باشور هێزێکی جەنگیی دەریایی هەبوایە کە لەگەڵ داهاتەکانیدا بگونجایە، ئەوا درێژیی کەنارە دەریاییە گەورەکە و دەروازە زۆرەکانی ڕەگەزێکی زۆر بەهێز دەبوون.. بەڵام باشور نە تەنیا هێزێکی دەریایی بەهێزی نەبوو، نە هەر ئەوەی تەومێکی دەریاوان

نەبوون، بەڵکو ژمارەی دانیشتوانەکەیشی لەگەڵ درێژیی کەنارە دەریاییەکەیدا، کە دەبوو ئەو دانیشتوانە بەرگری لێبکەن، گونجاو نەبوو.
ماهان پاش باسکردنی سێ مەرجە سروشتییە کاریگەرەکە لە هێزی دەریاییدا کە بریتین لە: شوێنی جوگرافی و لەباریی سروشتی و درێژیی سنوور، دێتە سەر باسی دانیشتوان و حکومەتەکەیان. لێرەدا لە ڕوویەکی تایبەتەوە پێداگری لەسەر ژمارەی دانیشتوان دەکات، لەبەرئەوەی "گرنگ کۆی گەورەی دانیشتوان نیە، بەڵکو ژمارەی ئەوانەیانە کە بە دەریاوانیەوە خەریکن، یان لانیکەم ئەوانەی دەکرێ لەسەر کەشتی و دروستکردنی کەرەستە دەریاییەکاندا بەکار بهێنرێن".
نموونە مێژووییەکانیشی لە ئینگلتەرا و فەرەنسا هێنایەوە. ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسا لەچاو هی ئینگلتەرا کەمێك زیاتر بوو، بەڵام مەیلی دانیشتوانی ئەمەی دواییان بەلای دەریاوانی و بازرگانیدا، بوو بە خاڵێکی باشە بەسەر دانیشتوانی فەرەنساوە کە زیاتر مەیلیان لە کشتوکاڵ بوو. ماهان گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە "زۆریی ژمارەی دانیشتوان و خاوەن مەیلی دەریایی، ئێستایش وەك پێشتر ڕەگەزێکی مەزنە لە هێزی دەریاییدا" و بینی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەم ڕووەوە دواکەوتووە.
خاڵی پێنجەمی ماهان بریتی بوو لە کاریگەریی سیفەتی نەتەوەیی لەبارە لەسەر پێکهاتەی هێزی دەریایی. دەڵێ مێژوو دەریدەخات کە "تارادەیەك بەبێ هەڵاوێردن، پێویستە گونجاویی نەتەوە بۆ مەبەستە بازرگانیەکان دیاردەیەکی بەرچاو بێ لەو نەتەوانەی سەروەختێك لە دەریادا مەزن بوون. ئەگەرچی ئینگلیز و هۆڵەندە زۆرجار وەسف کراون بەوەی "گەلی بازرگانی"ن، دەسکەوتی هەمیشەیی و بنچینەییان لە بازرگانیی دەریاییان بەدەست هێناوە زیاتر لەو قازانجەی ئەو ئیسپانی و پورتوگالیانەی بەدوای ئاڵتوندا گەڕاون، کردوویانە.

ماهان دەڵێ "مەیلی بازرگانی، کە پێویستیی بەرهەمهێنانی شتێك بۆ بازرگانی پێوەکردنی لەخۆ دەگرێ، سیفەتێکی زۆر گرنگە لە پێکهاتنی هێزی دەریاییدا".

ماهان باوەڕی وابوو زیرەکی یان هەڵکەوتنی نەتەوەییش کاریگەری لەسەر توانای پێکهێنانی کۆلۆنیی تەندروست هەیە. لەم بوارەدا ئینگلیزەکان لەسەروو فەرەنسیەکانەوەن لەبەرئەوەی "کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزی بەشێوەیەکی سروشتی و راستەوخۆ لە نیشتمانە تازەکەیدا جێگیر دەبێ و بەرژەوەندیەکانی بە بەرژەوەندیەکانی ئەو نیشتمانەوە دەبەستێتەوە. ئەگەرچی هەمیشە نیشتمانە ئەسڵیەکەی بەچاکە باس دەکات، بەڵام تامەزرۆی ئەوە نیە بۆی بگەڕێتەوە". بەڵام ئیسپانیەکان کۆلۆنیالیستی لێهاتوو نەبوون، لەبەرئەوەی یەکەم شت بایەخ بە قۆستنەوەی خێرای سامانی دەوڵەتەکە دەدەن، زیاتر لە پەرەپێدانی تەواوی خێراتەکانی.

لە کۆتاییشدا، ماهان باس لە جۆری حکومەت و ئیدارەکەی سەبارەت بە گەشەی هێزی دەریایی دەکات. ماهان بڕوای وابوو جۆری حکومەت و سیفەتی حاکمەکان "کاریگەریی گەورەیان لەسەر گەشەی هێزی دەریایی هەیە". ئەو لەکاتێکدا کاری حکومەتە دیموکراسیەکانی بەلاوە باشترە، دەبینین باس لەوە دەکات کە "بەکارهێنانی هێزی تاکڕەوی بەداناییانە و دامەزراوی لەوانەیە لە کاتێك لە کاتەکاندا بازرگانیەکی دەریایی زەبەلاح و هێزێکی دەریایی جەنگی دروست بکات بە سەرکردایەتیەکی مەزنتر لەوەی کارە لەسەرخۆکانی گەلانی ئازاد بەدیدێنن. سەختیش.. دەستەبەری کۆڵنەدانە پاش مردنی حاکمە زۆردارەکە". لەو رووەوە ئینگلتەرا لە هێزی دەریاییدا گەیشتبووە لوتکە و پێش هەموو نەتەوە نوێکانی دابوویەوە، ئەوا ماهان پێی وایە توێژینەوە لە حکومەت لەوێ زۆر لەبارە. کاریگەریی حکومەتی ئینگلیزی لەسەر چەند دەوڵەتێك بەرەو دەستگرتن بەسەر دەریادا دەڕۆیشت. بەچاوپۆشین لە پاشای حاکم یان حزبە سیاسیەکان، ئینگلیز

دەرکی بە گرنگیی سیاسیی پارێزگاریکردنی نەتەوە لە سەروەریی دەریایی دەکرد.

پاش خستنەڕووی مێژوویەکی دوور و درێژ لە کاری حکومەتی جۆراوجۆر سەبارەت بە ژیانی دەریایی گەلانیان، ماهان دەگاتە ئەو رایەی کە هەژموونی حکومەت بە دوو رێگە کار دەکات:

**یەکەمیان:** لەکاتی ئاشتیدا، "حکومەت دەتوانێ بە سیاسەتی خۆی گەشەی سروشتیی پیشەسازیەکانی گەل و مەیلی بۆ گەڕان بەدوای سەرکێشی و قازانج لەڕێی دەریاوە خۆشەویست بکات، یان دەتوانێ برەو بە هەندێ پیشەسازی و هەندێ مەیلی دەریاوانی بدات. ئەگەر ئەم دووانە بەشێوەیەکی سروشتی نەبوون، ئەوا حکومەت ئەو پێشکەوتنەی خەڵک بۆ خۆیان بەجێیان هێشتبوو دەوەستێنێ، یان کۆت و بەندیان لەسەر دادەنێ.

**دووەم:** لەکاتی ئاشتیدا، دەریاوانی بە مەیلی حکومەت بۆ دروستکردن و پڕچەککردنی کەشتیگەلێك و هەبوونی " قەبارەی هێزی دەریایی لەگەڵ رادەی گەشەی کەشتیەکان و بایەخی حەزلێبوونیان" مەزەندە دەکرێ. بەهەمان شێوە "بوونی وێستگەی دەریایی گونجاو لەو بەشە دوورانەی جیهان پێویستە. هەروەها پێویستە کەشتییە چەکدارەکان شوێن کەشتییە بازرگانیەکان بکەون بۆ ئەو وێستگانە". ماهان دەبینێ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە نەبوونی بنکەی بیانیی کۆلۆنیاڵیانە یان جەنگیدا لاوازە.

ماهان پاش پشکنینی ئەو شەش هۆکارە بنچینەییەی کاریگەرییان لەسەر هێزی دەریایی هەیە و زۆر بیری لێکردەوە، ئیتر ئامادە بوو بەدرێژی بچێتە سەر شیکردنەوەی جەنگە دەریاییە ئەورووپییەکان لەساڵی ١٦٦٠ەوە بۆ ساڵی ١٧٨٣، کە دەگاتە نزیکەی سەدە و چارەکێك. پاشان باقیی کتێبەکەی بۆ ئەم خستنەڕووە مێژووییە تەرخان دەکات. ماهان وەك خاڵی سەرەتا وەسفی

بارودۆخی گشتیی باو لە ئەوروپا لە کۆتاکانی سەدەی حەقدەیەم دەکات و بەشێوەیەکی تایبەت ئاماژە بۆ ئیسپانیا و فەرەنسا و هۆڵەندە و ئینگلتەرا دەکات. ئەوانە ئەو دەوڵەتە سەرەکیانەن کە دەکرێ لە جەنگی دەریایی سەربەخۆدا بەشەڕ بێن. ماهان پێی وایە مێژووی ئەوروپا لە ماوەی ساڵە ئاڵۆزەکانی پاشتردا، پێشبڕکێ بوو لەنێوان هێزە خۆرئاواییەکان بۆ دەستگرتن بەسەر دەریادا. جا لێکۆڵینەوەکەی بە جەنگی هۆڵەندیی چارلزی دووەم دەست پێدەکات و جەخت لەو مەودایە دەکات کە بەرژەوەندیەکانی ئینگلتەرا لە جەنگی سەروەریی ئیسپانی دەکات، کاتێك ئینگلتەرا تێیدا وەك هێزێك لە دەریای ناوەڕاستدا دەرکەوت و دەستی بەسەر جەبەل تاریق و بەرندەری ماهۆندا گرت. لە جەنگی حەوت ساڵەیشدا وۆلف Wolfe بەهۆی ئەو کەشتیگەلەی سەینت لۆرانسی فەتح کرد و رێگەی لە گەیشتنی پاڵپشتی لە فەرەنساوە گرت، توانی سەربکەوێ.

جارێکیتر مانای سەرەکیی هێزی دەریایی لەکاتی شۆڕشی ئەمەریکیدا دەرکەوتەوە کاتێك ئینگلتەرا بەهێزە دەریاییە پەرتەکانیەوە لەبەردەم هێزی یەکگرتووی فەرەنسا و ئیسپانیادا شکستی هێنا، بەوەیش داگیرگە (کۆلۆنییە) ئەمەریکیەکان توانییان ئازادییان بەدەست بێنن.

پرسی سەرەکیی ماهان بەدرێژایی کتێبەکەی ئەوە بوو کە لەنێوان هێزی دەریایی و وشکانیدا، هەمیشە گەمارۆی دەریایی بەردەوام، زیاتر لەو سوپا وشکانیەی کە نابەزێ، یەکلاکەرەوەیە.

لەبارەی گێڕانەوەی تاکتیکی شەڕە جیاوازەکاندا، گرنگترین نووسەری ژیانی ماهان کە ئەویش و. د. پۆلستۆنە W.D. Puleston دەڵێ "ماهان هەموو هەوڵی خۆی دەدات بۆ ئەوەی ورد بێ، نموونەکانی لە سەردەمی کەشتییە چارۆکەدارەکان وەردەگرت، زۆر هەوڵیدا لە تەکنەلۆژیای دەریاوانی و مانای وردی

زاراوە دەریاییـە کۆنـەکان شـارەزا بـێ، کـە لـە سـەردەمی دەریـاوانیی ئـەودا بەکارهێنانیان بەسەر چوون".

ماهان خۆی لە گێڕانەوەی مێژووی ژیانیدا، باس لەو ئامرازە میکانیکییـە دەکات، کـە بـۆ نوانـدن و سـەرلەنوێ وێنـەگرتنی شـەڕە دەریاییـەکانی کەشـتیە چارۆکەدارەکان بەکاری هێناوە، وەك نموونەی کەشتییە کاغەزینەکان.

ئامانجی سەرەکیی ماهان لە کتـێبی "کاریگـەریی هێـزی دەریـایی لەسـەر مێـژوو" وەك خۆی باسی کردووە

ئـەوە بـووە "مێژوویـەکی جـەنگیی رەخنەگرانـە لـەبارەی رابـردووی دەریـاوانی بنووسێتەوە، نەك مێژوویەك بۆ رووداوە دەریاییەکان". دەیتوانی ئەوەشی بۆ زیاد بکات کە یەکێك لە ئامانجەکانی ئەوە بووە پەیوەنـدیی نێـوان مێـژووی دەریـایی و مێژووی سیاسی روون بکاتـەوە، چونکە قەناعـەتی تـەواوی بـەوە هـەبوو کـە ئـەو هێزە ئابووریەی لەگەڵ دەستگرتن بەسەر دەریادا بەسەرچوو، پێگەیەکی جێگیری لـە کاروبـاری جیهانـدا بـە خاوەنەکـەی بەخشـیوە. وەك پـرات سـەرنجی داوە "لەبەرئـەوەی ئینگلتـەرا هێزێکـی دەریـایی پێکهێنـابوو لـەو کاتـەی دژبـەرەکانی ئەوەیان پشتگوێ خسـتبوو، تـوانی پلانـەکانی لویسـی چواردەیەم و ناپلیۆن بـۆ راماڵینی شکست پێبێنێ. ماهان باوەڕی پتەوی هەبوو بەوەی ئینگلتەرا بەو کارە، شارسـتانێتیەکەی لەدەسـتی ئەوانـەی دەیانویسـت وێرانـی بکـەن، شکسـت پێهێناوە".

کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو" راستەوخۆ لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا ناوبانگێکی جیهانی پەیدا کرد، ئەگەرچی ناوبانگی لە دەرەوە لە ناوبـانگی لـە نـاو ویلایەتە یـەکگرتووەکان گـەورەتر بـوو. پـاش ماوەیـەکی کـورت تەرجەمـەی ئـەم کتێبە بە زمانەکانی ئەڵمانی و ژاپۆنی و فەرەنسـی و هینـدی و روسـی و ئیسـپانی بڵاو بوونەوە. ئەم کتێبە لە هـەموو شـوێنێك زەخیرەیـەك بـوو بـۆ سـەردەمی ئـەو

فراوانبوونە دەریاییە گەورەیەی لە جیهاندا لەئارادا بوو، بەتایبەت لە بەریتانیای مەزن و ئەڵمانیا و ئەمەریکا.

وەك چەندین رەخنەگر روونیان کردۆتەوە، هەمیشە ئەو پرسیارە دەکرێ کە ئاخۆ ئەگەر کتێبەکەی ماهان لە سەردەم و ناوچەیەکیتردا دەربکەوتایە، هەمان کاریگەریی قووڵی دەبوو؟ بێگومان سەردەمەکەی زۆر لەبار بوو و قسەکانی ماهان لەبارەی گرنگیی هێزی دەریایی جەنگی کەوتنە سەر خاکێکی بەپیت و لەگەڵ ئارەزووی جەنگ لەو سەردەمەدا بەتەواوی هاورێك بوون. زلهێزەکان بازووی خۆیان نمایش دەکرد تا ببنە دەوڵەتێکی دەریایی بەهێز و پەلاماری کۆڵۆنی و مەملەکەتیتر بدەن. کەواتە، شتێکی سروشتییە کە نەتەوەکان ماهان بە پێغەمبەرێك دابنێن. بەڵگە پشتئەستوورەکانی بەو بەڵگەنامامەی دەڵێن دەستگرتن بەسەر دەریادا خواستی بنچینەییە بۆ بەرژەوەندیەکانی هەر نەتەوەیەك، ئەو بەڵگانە راست و دروستیی ئەو سیاساتەنەیان سەلماند کە پێشتر پەیرەو کراون یان لەژێر لێکۆڵینەوەدان. وەك نووسەرێکی بەریتانی دەڵێ، رێنماییەکانی "وەك بەنزین بوو کە بکرێ بەسەر کڵپەی ئەو فراوانخوازییە ئیمپریالزمیەی لە هەموو شوێنێك لەئارادا بوو".

رەخنەگرانی بەریتانی پەسنی کتێبەکەی ماهانیان کردووە و بە "ئینجیلی مەزنیی ئینگلتەرا"یان وەسف کردووە. بولسۆت دەڵێ "لەوانەیە لەسەر داوای وەزارەتی بەریتانی نووسیبێتی، چونکە بەروونی پشتگیریی هەموو مشتومڕەکانیانی کردووە". سەرکردەیەکی دەریایی جەخت لەوە دەکات کە لە باشکردنی پێگەی دەریایی جەنگیی بەریتانی پاش ساڵی ١٩٠٠، ئێمە "قەرزاری سوپاسکردنی کۆنەپارێزان یان ئازادیخوازان نین، بەڵکو تەنیا قەرزاری ماهانین و بەس".

وەك رێزێك بۆ ماهان لەکاتی مردنی لە ساڵی ١٩١٤ رۆژنامەی لەندەن پۆست London Post نووسی "بەریتانیا قەرزاری ئەو ئەمەریکییە مەزنەیە بە قەرزێك

کە ناتوانرێ بدرێتەوە، لەبەرئەوەی یەکەم کەس بوو فەلسەفەی هێزی دەریایی بەریتانیا بەوردی و بەشێوازێك قابیل بەتێگەیشتن بێ، دارشتووە".

ئەم سەرنجانە زیاتر دەنرخێنرێن کاتێك بزانین لەوکاتەی ماهان کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو"ی نووسی، هێزی دەریایی جەنگیی ئینگلیزی بەدەستت پشتگوێخستنێکی دارایی درێژخایەنەوە دەینالاند و ژمارەی فەرمانبەرانیان بۆ قەبارەی پەیکەرەکەی کەم کردبوویەوە و زۆری نەبرد کەشتییە فەرەنسی و ئیتالّیەکان کە نوێتر بوون، پێشیان دایەوە. هێزی دەریایی ئینگلیزی وەسف کرا بەوەی لە "پێشانگەیەکی کەشتییە کۆنە شێوە جۆراوجۆر و نامۆکانە". زیاتر لە دوو لەسەر سێیان ناچەکدار بوون. کەواتە ئامۆژگاریەکەی ماهان بۆ پێکهێنانی کەشتیگەلێکی ئینگلیزی نوێی بەهێز، تەواو لەکاتی خۆیدا بوو، هەربۆیە بزاوتی رێکخستنەوەی هێزی جەنگیی دەریایی و بەهێزکردنی خێراتر کرد.

ئینگلتەرا سەرسامی و پێزانینی خۆی بۆ ماهان دەربڕی، ئەویش لەو دوو سەردانەدا کە سالّی ١٨٩٣ و ١٩٠٤ بۆ بەریتانیا ئەنجامیدان. میوانی شەرەف بوو لە ئاهەنگە رەسمیەکانی زستان کە شاژن ڤیکتۆریا و سەرۆك وەزیران سازیان کردبوو. یەکەم میوانی شەرەفی بیانی بوو کە یانەی سوپا و هێزی دەریایی رێزیان لێنا. هەردوو زانکۆی ئۆکسفۆرد و کامبرێدج لە ماوەی هەفتەیەکدا پلەی فەخرییان پێبەخشی.

بەلاّم لەبەرئەوەی کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو" وەك رەخنەگرێك بۆی چووە، بەزمانێك نەنووسرابوو تەنها ئینگلیز و ئەمەریکیەکان لێی تێبگەن، ئەوا کاریگەری لەسەر ئەلّمان و ژاپۆنیەکان بەهەمان هێزی کاریگەریی بوو لەسەر بەریتانیەکان. قەیسەر ویلهلم Kaiser Wilhelm دەلّێ "من ئێستا کتێبەکەی کاپتن ماهان ناخوێنمەوە، بەلّکو قووتی دەدەم. ئەو لەسەر پشتی

هەموو کەشتیەکانم هەیە.. ئایندەمان لەسەر ئاو وەستاوە و دەبێ رمە سێ سەرەکە لەدەستی ئێمەدا بێ". بەم شێوەیە کتێبەکەی ماهان بوو بە ئیلهامبەخشی هێزێکی نوێی دەریایی ئەڵمانی.

تایلۆر Taylor کە یەکێکە ژیاننووسانی ماهان دەڵێ "بەڵگەیەکی ماقوڵ هەیە لەسەر ئەوەی لە مانگە کەمە کۆتاکانی ژیانی ماهاندا، بەدەست تیشکەلێکی عەقڵی لەبارەی جەنگ (جەنگی جیهانیی یەکەم) و ئەو رۆڵەی بینی، گرفتار بووە، ئەگەرچی پێشتر هەرگیز بیری لە وروژاندنی گەشەی دەریایی ئەڵمانی لێ نەکردبووەوە".

لە ژاپۆنیش بەهەمان شێوە، هەر ئەفسەرێکی دەریایی و هەر کەشتیەکی جەنگی وەك بەشێك لە کەلوپەلەکان دانەیەك لە کتێبەکەی ماهانی درابوویە. ژاپۆنیەکان بەپەرۆش بوون بۆ فێربوونی میتۆدە خۆرئاواییەکان و وردە وردە بەپیر ماهانەوە چوون لە بنیاتنانی هێزی جەنگیی دەریایی و عەیاری تۆپەکان و شتە دەرياييەکانیتر. ماهان بانگهێشتی ژاپۆنی رەت کردەوە بۆ ئەوەی ببێتە راوێژکاری رەسمیی دەریایی. سەرباری ئەوەیش بۆچوونەکانی ئەویان کردە پێشەنگی خۆیان و قۆڵیان لێ هەڵماڵی تا ببنە زلهێزی دەریایی لە رۆژهەڵاتی دوور.

لەنێو ئەو دەوڵەتە گەورانەی ماهان خوازیار بوو کاریگەری لەسەر یان هەبێ، ویلایەتە یەککگرتووەکان تاکە دەوڵەت بوو کە لە وەرگرتنی رێنماییەکانیدا خاو بوو. ماهان گەیشتە قەناعەت کە پێویستە ویلایەتە یەککگرتووەکان بچێتە ناو رکابەریەکی توند لەگەڵ هێزەکانیتر لە بازاڕە بیانیەکاندا، هێزێکی دەریایی جەنگی زەبەلاح دروست بکات و بنکەی دەریایی لە بەرزایی دەریاکان بەدەست بێنێ و کۆلۆنیەکانی لە دەرەوەی نیوەی گۆی خۆرئاوایی فراوان بکات. ئامارەی بەوەشدا کە پێویستە دورگەی هاوای بلکێنرێ و وەك بنکەیەکی ئەمەریکی بەکار بێ. هەروەها ئامارەی بەوەدا پێویستە پەیوەندیمان بە دەریای کاریبییەوە وەك

پەیوەندیی ئەورووپا بێ بە دەریای ناوەڕاستەوە، گرنگیشی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان بەتەواوکردنی کەناڵی پەنەما زیاد دەکات. ماهان بەدرێژایی کتێبەکەی سەرنجێکی تایبەتی خستۆتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان و تێبینیی تواناکانی وەك هێزێکی دەریایی کردووە. کاپتن پۆلستۆن دەڵێ "ماهان کتێبەکەی بۆ ئەوە دانا تا حەماسی پێشووی هاولاتیانی و چێژبینینیان لەوەی ببنە هێزێکی دەریایی تاو بداتەوە. باوەڕی وابوو ئەمەریکیەکان سەرقاڵن بە پەرەپێدانێك لەنێو قارەکەدا، بەوەیش بەبێ پێویست میراتێکی مەزنیان دوور فڕێدا. ماهان حەزی نەدەکرد نیشتمانەکەی رێچکەی فەرەنسا بگرێ لەکاتی حوکمی لویسی چواردەیەمدا و بەر لە هەموو شت ببێتە هێزێکی وشکانی".

بەڵگەکانی ماهان بوونە هۆی گۆڕینی دوو کەس لە ناوەندە سەرەکیەکاندا، ئەوانیش تیۆدۆر رۆزڤێلت و هێنری کابۆت لۆدج بوو. رۆزڤێلت لە کۆشکی سپی و لۆدج لە ئەنجومەنی پیران دلگەرم بوون بۆ پێکهێنانی دەریاییەکی گەورەی جەنگی ئەمەریکی. رۆزڤێلت گوزارشتێکی تەواوی بۆ فەلسەفەکەی لەبارەی "داری ئەستوور" لەوەدا بینی کە ماهان نووسی. تیۆرەکانی هێزی دەریایی بەکارهێنا تا یارمەتی بدات پاڵپشتیی رای گشتی ئەمەریکی بەدەستبێنێ بۆ سیاسەتی فراوانبوون لەڕێی دەریاکانەوە. کاریگەریی ماهانیش لەسەر بەرنامەی زەبەلاحی دامەزراندنی دەریاییەکی جەنگی لە ویلایەتە یەکگرتوەکان، کە لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا دەستی پێکرد، روون و بەرچاوە.

قەڵەمەکی ماهان لە رێگەی سەرکەوتنە مەزن و بەناوبانگەکەیدا زۆر کتێبی نەخشاند و لێشاوێك کتێب و وتاری بەرهەم هێنا، بەشێوەیەك ژمارەی بەرگەکانی کۆی کتێب و وتارەکانی گەیشتە نزیکەی بیست بەرگ. زیادکردنەکانی بۆ "زنجیرەی هێزی دەریایی" زۆر بایەخدار بوون بەتایبەت "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر شۆڕشی و ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی" لە ساڵی ١٧٩٣-١٨١٢، کە

ڕەخنەگران بە دانراوێکی هەمەگیرتر و باشتر پشتئەستوور کراو بە بەڵگەنامە لە کتێبی "کاریگەریی هێزی دەریایی لەسەر مێژوو"یان داناوە.

ماهان دانی بەوەدا ناوە کە بۆچوونەکانی دەربارەی هێزی دەریاییدا داهێنانی ئەو نین، وەك نموونە ئاماژەی بەوە داوە کە باکۆن Bacon و ڕالی Raleigh سێ سەدە پێشتر لەبارەی هەمان بیرۆکە نووسیویانە. تەنانەت زۆر لەوە پێشتریش دێرینەکان لەوانە توکیدیس Thucydides و کسەرکسیس Xerxes و تیمۆستۆکلیس Themostocles باسیان لە گرنگیی ئەو بیرۆکەیە کردووە. ماهان لە مەودایەکی فراواندا زیاتر لە هەر نووسەرێکی پێشوو لە بابەتەکەیدا سەرکەوت، کە وەك خۆی دەڵێ "شیکردنەوەیەکی مێژووە لە هەوڵێکدا بۆ ڕوونکردنەوەی نهێنیی ئەو ڕووداوانەی لە ماوەی ساڵانێکی دوور و درێژدا ڕوویان داوە. ڕێك کاریگەریی دەستگرتن بەسەر دەریا لە هەندێ ڕووداوی دیاریکراودا. کاتێك ئەو بوارە بەبەتاڵی بەجێهێڵرا، دەرفەتی بەمن بەخشی". ئەمە لەگەڵ ئەوەی، وەك زۆر لە ڕەخنەگران گوتویانە، تێڕوانینی ماهان بۆ مێژوو زۆر بەرتەسك بووە، زۆر لە هۆکارە زیندووەکانی فەرامۆش کردووە و تێڕوانینێکی تازەی بۆ سیاسەت و ئابووری دروست کرد.

ئەگەر وامان دانا ڕێبازەکانی ماهان لە ڕووی لۆژیکیەوە بۆ سەردەمی خۆی و سەدە ڕابردووەکان دروستن، ئایا بەهۆی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەی لە سەدەی بیستەمدا هاتۆتە کایە ئیتر بەسەرچوون و باویان نەماوە؟ بەجۆرێکی تایبەت، ئایا لە دنیای ئەمڕۆدا هێزی دەریایی باڵادەستە؟ پسپۆڕان لەم ڕووەوە ڕای جیاوازیان هەیە. لە جەنگی جیهانیی دووەمدا هێزی دەریایی ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا، بەڵام دەبوو بەتەواوی لەتەك هێزی ئاسمانیدا هاوکار بێ، لەبەرئەوەی ئەو کەشتیانەی فڕۆکە لە ئاسمانەوە پاسەوانییان نەکات، مەترسیی تێکشکاندنیان زۆر لەسەرە. ئەو پەرەسەندنەی پاش جەنگ هاتە کایە و لە "بۆمبە جەهەننەمیەکە" کەوتەوە،

سێبەرێکی بەسەر هێزە دەریاییەکانەوە دروست کردووە، چونکە ئەو بۆمبە لەتوانایدایە توانای کەشتیگەلێکی تۆکمە بەتەواوی پەک بخات. لەگەڵ ئەوەشدا دروستکردنی کەشتیگەلێکی گەورە لە ژێرئاوەکان لەلایەن روسیای سۆڤیەتی و پێداگریی ئەمەریکا لەسەر کەشتییە فڕۆکە هەڵگرەکان، بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی هێزی دەریایی هێشتا تەنانەت لە سەردەمی ئەتۆمیشدا پارێزگاری لە پێگەی خۆی کردووە.

بەبڕوای زانایان، پلەو پایەی ماهان وەك مێژوونووسێك، لەگەڵ ناوبانگە هاوچەرخەکەیدا هاوتا نابێ، چونکە سەرکەوتنە گەورەکەی جۆرێك بوو لە پڕوپاگەندە. لەکاتی مردنیشیدا ویلایەتە یەکگرتوەکان گەیشتە ئەو ئامانجانەی بۆی کێشابوو، ئەویش دروستکردنی دەریاییەکی جەنگیی مەزن، هەڵکەندنی تۆکەندی پەنەما، دامەزراندنی بنکەکان لە دەریای کاریبی و ئۆقیانووسی هێمن.

ئەو سەرکەوتنی فەلسەفەکەی خۆی بینی کە دەڵێ "ئەوەی حوکمی شەپۆلەکان بکات حوکمی دنیا دەکات". وا دەوڵەتە گەورەکان لە پێشبڕکێیەکی شێتانەدان لەپێناو هێزی دەریاییدا. وەك رەخنەگرێکی زمانتیژیش دەڵێ "هیچ تاکە کەسێك وا راستەوخۆ و بەقووڵی کاری لە رێبازی دەریایی و سیاسەتی نەتەوەیی ئەو هەموو نەتەوە زۆرانە نەکردووە". پسپۆڕێکی دەریایی فەرەنسیش دەڵێ ماهان "لە ماوەی ژیانیدا بەقووڵی مێژووی ئەو سەردەمەی گۆڕی کە تێیدا ژیا".



## ٩- "تەوەری جوگرافیی مێژوو"
## هالفۆرد ج. ماکیندەر Halford J. Mackinder
## دڵی کیشوەر و دورگە جیهانیەکە

لە ماوەی کەمێك پتر لە دە ساڵ پاش ئەوەی کاپتنی دەریاوان ماهان بەشێوەیەکی قایلکەر و بنبڕ نەشکانی هێزی دەریایی لە مێژوودا سەلماند، بەڵام ئیمکانی بەکارهێنانی ڕێبازەکانی لە ئایندەدا، ئەگەر نەڵێین راست و دروستیی پووچ کرایەوە، ئەوا بەرادەیەکی ترسناك هەڵتەکێنرا، ئەویش بەهۆی دوو فاکتەری نوێوە: یەکەمیان لە مەملەکەتی ماددیدا بوو کە ئەزموونە بەراییە سەرکەوتووەکانی جووتە برا رایت Wright بوو لە ساڵی ١٩٠٣ بە فڕۆکەیەکی بەهێز. دووەمیان لە مەملەکەتی هزردا بوو، کە کارنامەیەکی زانستی بوو ساڵی ١٩٠٤ زانای جوگرافیناسی ئینگلیزی هالفۆرد ماکیندەر نووسی و پاش ئەوە بە نازناوی "باوکی سیاسەتی جوگرافی" ناوی دەرکرد.

جیهان دەستبەجێ نەیزانی بایەخی ووروژێنەری ئەم دوو رووداوە لە کام لەم دوو حاڵەتەدایە، لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستە رووی گۆی زەوی بەشێوەیەکی درێژخایەن بەهۆیانەوە بگۆڕێ.

ئیتر ئیمکانی لەبەرهەڵوەشانی بیردۆزە شۆڕشگێڕیەکان لەئارادا نەمابوو. لە ٢٥ی یەنایەری ١٩٠٤ ماکیندەر لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی جوگرافیی شاهانە لە لەندەن کارنامە بەناوبانگەکەی بەناونیشانی "تەوەری جوگرافیی مێژوو" خوێندەوە، کە لە ٢٤ لاپەڕەی چاپکراو پێکدەهات، واتە لە بڵاوکراوەیەکی ئاسایی تێناپەڕێ. بەڵام شیکردنەوە نایابەکەی بۆ پەیوەندیی دووسەرەی نێوان جوگرافیا و سیاسەت

(واتە جیۆپۆلەتیک) لە رابردوو و ئێستا، لە سەرتاپای جیهاندا، بیرۆکەی نوێ بوون کە بیری سەرکردە سیاسییە جەنگیەکان و زانایانی ئابووری و جوگرافیا و مێژوونووسانی لە هەموو شوێنێك داگیر کرد.

لە کۆتایی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، ماکیندەر بە وردەکارییەکی درێژتر تیۆرەکەی خۆی لەبارەی "بەها باڵا دیموکراسی و راستەقینەکان" دەستکاری کرد. ئەگەرچی دەستکارییەکی بنچینەیی لە پرسە ئەسڵیەکەیدا نەکرد، چونکە ئەم کتێبە و بابەتەکەی پێشووی بەردی بناغەن لە زانستی نوێی جیۆپۆلەتیکدا، ئەویش تێکەڵکردنی جوگرافیا و زانستە سیاسیەکانە.

ماکیندەر تەمەنی ٣٤ ساڵ بوو کاتێك موحازەرە بەناوبانگەکەی دانا. باوکی ماکیندەر پزیشکێکی گوندنشین بوو، ساڵی ١٨٧٤ ناردی بۆ کۆلێژی ئیپسۆم و لەوێوە بۆ ئۆکسفۆرد و تۆماری خوێندنەکەی پڕ بوو لە درەوشانەوە. پاش ئەوە وەك وانەبێژی گەڕۆکی زانکۆی ئۆکسفۆرد لە زانستی جوگرافیادا بۆ ماوەی دوو ساڵ دامەزرا، پاشان لە ئۆکسفۆرد بە (موعید) لە جوگرافیادا دامەزرا و بە شێوازە جوڵاوەکەی لە فێرکردندا سەدان قوتابی بۆ لای خۆی راکێشا. پێداگرتنی لەسەر کۆمەڵەی جوگرافیی شاهانە گەورەترین کاریگەریی هەبوو لەوەی ئەو کۆمەڵەیە خەرجی یەکەم قوتابخانەی بەریتانی لە زانستی جوگرافیادا بکات ساڵی ١٨٩٩ و ماکیندەری کردە بەڕێوەبەری. ئەو ساڵانە کاتێکی باشی دەست کەوت تا لە هەڵگەڕان بە چیادا ناوبانگ پەیدا بکات. یەکەمین سەرکێشی سەرکەوتن بە چیای کینیای لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا ئەنجامدا.

لەگەڵ بەردەوامبوونی لە پۆستەکەی لە ئۆکسفۆرد، وەك موعید لە جوگرافیای ئابووری لە زانکۆی لەندەن وانەی دەگوتەوە و بەهۆی ئەو پۆستەوە ساڵی ١٩٠٣ بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئابووری لە لەندەن دامەزرا. لەبەر هۆگربوونی بەردەوامی بە زانستەکانی ئابوورییەوە چەند جارێك لەنێوان ساڵانی ١٩١٠-١٩٢٢

لە پەرلەمان هەڵبژێردراوە. لەگەڵ ئەوەیشدا تەواوی ژیانی زانستی بەر لە هەموو شت لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا بووە و خۆی بۆ پێشخستنی توێژینەوەی زانستیانەی جوگرافیا تەرخان کرد، بەتایبەت جوگرافیا وەك "روانگەیەکی ئینسانی".

ماکیندەر لە کتێبی "تەوەری جوگرافیی مێژوو"دا کە ئەو کاردانەوە بەرفراوانەی هەبوو، یەکەم شت تیۆری خۆی لەبارەی فەزای داخراو پێشکەش کردوە، کە ئەو بیرۆکەیە چل ساڵ دواتر بەهۆی ویندڵ ویلکیەوە لە وتاری "یەك جیهان"دا ناوبانگی پەیدا کرد. ماکیندەر باوەڕی وابوو "قۆناغی کۆلۆمبی" کە قۆناغی چوار سەدە دۆزینەوە و فراوانبوونی جوگرافییە، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا کۆتایی هاتووە. نووسی: "لە چوارسەد ساڵدا نەخشەی جیهان بە وردیەکی رێژەیی تەواو بوو".

ماکیندەر لە "بەها باڵا دیموکراسی و راستەقینەکان"یشدا بەشوێن هەمان بیرۆکەدا چووە و دەڵێ:

"لە کۆتاییدا گەیشتینە جەمسەری باکور و بینیمان لە ناوەڕاستی دەریایەکی قووڵدایە، هەروەها گەیشتینە جەمسەری باشور و بینیمان بەسەر دەشتایی بەرزاییەکی بەرزەوەیە، بەم دوو دۆزینەوەیەی دوایی، کتێبی پێشەنگان تەواو بوو. ئەم سەرکێشییە بە دۆزینەوەی دەشتاییەکی فراوانی زەویی بەپیت یان زنجیرە چیایەکی گرنگ یان روبارێکی پلەیەك پاداشتی خۆی وەرنەگرت. زیاد لەوەیش بەر لە تەواو جێگیربوونی موڵکە سیاسییەکانی هەموو بەشەکانی وشکانی، نەخشەی جیهان نەدەکێشرا..نێردەی مژدەدەرانی ئاینی و پەلاماردەر و کشتیار و دەرهێنەری کانەکان و بەم دواییانەیش ئەندازیاران، هەموو ئەوانە لەنزیکەوە شوێنپێی وڵاتگەڕان هەڵدەگرن، تەنانەت دنیا لەوپەڕی سنووریدا بەکەمی نەبێ بەر لە ساغبوونەوەی موڵکییەتە راستەقینە تەواوەکەی نەدۆزراوەتەوە. بەدەگمەن

ناوچەیەك لە ئەورووپا یان ئەمەریكای باكور یان ئەمەریكای لاتینی، یان ئەفریقیا یان ئوستراليا هەیە كە جێگیرنەبوونی موڵكیەتەكەی بەهۆی جەنگێكەوە نەبووبێ لەنێوان هێزە شارستانی یان نیوە شارستانیەكاندا".

لە نەوەدەكانی سەدەی هەژدەیەمدا، مێژوونووسێكی ئەمەریكی هەڵكەوتوو بەناوی فریدریك جاكسۆن تەرنەر بیرۆكەیەكی هاوشێوەی لەبارەی فەزای داخراو (الفضاء المقفل) دەربڕی ئەگەرچی بەشێوەیەكی سنوورداریش بوو، كاتێك لەبارەی بەرەی رابردوو و بایەخی لە مێژووی ئەمەریكیدا نووسی. جا ماكیندەریش هات و رایگەیاند ئەو بەرەیە لە جیهاندا دیار نەماوە.

ماكیندەر باس لە ئاسەوارە چاوەڕوانكراوەكانی دەسپێكەكەی تەرنەر دەكات و دەڵێ:

"لێرە بەدواوە، جارێكیتر پێویستە لەسەرمان لە سەردەمی پۆست كۆڵۆمبیدا باس لە سیستمی سیاسیی داخراو بكەین و دەبێتە یەكێك لە كایە جیهانیەكان. هەموو تەقینەوەیەك لە هێزە كۆمەڵایەتیەكاندا، لەباتیی ئەوەی لە بازنەی ئەو فەزا ناسراوەی دەوری داوە و لەو فەوزا بەربەریەدا بتوێتەوە، بەتوندی لەلای دووری گۆی زەویەوە دەشكێتەوە و لەئەنجامی ئەوەدا ئەو توخمە لاوازانە لە هەردوو قەوارەی سیاسی و ئابووریی جیهاندا تێكدەشكێن.. ئێستا هەست بە هەموو شۆك و هەموو كارەسات یان زیادەیەك دەكەین وەك چۆن ئەوانەی لە بەشی بەرانبەری ئێمە لە گۆی زەوی هەستی پێ دەكەن، لەوانەیشە لەوانەوە لە بەرانبەرمان دەژین بۆمان بگەڕێتەوە...بەم شێوەیە دەنگدانەوەی هەموو كردارێكی ئینسانی دەگەڕێتەوە و دەنگدانەوەكەی جارێكیتر.. بەدەوری جیهاندا دەگەڕێتەوە".

بەبڕوای ماكیندەر لە سیستمی داخراوی تایبەت بە سەردەمەكان و سووكیی ئەو جوڵە بێسنوورەی لە زەوی و ئاسمانەوە تێیدایە، دەبینین ئیتر سەردەمی هێزی دەریایی باڵادەست بەسەرچوو و كۆتایی هات. ئەگەر ئەمەیش راست بێ كەواتە

سەردەمی هێزێکی زەمینی هاتووە. ئەی ئیتر سەنتەری سروشتیی قۆناغی نوێ لە کوێدا بووە؟ دیارە لە بارستە گەورەکەی زەوی لە جیهاندایە، واتە لەو رووبەرە پان و بەرینەی ماکیندەر ناوی ناوە "ناوچەی تەوەری بۆ سیاسەتەکانی جیهان". لەنێو پێنج نەخشەدا بۆ روونکردنەوەی بابەتەکەی، دوایینیان شایستەی ئەوەیە ناوبنرێ "سەنتەرە سروشتیەکانی هێزەکان" و "ناوچە خولگەیی" پیشان دەدات. ماکیندەر تەوەری جوگرافی لە باکور و ناو ناوچەی ئەوروپای ئاسیاییدا پیشان داوە، کە لە ناوچەی جەمسەری باکور بۆ بیابانەکانی ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە، لە خۆرئاوایشەوە بۆ ئەو بەرزەخە بەرینەی لەنێوان دەریای بەڵتیق و دەریای رەشدایە.

بەگوێرەی ئەو شیکردنەوە مێژووییەی کە زۆربەی بابەتەکەی تایبەتە بەوە، ئەوروپا و باقیی دنیا بۆ چەندین سەدە لەژێر فشاری بەردەوامی ناوچەی تەوەردا بووە. "ئەوروپا لەژێر فشاری بەربەریەتی دەرەکیدا شارستانێتیەکەی بەدەست هێناوە، کەواتە من داواتان لێدەکەم ساتێك تەماشای ئەوروپا و مێژووی ئەوروپی بکەن وەك ئەوەی سەر بە ئاسیا و مێژووی ئاسیایین، لەبەرئەوەی شارستانێتیی ئەوروپی، بەمانایەکی زۆر راستەقینە، ئەنجامی ململانێیەکی دنیایی بووە دژی پەلاماری ئاسیایی. گرنگترین دژیەکی لە نەخشەی سیاسیی ئەوروپای نوێدا رووبەری روسیایە کە نیوەی رووبەری کیشوەرەکەی گرتووە، هەروەها کۆمەڵێ زەویی بچوك بچوك کە هێزە عەرەبیەکان تێیدا نیشتەجێن".

بە سەرنجدان لە چوونەیەك و کشان لە مێژووی ئەوروپیدا ماکیندەر قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێ "بۆ ماوەی هەزار ساڵ، کۆمەڵێ گەلی ئەسپسوار لە ئاسیاوە لەرێی ئەو درزە بەرینەی دەکەوێتە نێوان چیاکانی ئۆراڵ و دەریای قەزوین، دەرکەوتوون. بە ئەسپەکانیانەوە لەو مەودا کراوەیەی باشووری روسیاوە رۆیشتوون و لە مەجەر (هەنگاریا) لە جەرگەی نیمچە دورگەی ئەوروپی خۆیدا

جێگیر بوون. ئەوانە –بەتەبیعەتی حاڵ بەو بەرهەڵستیەی کراون– مێژووی هەموو گەلانی مەزنی هاوسێیان دروست کردووە –روس و ئەڵمان و فەرەنسی و ئیتاڵی و یۆنانی و بیزەنتیەکان".

لە روانگەی کاریگەرییەوە، پەلامارەکانی مەغۆل لە هەردوو سەردەی چواردە و پازدەدا، کاریگەرییەکی قووڵیان بووە و زۆر لە ئەوروپای ناوەڕاست و روسیا و فارس و هیند و چینیان راماڵی. ئەو پەلامارانە لەوەی ماکیندەر ناوی دەنێ "ناوچەی تەوەر" یاخود "ناوچەی خولگە"وە هاتن و "هەموو ئەو سنوورانەی لە جیهانی کۆندا رێکەوتنیان لەسەر کراوە، دەستبەجێ یان پاش ماوەیەك هەستیان بە هێزی گەورەی ئەو دەسەلاتە بزۆزە کرد کە لە دەشتاییەکانی ستێپس Stepsدا پەیدا بوو".

ماکیندەر تیشکی مێژووەکەی خستە سەر زەمەنەکانمان و بینی ناوچەی تەوەر شانبەشانی گەشەی لە رووی هێزی ئابووری و جەنگیەوە، قورسایی خۆی بەسەر کاروباری جیهانەوە داناوە. لە روانگەی مێژووییشەوە بەبەڵگە "پێداگریەکی دیاریکراوی بۆ پەیوەندیی جوگرافی" بینی، لەبەرئەوەی–

"ئایا ناوچەی تەوەر بۆ سیاسەتی دنیا ئەو رووبەرە فراوانەی نێوان ئۆرال–ئاسیا نیە کە کەشتیەکان ناتوانن پێی بگەن، بەڵام لە زەمانی کۆندا لەبەردەم دەشتەکییە ئەسپسوارەکاندا کراوە بوو و ئەمڕۆ خەریکە تۆڕێکی هێڵی ئاسنین دایدەپۆشێ؟ پێشتر و هێشتایش هەلومەرجێك هەیە کە هێزی سەربازی و ئابووری بەجۆرێك دەبزوێنێ کە دەگاتە مەودایەکی دوور، بەڵام لە جۆرێکی دیاریکراو. روسیا جێی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل دەگرێتەوە و فشارەکانی لەسەر فینلەندە و ئەسکەندەنافیا و پۆڵەندە و تورکیا و فارس و هیند و چین جێگەی پەلامارەکانی پیاوانی ستیپس بەرەو دەرەوە دەگرێتەوە. ئەو سەنتەری ستراتیژیی ناوەڕاست لە هەموو جیهاندا دەگرێ، ئەو سەنتەرەی ئەڵمانیا لە ئەوروپا گرتویەتی. دەتوانێ

بە هەموو لایەكدا بوەشێنێ، هەروەها لە هەموو لایەكیشەوە لێی بدرێ جگە لە باكور".

ماكیندەر دوو هیلال لە دەرەوەی ناوچەی تەوەر دیاری دەكات. هیلالە گەورەكە هەریەك لە ئەڵمانیا و نەمسا و هیند و چین دەگرێتەوە، هیلالە دەرەكیەكەیش بەریتانیا و باشووری ئەفریقیا و ئوستورالیا و ویلایەتە یەكگرتووەكان و كەنەدا و ژاپۆن لەخۆ دەگرێ. لەڕاستیدا هێزی ناوچەی تەوەر هاوتای دەوڵەتانی كەناری رووی دەرەوەی دوو هیلالەكە نەبووە. لێرەدا ماكیندەر ترسی گەورەی پیشان دەدات و دەڵێ "لەوانەیە ئەمە رووبدات مەگەر ئەڵمانیا لەگەڵ روسیا هاوپەیمانی ببەستێ. لەم حاڵەتەدا دەوڵەتی تەوەر دەتوانێ بەسەر وڵاتانی كەناریی ئۆرال-ئاسیادا بكشێ و داهاتی كیشوەریی زەبەلاح بۆ دروستكردنی كەشتیگەلێك بەكار بێنێ، ئەوكاتە ئیمپراتۆریەتی جیهان دیار دەبێ".

ماكیندەر گوتارە بەناوبانگەكەی بە جەختكردن لەوەی ئەو وەك زانایەكی جوگرافی قسە دەكات، كۆتایی پێ هێنا. ئامارەی بەوەیشدا كە "هاوسەنگیی راستەقینەی هێزی سیاسی لە هەر كاتێكی دیاریكراودا، ئەنجامی لێكدانی بارودۆخی جوگرافییە لە رووی ئابووری و ستراتیجیەوە، لەگەڵ ژمارەی رێژەیی جوامێریی تەواو و كەرەستە و رێكخستنی گەلە ركابەرەكان". بەمەزەندەی ئەو "لەم حسابەدا چەندایەتییە جوگرافیەكان لە چەندایەتییە بەشەریەكان زیاتر بۆ پێوانەكردن دەست دەدەن و تارادەیەك جێگیرتریشن". بایەخی جوگرافیی شوێنی تەوەر بەوە ناگۆڕێ كە گەلێكیتر جگە لە گەلی روسی تێیدا نیشتەجێ بێ.

بۆ نموونە ئەگەر ژاپۆنی و چینیەكان خۆیان بۆ شكاندنی ئیمپراتۆریەتی روسی و داگیركردنی زەویەكانی ساز كرد، ئەوا دەبنە مەترسیی زەرد لەسەر ئازادیی جیهان، لەبەرئەوەی دەبنە بەرەیەك لەسەر ئۆقیانووس بۆ سەرچاوە مەزنەكانی كیشوەرەكە. ئەمەیش تایبەتمەندیەكە روسەكانی نیشتەجێی تەوەر نەیانبووە.

ماكیندەر، لەكاتی نووسیندا، لە كۆتایی جەنگی جیهانیی یەكەم هەستی بەوە كرد كە "جەنگ لەباتیی ئەوەی بۆچوونەكانی رابردووی بەهێزتر بكات، پاڵپشتی كردوون". لە بابەتی "بەها باڵا دیموكراسی و راستەقینەكان"دا لە تاوتوێكردنی "ناوچەی تەوەر" بەردەوام بوو كە ئەوكاتە وەك "دڵ یاخود دڵی كیشوەرەكە" ئاماژەی پێدابوو كە دەكەوێتە ناوەڕاستی "دورگە جیهانیەكە" (مەبەستی گۆی زەوییە كە وەك دورگەیەك وایە–وەرگێڕ).

بەلای ماكیندەرەوە ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیا سێ كیشوەر نەبوون، بەڵكو یەك كیشوەر بوون ئەویش "دورگە جیهانیەكە"یە. لەو رووەوە دەریا بەسەر بیركردنەوەی مرۆڤدا زاڵ بووە، ئەو پانتاییە بەرفراوانەی بە دورگە دانەناوە، لەبەرئەوەی سوڕانەوە بەدەوریدا لە دەریاوە مەحاڵ بووە.

ماكیندەر ئاماژەی بەوەدا "چینێك بەفر كەوتۆتە سەر دەریای جەمسەری باكور كە پانیەكەی دوو هەزار میلە، یەكێك لە لێوارەكانی لەسەر زەوییەكی تەنكە لە باكوری ئاسیا. كەواتە كیشوەرەكە لە رووی ئامانجی دەریاوانیكردنەوە دورگەیەك نیە". جگە لەم راستییە و رووبەرە بەرینەكەی، هیچ جیاوازی لە دورگەكانیتر نیە. دورگە جیهانیەكە لە ماوە و ژمارەی دانیشتواندا بەسەر باقیی زەویدا زاڵە. لە رووی زەویەوە، ئەم دوورگەیە دوو سێیەكی هەیە، سێیەكەكەیتر بۆ هەردوو ئەمەریكای باكور و باشور و ئوسترالیا و ناوچە بچوكەكانیتر. زیاد لەوەیش حەوت لە هەشت بەشی دانیشتوانی جیهان لەم دورگەیەدا دەژین، لەكاتێكدا تەنیا هەشت–یەكەكەیتر لە باقیی زەویەكانیتردا دەژی. كەواتە، ماكیندەر تێبینی كردبوو دنیای كۆن "یەكەی جوگرافیی مەزنە لە گۆی زەویماندا".

ماكیندەر پاش ئەوەی "رێژە و پەیوەندی"یەكانی دورگە جیهانیەكە روون دەكاتەوە، درێژەی دەداتێ و دەڵێ: "ئەگەر ماوەكە لەنێوان جەمسەری باكور بۆ جەمسەری باشور بەدرێژیی ئاسیا بپێوین، ١٠٠٠ میل دەریای داپۆشراو بە بەفر تا

کەناری باکوری سیبریا دەبینین، پاشان ٥٠٠٠ میل لە زەوی بۆ بەشی باشوری هیند، ئەنجا ٧٠٠ میل لە دەریاوە بۆ زەویی داپۆشراو بە بەفر لە جەمسەری باشور. بەڵام ئەگەر بەدرێژیی ناوەڕاستی بەنگال و دەریایی عەرەبی ببڕێوین، ئەوا ئاسیا تەنیا ٣٥٠٠ میلە. لە پاریسەوە بۆ ڤالدیڤۆستۆک ٦٠٠٠ میل و لە پاریسەوە بۆ سەرلوتکەی هیوایش هەمان ماوەی پێشووە".

ماکیندەر دەڵێ "هەردوو ئەمەریکا و ئوستralیا نەک هەر لە رووی رووبەرەوە بچوکن، بگرە ئەو هێزە مرۆیی و سەرچاوەی سروشتیەیش تێیاندایە زۆر کەمترە لەوەی لە "کیشوەری مەزن" یان "دورگە جیهانیەکە"دا هەیە. دەپرسێ: "چی دەبێ ئەگەر کیشوەری مەزن یان دورگە جیهانیەکە، یان بەشی هەرەزۆریان، لە کاتێکی ئایندەدا ببونە بنکەیەکی یەکگرتوو لە هێزی دەریایی؟ ئایا لە رووی کەشتی و پیاوانی کەشتیەوانەوە بەسەر بنکە دورگەییەکانیتردا باڵادەست نابن؟".

ئەگەرچی ئەڵمانیا بەزی، بەڵام هێشتا ئەگەری ئەوە هەیە بەشێکی گەورەی کیشوەری مەزن رۆژێ لە رۆژان لەژێر سایەی حکومەتێکدا یەکبگرێتەوە و هێزێکی دەریایی مەزنی وای لەسەر دروست بکرێ کە لە شکان نەیەت. ماکیندەر هۆشداری دەدات: "ئەگەر ئەڵمانیا جەنگی ببردایەتەوە هێزی دەریایی خۆی لەسەر بنچینەیەکی فراوانتر لە هەر هێزێک لە مێژوودا بنیات دەنا. لەڕاستیدا لەسەر فراوانترین بنکە دەبێ".

دڵی کیشوەر (قلب القارة)ەکەی ماکیندەر، لە بنەڕەتدا هەمان سنووری تەوەری پێشووی هەیە. دڵی کیشوەرەکە ناوچەی ناوەڕاستە لە ئەوروپا و ئاسیای دوور کە دوورە لە ئەگەری دەستبەسەرداگرتن لەلایەن هێزی دەریاییەوە. "دەریای بەڵتیق و ناوەڕاستی روباری دانوبی لەبار بۆ دەریاوانی و بەشەکەی لەلای رێژگەکەوە و دەریای رەش و ئاسیای بچوک و ئەرمینیا و فارس و تبت و مەنگولیا، دەگرێتەوە. کەواتە دڵی کیشوەرەکە پروسیا براندنبێرگ Brandenburg prussia و

نەمسا و مەجەر و هەروەها روسیا لەناوەوەیدا لەخۆ دەگرێ. ئەوە شێوە سێگۆشە و خاوەن هێزێکی مرۆیی مەزنە کە ئەسپسوارانی مێژوویی نەیانبوو"..

ماکیندەر باسی دەریای بەڵتیق و دەریای رەشی لەو ناوچەیەدا کردووە، لەبەرئەوەی لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا دەرکەوت گەیشتن پێیان، یان دەستبەسەرداگرتنیان لە دەرەوەوە بەهەر هێزێکی دەریایی، مەحاڵە.

ماکیندەر قسەکەی بە خستنەڕووی پێناسەیەکیتر بۆ "دڵی کیشوەر" تەواو دەکات بەوەی "بریتییە لە یەك بارودۆخی سروشتیی گرنگ کە هەموویان لە لێواری چیاکانی فارس کە بەسەر زەویی میزۆپۆتامیا (عێراق)ی زۆر گەرمدا دەڕوانێ، لەکاتی زستاندا لەژێر بەفردا، بەیەکەوەیان دەبەستێ... لە ناوەڕاستی زستاندا وەك لە مانگەوە دەیبینین قەڵغانێکی پان و بەرین هەیە و دڵی کیشوەرەکە لە گەورەترین مانایدا دەردەکەوێ..". ماکیندەر باوەڕی وابوو ئەم رووبەرە کلیلی دورگە جیهانیەکەیە. بەگشتی لە چیاکانی هیمالایاوە بۆ ئۆقیانوسی بەستەڵەکی باکور، هەروەها لە روباری فۆلگاوە بۆ روباری یانگتز درێژ دەبێتەوە. بەدووریی ۲۵۰۰ میل بەرەو باکور و باشور و ۲۵۰۰ میلیتر بەرەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەکشێ. ئەم دڵی کیشوەرە ئەگەر بەشێوەیەکی دروست گەشە بکات و لە رووی سەربازیەوە رێك بخرێ، دەکرێ ببێتە سەنتەر و خولگەی هێزێکی جیهانیی کاریگەر.

ماکیندەر بەڵگەکانی لە چەند گوتەزایەکدا کورت کردەوە کە بوونە قسەی سەر زاران، لەوانە:

ئەوەی حوکمی رۆژهەڵاتی ئەورووپا بکات دەست بەسەر دڵی کیشوەرەکەدا دەگرێ. ئەوەی حوکمی دڵی کیشوەرەکەیش بکات دەست بەسەر دورگە جیهانیەکەدا دەگرێ. ئەوەیش دەست بەسەر دورگە جیهانیەکەدا بگرێ، دەست بەسەر دنیادا دەگرێ".

بۆ ئەوەیش رێگە لەوە بگیرێ نەتەوەیەکی دیاریکراو بەتایبەت روسیا یان ئەڵمانیا، بەهۆی جەنگی جیهانیی یەکەمەوە لە دڵی کیشوەرەکەدا باڵادەست بن، ماکیندەر ئامۆژگاری دروستکردنی بەربەستێك لە دەوڵەتانی کرد کە بەریەککەوتنەکە لە دەریای بەڵتیقەوە بۆ دەریای رەش هەڵبمژێ. بە تێڕوانینی ماکیندەر دەوڵەتە سەربەخۆکان بریتین لە ئیستۆنیا و لیتوانیا و بۆهیمیای مەزن و مەجەر و سربیای مەزن و رۆمانیای مەزن و بولگاریا و یۆنان. ئەم لیستە کەمێك لەوەی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس بڕیاریدا جیاواز بوو. لەبەر تیشکی مێژووی نوێدا، ماکیندەر هەڵەیەکی گەورەی کردووە، ناوچەی هەڵمژینی بەریەککەوتنەکە ئامانجی خۆی نەپێکا، چونکە سەرەتا ئەڵمانیا و پاشان روسیا ئەو بەربەستەیان بەزاند.

لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا لە ساڵی ١٩٤٣، چوار ساڵ پێش مردنی ماکیندەر، بۆ جاری سێیەم لە وتارێکدا بەناونیشانی "جیهانی خڕ و بردنەوەی ئاشتی" تیۆری دڵی کیشوەر (قلب القارە)ی تاقیکردەوە و بینی بیرۆکەکەی "ئەمڕۆ راستتر و بەکەڵکترە لە بیست یان چل ساڵی رابردوو". جا پێشبینی دەکات "ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەت لە جەنگدا ئەڵمانیا ببەزێنێ، ئەوا دەبێ مەزنترین دەوڵەتی دنیا بێ. زیاد لەمەیش دەبێتە هێزی خاوەن بەهێزترین سەنتەری ستراتیژی لە رووی بەرگریەوە، چونکە دڵی کیشوەر گەورەترین قەڵای سروشتییە لەسەر زەوی. بۆ یەکەم جاریش لە مێژوودا، حامیەیەکی تەواو لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، دەستی بەسەردا دەگرێ.

هیچ دەوڵەتێك وەك ئەڵمانیا هۆگری تیۆرەکانی ماکیندەر نەبووە. بەگوێرەی تەفسیری کارل هۆشۆفەر نووسەری بابەتە جوگرافیەکان کە کتێبی زۆری هەیە، بیرۆکە بنچینەییەکەی ماکیندەر لەبارەی دڵی کیشوەری ناو دورگەیەکی جیهانی، بۆ ماوەی بیست ساڵ (١٩٢٥–١٩٤٥) بەسەر بیری سیاسیی ئەڵمانیدا زاڵ بووە.

هۆشۆفەر لە کاتێکی زوودا ناوبانگی پەیدا کرد، کە بۆ ساڵی ۱۹۰۸ دەگەڕێتەوە کاتێك وەك تێبینەرێکی جەنگیی فەرمانبەرانی سەرکردەی ئەڵمانی، رەوانەی ژاپۆن کرا و چڕی کردە سەر بایەخدان بە تێگەیشتن لە کاروباری رۆژهەڵاتی دوور، وەك پسپۆڕێك ناسرا، لەڕێی بەهرەیەکی ناوازەوە بۆ لەبەرکردنی زمانەکان، فێری قسەکردن بە شەش زمانی بیانی بوو، لەوانە چینی و ژاپۆنی و کۆری و روسی. هەروەها گەشتەکانی فراوان کرد تا لەنزیکەوە لە هەردوو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دوور شارەزا ببێ. هۆشۆفەر لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە پلە سەربازیەکاندا سەرکەوت و بە پلەی مەیجەر ژەنراڵ خانەنشین کرا. پاش خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا، ئەو ماوەیەی لە ژیانی زانستیدا مابوو سەرقاڵی نووسین لە بواری جوگرافیای سیاسی و فێرکردنیەوە سەرقاڵ بوو و خامەکەی ژمارەیەك کتێب و نامیلکە و وتاری نەخشاند.

نازانین هۆشۆفەر کەی بۆ یەکەم جار چاوی بە کتێبەکەی ماکیندەر کەوتووە و رەنگە لە سەرەتاکانی بیستەکامی سەدەی بیستەمدا بووبێ. هۆشۆفەر دەستبەجێ زانی مامۆستای خۆی دۆزیوەتەوە و رایگەیاند کە قەرزاری ئەوە. بۆ نموونە ساڵی ۱۹۳۷ لەبارەی کارنامەکەی ماکیندەر لە ساڵی ۱۹۰٤، نووسی کە "لە ژیانیدا شتێکی نەدیوە لەو لاپەڕە کەمانە بۆ شاکارەکانی سیاسەتی جوگرافی مەزنتر بێ". دوو ساڵ پاش ئەوە باسی بابەتی هاوپەیمانیەکی ئەڵمانی روسی کرد و ئاماژەی بەوە کرد کە ماکیندەر بۆچوونی بەریتانیای دەربارەی ترس لەو هێزەی ئەو دوو دەوڵەتە دەیانبێ ئەگەر یەکبگرن، وەرگرتووە. هۆشۆفەر زۆر جار ئاماژەی بەو حیکمەتەی ئۆڤید دەکرد کە دەڵێ "پێویستە زمانی دوژمن فێر ببین".. نەخشەکەی ماکیندەر بۆ دڵی کیشوەر لانیکەم چوار جار لە گۆڤاری Zeitschrift fur Geopolitik چاپ کراوەتەوە. هەروەها بەبێ دوودڵی دانی بەوەدا نا کە بیرۆکەکانی لەسەر بنچینەی بیرۆکەکەی ماکیندەر دامەزراوە.

رودۆڵف هێسی هاوڕێی هەردووکیان، ئەڵقەی پەیوەندی بوو لەنێوان هۆشۆفەر و هیتلەردا. کاتێك هیتلەر ساڵی ١٩٢٣پاش کێشەی بیرەخانەی پوچەر Beer Hall Putsch لە بەندیخانەدا بوو، هۆشۆفەر چەند جارێك سەردانی کرد. هیتلەر لە چەند شوێنێکی کتێبەکەی "خەباتەکەم"دا ئەوەی روون کردۆتەوە کە هەندێ ڕێبازەکانی جوگرافیای سیاسی لە هۆشۆفەرەوە وەرگرتووە. کاتێك دە ساڵ پاشتر نازیەکان سەرکەوتن هۆشۆفەر لە پێگەیەکی سەرکردایەتیدا بوو کە دەیتوانی کار لە سیاسەتی دنیا بکات. کاتێك کرا بە سەرۆکی پەیمانگەی سیاسەتی جوگرافی نازی، ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەری گرت تا زەوی بکێڵن بەمەبەستی بەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی سروشت و هەلومەرجی بژێوی و زانیاریتری جوگرافی خاوەن بایەخی گەورەی جەنگی.

کاتێ هۆشۆفەر بە بیرۆکەکانی ماکیندەر سەرسام بوو، بیرۆکەی ئەوەی پێویستە ئەڵمانیا دەست بەسەر دڵی کیشوەرەکەدا بگرێ بوو بەمەراقی. وێنەکانی بەدرێژایی کیشوەرەکە لە روباری راین بۆ روباری یانجستی بڵاو بوونەوە و چڕی کردە سەر پلانەکەی بۆ رووداني هاوپەیمانیەکی زەبەلاح لەنێوان ئەڵمانیا و ژاپۆن و چین و روسیا و هیند دژ بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی.

دەستەی گشتیی فەرمانبەرانی ئەڵمانی رەزامەندییان لەسەر رێنماییەکانی دا و پاڵپشتییان کرد. ساڵی ١٩٣٩دەست بەئیمزاکردنی میساقی نازی و سۆڤیەتی کرا و خەونەکەی هۆشۆفەر هاتەدی، بەڵام هەموو سیاسەتەکەی بەباچوو کاتێك هیتلەر گەورەترین هەڵەی کرد و کۆتاهاتنی جەنگی جیهانیی دووەمی خێرا کرد کاتێك فەرمانی بە فەرماندەکانی کرد هێرش بکەنە سەر یەکێتیی سۆڤیەت. ماوەیەکی کورت پاش برانەوەی جەنگ، هۆشۆفەر و ژنەکەی لە خانووە بافارییەکەیاندا خۆیان کوشت.

شتێکی سروشتییە کە رەخنەگران هۆشۆفەر تۆمەتبار دەکەن بەوەی ئەو بوو بنچینەی رێبازی جەنگیی نازی دانا، بەڵام ماکیندەر لەو وتارەی رۆژی ١٩٤٤دا پێشکەشی کرد ئەو تۆمەتەی رەت کردەوە کاتێ گوتی: "زانیومانە هەندێ دەنگۆ بڵاو بوونەتەوە کە من هەندێ بیرۆکەی سیاسەتی جوگرافیم داوەتە هۆشۆفەر ئەویش داویەتیە هیس، کە ئەویش لای خۆیەوە پێشنیاری کردووە بۆ هیتلەر لەوکاتەی بە نووسینەوەی کتێبەکەی "خەباتەکەم"ەوە خەریك بوو، گوایە من سەرچاوەی ئەو بیرۆکانەم. ئەوانە سێ ئەڵقەن لە زنجیرەیەکدا، بەڵام من هیچ لەبارەی ئەڵقەی دووەم و سێیەم نازانم. لەگەڵ ئەوەیشدا من لە دەلیلی قەڵەمەکەیەوە ئەوە دەزانم کە هەرچی هۆشۆفەر لە منی گواستۆتەوە، لە وتاری "تەوەری جوگرافیی مێژوو" وەریگرتووە کە چل ساڵ لەمەوبەر لەبەردەم کۆمەڵەی جوگرافیی شاهانەدا پێشکەشم کرد، ماوەیەکی درێژ بەر لەوەی هیچ پرسێك لەبارەی حزبێکی نازی لەئارادا بێ".

دیارە بڵاوبوونەوەی رێبازەکانی جوگرافیای سیاسی تەنیا لە ئەڵمانیادا قەتیس نەبوو. رووسەکان بەدەگمەن نەبێ لە ئەڵمانەکان چالاکییان کەمتر نەبوو. نووسینگەیەکی جوگرافی پێشکەوتوو هەبوو ئەویش پەیمانگەی مۆسکۆ بۆ ئابووری و سیاسەتی جیهانی بوو، کە دەمێك بوو بایەخی بە کێشەی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و دورگە جیهانیەکە دەدا، کە یەکێتیی سۆڤیەت چاوی لەوە بوو دەستی بەسەردا بگرێ. شتێکی خۆشە لەم بارەوە رای ماکیندەر لە روسیا لە ساڵی ١٩١٩ بزانین کاتێك حکومەتە کۆمۆنیستەکە هێشتا لە سەرەتای کاریدا بوو. باوەڕی وابوو پلەنگ قەت ناوچەکانی ناگۆڕێ "جۆری حکومەتی بەریتانی و ئەمەریکی و بەها باڵاکانی کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ ئەو سیاسەتە ناگونجێ کە لە قاڵبی زۆرداریی رۆژهەڵاتی ئەوروپا و دڵی کیشوەرەکەدا ناگونجێ، چ لەسەر سیستمی بنەماڵە حوکمڕانەکان Dynastic بێ یان بەلشەفی Bolshvik.

لەوانەیە حاڵەتی ملهوڕیی بەلشەفی پەرچەکردارێکی پەرگیرانە بێ بۆ ملهوڕیی بنەماڵەیی. بەڵام ئەوە راستە کە دەشتەکانی روسیا و پروسیا و مەجەر، لەگەڵ هاوئاهەنگیی حاڵەتە کۆمەڵایەتییە فراوانەکەیان لە چوارچێوەیەکی پان و بەریندا، بۆ رێڕۆیشتنی سەربازان و پڕوپاگەندەی سەندیکایی لەبارە.

راستیی تیۆرە جوگرافیەکانی ماکیندەر بەدوور و درێژی تاوتوێ کراون و هەموو ئەو خاڵانە سەرژمێر کراون کە کەمترین گومانیان لەسەرە. لە عەیبە ئاشکراکانی، سەرنەکەوتنی ماکیندەرە لەوەی حساب بۆ توانا گەورەکانی هێزی دەریایی بکات. بەڵام لە نووسینەکانی دواتر دانی بەوەدانا کە هەڕەشەی کەش جۆرە یەکێتیەکی بەسەر جیهاندا سەپاندووە، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەم پێشکەوتنە پاڵپشتیی "دڵی کیشوەر"، واتە خەباتی دورگە جیهانیەکەی کردووە و لاوازی نەکردووە. بەڵام رەخنەگران سوورن لەسەر ئەوەی هێزی دەریایی بووەتە چەکێکی وا ترسناك بەرادەیەك وای کردووە تیۆری دڵی کیشوەر بایەخە ستراتیژیەکەی لەدەست بدات، چونکە هێڵە ئاسمانیەکان ئێستا ئۆقیانووس و کیشوەرەکان لە هەموو لایەکەوە دەبڕن. هێریك Herric بەم شێوەیە کۆمێنت دەدات:

"هەوا جیهانی و هی هەمووانە. تاکە رێگەیەکی فراوانە کە بەپێی ئیرادە سەر زەوی یان دەریا وەك یەك دەبڕێ. هێزی ئاسمانی تەنیا بە هێزێکی ئاسمانی بەرپەرچ دەدرێتەوە و دڵی کیشوەر ناناسێ کە تەواو لێی دوورە. دەشێ یاسای ستراتیژیی ئێستا ئەمە بێ "ئەوەی سورای فرۆکەکان ببێ دەست بەسەر بنەکەکاندا دەگرێ، ئەوەیش دەست بەسەر بنکەکاندا بگرێ دەست بەسەر ئاسماندا دەگرێ، ئەوەیش دەست بەسەر ئاسماندا بگرێ دەست بەسەر جیهاندا دەگرێ".

وەیگرت Weigert دەڵێ "چیتر نە مەحاڵی گەیشتن و نە دووری، دڵی كیشوەرمان لێ ناشارێتەوە. چیتر نەكەوتۆتە پشت شوورەی شوێنێكی سەخت و بەهێز كە چوونە ناوی مەحاڵ بێ، چونكە فڕۆكە نوێ دوور مەوداكان لە ماوەی پەنجا ساڵ پاش هۆشداربیە شوومەكانی ماكیندەر، ناوچەكانی جەمسەری باكوریان بەزاند. زیاد لەوەیش، هەمان قەبارەی دڵی كیشوەر بەربەستێكی سەختە لەبەردەم هێزی بەرگریدا. ئەو درێژییە گەورەیەی روسیای سۆڤیەتی و كەنارەكانی دەریاكان، بۆ نموونە، ئەگەری ئەوە زیاد دەكەن فڕۆكەكانی دوژمن ئامانج بپێكن و كێشەیەكی زۆر ئاڵۆزی بەرگریكردن دروست دەكەن. بەگوتەی ماكیندەر "لەكاتێكدا دەكرێ لە هەموو لایەكەوە بوەشێنێت، دەشكرێ لە هەموو لاوە لێی بدرێ".

خاڵێكی گرنگ هەیە كە ماكیندەر نەیبینوە، چونكە نەیتوانیوە دەرك بەو پێگە بەهێزە بكات كە هەردوو ئەمەریكاكە داگیری دەكەن. لەكاتی نوسینی كتێبەكەی "بەها باڵا دیموكراسی و راستەقینەكان"دا ماوەیەكی كورت بوو لە جەنگی جیهانیی یەكەمدا نمایشێكی هێز و توندوتیژیی هێزی ئەمەریكای بینی. پێدەچێ ئەوكاتە لە تێڕوانینیدا بۆ زەوی سەرقاڵ بووبێ بە بیرۆكەی دڵی كیشوەر و دوورگە جیهانیەكەوە، لەبەرئەوە دنیا نوێكە (واتە ئەمەریكا)ی تەنیا وەك ناوچەیەكی كەناری و "تەنیا شوێنكەوتەیەكی كیشوەرە كۆنەكە" بینی.

سەرەڕای خراپیەكانی پێشبینیی ماكیندەر، بەڵگەی بەهێز هەن كە پاڵپشتی راكانی دەكەن. یەكێتیی سۆڤیەت حوكمێكی نوێی لەسەر دڵی كیشوەر دامەزراند و لە رێی پێشكەوتنی كشتوكاڵی و پیشەسازی و كەڵك وەرگرتن لە كانزاكان و هێڵی ئاسنین و دامەزراوەكانی بواری ئاسمانیەوە، ناوچەكەی كردە بەهێزترین ناوچەی جیهان لە رووی ئابووری و جەنگیەوە. هەروەها ئەگەرچی لە بیست ساڵی رابردوودا دەستی بەچەند پلانێكی پێنجساڵی كردووە، ئەو ناوچەیە نەگەیشتە ئەو

ئاسـتی توانـای بەرهەمهێنانـەی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان هەیـەتی. ئەگەرچـی یەکێتیی سۆڤیەت حوکمی دڵی کیشوەر دەکات، هێشتا دوورە لە ئامانجەکـەی لـە دەستگرتن بەسەر دورگە جیهانیەکەدا، چ جای جیهان.

رەخنە لاوازیی هەندێ لە وردەکاریی بۆچوونەکانی ماکیندەری دەرخستووە، بەڵام بنچینە ئەسڵیەکانی پـووچ ناکاتـەوە. ماکینـدەر دەیویسـت هاوڵاتیـانی و گـەلانی وڵاتـانیتری دیمـوکرات هـان بـدات بـۆ باوەڕهێنـان بـەوەی راسـتییە جوگرافیـەکان گرنگیەکی بنچینەییان هەیە لە گەشەی گەل و دەوڵەتاندا. بـاوەڕی وابـوو دنیـا لـە ئاشـتیدا نـاژی بـۆ دیموکراسـی تـا بەتـەواوی لـە راسـتییە جوگرافیـەکان نەگـەین. بنچینەکانی جوگرافیای نوێ لەسەر بۆچـوونەکانی ماکینـدەر دەربـارەی جیهـان و ناوچەکانی دانراوە.



## ١٠- "خەباتەکەم"
## ئەدۆلف هیتلەر Adolf Hitler
### شێتیی مەزنی

کاتێ حزبی نازی بەسەرکردایەتیی هیتلەر دوای شلۆقیەکی پڕ لە توندوتیـژی کە زیاتر لە دە ساڵی خایاند، ساڵی ١٩٣٣ جڵەوی دەسەڵاتی لە ئەڵمانیا گرتە دەست، جیهانی بە کارە توندوتیـژەکانی تۆقاند. سیستمی حوکمڕانی لە چەسپاندنی چاودێریکردنیدا هەڵەشە بوو، دەستبەرداری سەرجەم سیستمە دیموکراسیەکانی حکومەت بوو و بێبەزەییانە بۆچوونە نەیارەکانی راگرت، کەنیسە و کۆمەڵە خێرخوازی و سەندیکا کرێکاریەکانی چەوساندەوە یان بردنیە پاڵ خۆی. ژمارەیەکی زۆر جولەکەی کوشت و لەڕێی شەپۆلی لەدوای یەکی پڕوپاگەندەوە بەئاشکرا هەڕەشەی لە گەلانی دراوسێ دەکرد.
لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر غەیرە ئەڵمانەکان خۆیانیان ماندوو بکردایە و بەوردی کتێبێکی قەبەیان بەناونیشانی "خەباتەکەم" Mein Kampf بخوێندایەتەوە، بەرنامەکەیان بەتەواوی وردەکارییە شەرمهێنەکانیەوە بەروونی لەبەردەمیاندا دەبینی. سوپاس بۆ چاودێریی نێودەوڵەتی لەسەر چاپکراوەکان، لەبەرئەوەی کتێبەکەی سەرکەوتوو بوو لەوەی تەواوی چیرۆکەکە تایبەت بکات بە چینی رەسەنی ئەڵمانی. تەنانەت ئەگەر دەقە ئەسڵییە نەخۆشەکە تەرجەمەیش بکرایە و بەئازادی بەئینگلیزی و فەرەنسی و زمانەکانیتر دەستاودەستی پێ بکرێ، ئەوا زۆر کەس بە "خەونێکی خەیاڵیی پیاوێکی خەیاڵپڵاوی دەبەنگ"یان دادەنا. کتێبی "خەباتەکەم" هەر بەڕاستی –وەك ناونراوە– نایابترین کتێبە پڕوپاگەندە

بەرهەمی هێناوە. دادوەری دادگە بە "تاوانبارترین کتێبی سەدەی بیستەم" وەسفی کردووە. نەتەوەیەکی مەزن و هاوپەیمانەکانی خۆیان دابەدەم شەپۆلی جێبەجێکردنی بیر و بۆچوونە خەیاڵیەکانی ناو ئەو کتێبە. ئەوە بوو کاتێك ئاگری جەنگی جیهانیی دووەم هەڵگیرسا، تەنیا لە ئەڵمانیا پێنج ملیۆن دانەی لێ دابەش کرا.

هیتلەر کە لە ڤیەنا گەشەی کرد و پەروەدە بوو، لە سەرەتای تەمەنیدا کۆمەڵێ هەست و خەیاڵ و ڕق و کینەی لە خۆیدا هەڵگرت کە بەدرێژایی باقیی ژیانی لەگەڵی مانەوە. هەموو ئەوەی لە کتێبی "خەباتەکەم"دا داڕشت. دەروازە بەراییەکانی کتێبەکە وێنەیەکی پوخت و گرنگی ئەو ساڵە بەراییانە روون دەکەنەوە.

هیتلەر ساڵی ١٨٨٩ لە براونو لە نەمسا لە کەناری ئەوبەری سنووری ئەڵمانی لەدایك بوو، لەبەرئەوە هەمیشە وا هەستی دەکرد ئەو زیاتر ئەڵمانییە تا نەمساوی. بەشێوەیەکی تایبەت رقی لە خەڵکی ژیانخۆشی ڤیەنا بوو. بەگوێرەی گێڕانەوەی هیتلەر، ساڵە بەراییەکانی ژیانی پڕ بوون لە بێبەشی و ئازار و شکست و بێبەختی و ناڕێکی. لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا خوێندنی لە قوتابخانە وەستا و هەر لەو دەوروبەرەدا دایك و باوکی مردن، هەربۆیە تێدەکۆشا تا ببێتە وێنەگر. کاتێك لەمەدا شکستی هێنا هەوڵیدا بە تەلارسازیەوە خەریك بێ، بەڵام نەبوونی فێرکردن و بەهرە بوونە کۆسپ لەبەردەم بەدیهێنانی ئامانجەکەیدا.

هیتلەر باس لەوە دەکات کە ئەوکاتەی لە ڤیەنا بووە زۆری خوێندۆتەوە، بەتایبەت مێژوو. بیرکردنەوەی بەشێوەیەکی تایبەت کەوتۆتە ژێر کاریگەریی کتێبێك لەبارەی جەنگی فەرەنسا و پروسیا کە وای لێکرد زۆر شانازی بە رەگەزی ئەڵمانیەوە بکات و قەناعەتی بەو چارەنووسە هێنا کە خوا بۆ ئەو گەلەی هەڵبژاردووە. لە هەمان کاتدا رقێکی ئەستووری بۆ جولەکە و سلاڤیەکان و تەواوی

ئاناریەکان هەبوو. پێی وابوو جولەکە بەر لە هەموو شت پارە کۆکەرەوە و هەلپەرستی نێودەوڵەتین و بەزۆری سۆشیالیست یان کۆمۆنیستن، لەکاتێکدا سلاڤیەکان رەگەزێکی کەمترن لە رەگەزی ئەڵمانی و کەلتورێکی تایبەت بەخۆیان نیە.

تێکەڵیی هیتلەر لەتەك دیموکراسیخوازە کۆمەڵایەتیەکان لە ڤیەنا وای لێکرد رقی لە پروپاگەندەی سۆشیالیستی و کۆمۆنیستی بێ. ئەگەرچی ئەو قوتابیەکی زرنگ بوو لە پلانەکانی جەنگدا، بەڵام بەدرێژایی ژیانی رقی لە مارکسیزم بوو. لەگەڵ شەیدایی بۆ خوێندنەوە بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەبەردەست نیە کە کتێبی "خەباتەکەم"ی کردبێتەوە. هەروەها تابڵێیت رقی لە دیموکراسی و دامەزراوە دیموکراسیەکان بوو. ئەم رقە کاتێك دەستی پێکرد کە ئامادەی دانیشتنەکانی رایخسرات Reichsrathی نەمساوی لە ڤیەنا دەبوو و رێگەکانی بە ناکارا دەبینی.

دواجار، کاتێك بەرگەی هەڵمژینی هەوای بێزراوی ڤیەنای پایەتەختی نەگرت، ساڵی ١٩٢١ لە میونیخ جێگیر بوو کە بە "شارێکی تەواو ئەڵمانی" ناوی دەبرد. هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم خۆشحاڵی کرد و وەك سەربازی خۆبەخش ناوی لە کەتیبەیەکی بافاریدا نووسی. بەر لەوەی شەڕ ببڕێتەوە، بە غازی ژەهراوی ژەهراو بریندار بوو. دوو جار سینگی بە نیشانە رازێنرایەوە و بۆ پلەی چاویش بەرز کرایەوە. بە بەزینی ئەڵمانیا لە جەنگدا خەمبار بوو، تووڕە و شێتگیر بوو و وای هەست دەکرد هۆی شکستەکە جولەکە و مارکسی و لایەنگرانی ئاشتی بوون. هەروەك دروستبوونی حکومەتێکی دیموکراسی لە ئەڵمانیا پاش جەنگ تووڕەی کرد. ئیتر بڕیاریدا سیاسەت بکات.

سیاسەتکردنی هیتلەر پاش گەڕانەوەی بۆ میونیخ دەستی پێکرد. بۆ ماوەیەك وەك هەواڵدەری سیاسیی سوپا کاری دەکرد. بانگهێشت کرا بۆ بوونە ئەندام لە

گرووپێکی بچوکدا بەناوی "حزبی کرێکارانی ئەڵمانی" ئەویش رازی بوو و زۆری نەبرد ناوی حزبەکەی گۆڕی بۆ "حزبی کرێکارانی سۆشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانی"، کە ئەوە ناوکی حزبی نازی Nazi بوو.

دوای ماوەیەکی کورت، بە مانۆڕێکی ناوخۆیی، هیتلەر جڵەوی ئەو رێکخراوەی گرتە دەست

و نەریتە کۆنە بێماناکەی پێشووی هەڵوەشاندەوە، کە دەرکردنی بڕیارەکانی حزب بە وەرگرتنی رای ئەندامان بێ. بەفەرمانی هیتلەر بەرنامەی حزبەکە دانرا و پەرەی پێدرا بەمەبەستی رازیکردنی چینی کرێکاران، "بەژەهرکوژانی نێودەوڵەتی" لە رەگەوە دەرهێنا و دەستە یاسادانەرەکانی هەڵوەشاندەوە و بنەمای گوێڕایەڵیی کوێرانەی بۆ سەرکردە Fuhrer بەبێ هیچ پرسیارێك پەسەند کرد.

ساڵی ۱۹۲۳ ئەو حزبە ۲۷ هەزار ئەندامی هەبوو و تاقمێکی سەربازی بەسەرکردایەتی فەرماندە لۆندرۆف پاڵپشتیی هیتلەریان دەکرد لەو کاتەی حکومەتەکەی سترێسمان لەلاوازیدا لەتری دەبرد، هیتلەر هەستی کرد دەرفەت لەبارە بۆ دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا. شوێنکەوتەی هەبوو، هەربۆیە یاخیبوونە بەناوبانگەکەی بیرەخانەی پوچ Putschی لە میونیخ رێکخست، بەڵام ئەم هەوڵە بەخراپی شکستی هێنا و شازدە کەس لە شوێنکەوتووانی هیتلەری تێدا کوژران. هیتلەر خۆیشی قۆڵبەست کرا و پێنج ساڵ حوکم درا، کە پاشتر بۆ ساڵێك کەم کرایەوە.

لەو کاتەی هیتلەر لە قەڵای بافاریە لە لاندسبێرگ زیندانی کرابوو، بۆ یەکەم جار کاتی هەبوو تا مێژووی ژیانی بنووسێ. لەڕاستیدا کتێبی "خەباتەکەم" زیاتر کتێبێکی زارەکی بوو تا نووسراو. لەگەڵ هیتلەر قوتابییە بەوەفاکەیشی واتە رودۆڵف هێس لە زینداندا بوو، هەربۆیە هیتلەر کتێبەکەی بۆ هێس دەخوێندەوە و

ئەویش راستەوخۆ بە ئامێری چاپ دەینووسیەوە. بەوە بەشی یەکەم تەواو بوو. لەبەرئەوەی کتێبەکە کرابووە دیاری بۆ ئەو شازدە شەهیدەی لە شەڕی یاخیبوونەکەی میونیخدا کوژران، ناونیشانی ئەسڵیی کتێبەکە بریتی بوو لە "چوار ساڵ و نیو لە تێکۆشان دژی درۆ و دەلەسە و گەمژەیی و ترسنۆکی". بەشی دووەم لە ساڵی ١٩٢٦ لە بێرشتینگاردن تەواو بوو.

ئۆتۆ تۆلیخوس مادەی کتێبەی "خەباتەکەم"ی وەسف کردووە بەوەی "١٠٪ی مێژووی ژیانی دانەرە، ٩٠٪ی بیروباوەڕە، ١٠٠٪یشی پروپاگەندەیە". ئەمەیش شیکردنەوەیەکی دادپەروەرانەیە. رەنگە ئەمڕۆ عەقڵ نەیبڕێ کە کتێبێکی وا ناساز و درێژدادڕ و کرچوکاڵ نووسراو و پڕ لە شتی دژبەیەك و دووبارە، دەست بەسەر هەست و سۆزی نەتەوەیەکی خاوەن رۆشنبیریی بەرزدا بگرێ. بەڵام هەڵوێستەکە لەسەر سیستمێکی دانراو دەچوو. سەرنجەکانی لودویج لۆر شتە تاریکەکان روناك دەکاتەوە:

گەلی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٣٣ بەشێوەیەکی مەترسیدار کەوتبووە ژێر کاریگەریی سیستمی فاشی. هەوڵیان دەدا رێگەیەك بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانی ئاسایی و رێزگرتنی خود بدۆزنەوە، بینییان رێگەکە بە دەمارگیری و خراپ تێگەیشتنی کوێرانە داخراوە. دەوڵەتانی زلهێز جگە لە قەرەبوو بایەخیان بە هیچ نەدەدا. حزبەکانی کرێکارانی ئەڵمانی، تەنانەت ئەوانەیش کە دەکرا دەستی یارمەتی درێژ بکەن، بۆ چەند جەمسەرێکی دژبەیەك دابەش بووبوون. هەموو ئەمە بەپاشخانێکی نەتەوەیی چڕ روویدا. گەلی ئەڵمانیا گەیشتبووە خاڵێك کە پێدەچێ ئیتر سیستم و ئاسایش تێیدا لە ئازادیی سیاسی، کە بووبوە هاومانای کێشمەکێش و خوێنڕشتن، گرنگتر بن. هیتلەر ئەم شتانەی باش دەزانی و بۆ مەرامەکانی خۆی قۆستنیەوە، لەوەیشدا توانا گەورەکەی بۆ رێکخستن و پروپاگەندە و ئامادەیی گەورە پیاوانی پیشەسازیی ئەڵمانی بۆ پارەدارکردنی هەڵمەتەکانی، یارمەتیدەری بوون. هەر

هێنـدەی جـێگیر بـوو ئـیتر ڕێزگرتنـی سروشـتیی ئەڵمانیـەکان بـۆ دەسـەڵات سەقامگیربوونی سەرکردایەتییە فاشیستیەکەیان ئاسان کرد".

ئامەنگی پلانەکەی "خەباتەکەم" کە جار دوای جار دووپاتی دەکاتەوە بریتیـە لـە ڕەگەز (الجنس). بێگەردی و باڵایی و سەروەریی ڕەگەز. ئەگەرچی هیتلەر لە هـیچ شوێنێکی کتێبەکەیدا پێناسەی ڕەگەزی نەکردوە، بەڵام دەڵێ ڕەگەزی مرۆڤایەتی بۆ سێ گرووپ دابەش دەبێ: خولقێنەرانی ڕۆشنبیری (کەلتور) کە یەك نموونـەیان هەیـە ئـەوانیش ئـاری یـاخود نۆردیـەکانن (واتـە ڕێـك ئەڵمانـەکان) + هـەڵگرانی ڕۆشـــنبیری وەك ژاپۆنیـــەکان + تێکشـــکێنەرانی ڕۆشـــنبیری وەك جولەکـــە و زنجیەکان. هیتلەر پێداگری لەوە دەکات سروشت قـەت مەبەسـتی نـەبووە هـەموو ڕەگەزەکان یەکسان بن، وەك چۆن هەموو تاکـەکان یەکسـان نـابن، هەنـدێ کـەس باڵاتر لە هەندێکیتر دروسـت کـراون. لـەو ڕووەوە ئەڵمانـەکان بـەهێزترین ڕەگـەزی جیهانن، پێویستە ئەوان حوکمی ڕەگەزە پلە خوارترەکان بکەن. چەند برگەیـەکی کتێبی "خەباتەکەم" بۆچوونی هیتلەر لەبارەی ڕەگەزە کەمترەکان دەخەنە ڕوو.

هیتلـەر لـەبارەی ئیمپراتۆریـەتی نەمسـاوی دەڵـێ: "بـەهۆی ئـەو تۆپەڵبوونـەی ڕەگەزەکان کە لە پایتەخت بینیم ئەو ئیمپراتۆریەتەم دەرکرد، بەهۆی ئەو تێکەڵـە لە چیکی و پۆڵەندی و مەجەری و ڕۆثانی و سربی و کرواتـی، هـەروەك لـە هـەموو جێیەکیش ئەو مشتەخۆرییە ئەبەدییەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بەدی دەکرێ، ئەویش جولەکە و جولەکەی زیاترە".

لـەبارەی ئەفریقیەکانـەوە دەڵـێ "..شتێتیەکی تاوانکارانەیـە خـەڵك لـە ڕاهێنـانی بەسروشت نیوە مەیمونێك بەردەوام بن... لەکاتێکدا ملیۆنان لە تاکەکانی بـاڵاترین ڕەگـەز لـە پێگـەی وادان بـەهیچ شـێوەیەك شـایان بەشـانی ئـەوان نیـە.. ئـەوە چ گوناهێکی گەورەیە دژ بـە ئـیرادەی سـەرمەدیی خـالق دەکـرێ کـە واز لـە سـەدان

سەدان هەزار لە بونەوەرە هەرە بەهرەدارەکانی بهێنرێ تا لەنێو زەلکاوی چینی هەژاراندا بمرن، کەچی راهێنان بە هوتنتوت و زۆلۆ بکرێ بۆ پیشە عەقڵیەکان".

لەبارەی هیندییە نەتەوەییەکانیش دەڵێ "هەمیشە یەك بەیەکیان بە چەنەچەن و خۆ بەزلزانینیان بەبێ پاڵپشتێکی راستەقینە لە رابردوو، سەرسامیان کردووم. هەرچی پۆڵەندی و جولەکە و زنجی و ئاسیاییەکانە لە بەلەمێکدا کۆکراونەتەوە بەوەی شایستەی رەگەزی ئەڵمانی نین با لە ئەڵمانیایشدا لەدایك بووبن و بەزمانی ئەڵمانی قسە بکەن".

جۆرە سووکایەتیەکی تایبەت بە فەرەنسا دەکات و دەڵێ ".. لە رووی رەگەزەوە.. پێشکەوتنێکی مەزن بەرەو گۆڕان بۆ بوونە زنجی بەدیدێنێ، تەنانەت دەتوانین بڵێین دەوڵەتێکی ئەفریقی لەسەر خاکێکی ئەوروپی دروست بووە. ناکرێ سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئێستای فەرەنسا بە سیاسەتی ئەڵمانیا لە رابردوودا بەراورد بکەین. ئەگەر فەرەنسا لەو تەرزە پێشکەوتنەی ئێستای بۆ ماوەی سێسەد ساڵ بەردەوام بێ، دوایین چۆڕە خوێنی فەرەنسی لە دەوڵەتی خەلاسیی رەنگاوڕەنگدا کە لە ئەفریقی و ئەوروپی پێکدێ، نوقم دەبێ".

دەمارگیریی رەگەزپەرستانەی هیتلەر لەو هێرشە شێتانەیەی دەیکاتە سەر جولەکە، کە دەڵێ:

"هەموو بیرۆکەکانی جولەکە لە هەموو ئەمانەدا روونە: بەلشەفیزەکردنی ئەڵمانیا، واتە ریشەکێشکردنی کەسە نەتەوەییە زرنگەکان کە بەشوێن جولەکەدا دەگەڕێن، تا بتوانرێ وا بکرێ چینی کرێکارانی ئەڵمانی لەژێر نەیری کۆکردنەوەی پارە لەلایەن جولەکەوە بناڵێنن. ئەم بەلشەفیزەکردنە تەنیا رێوشوێنێکی بەراییە بۆ شاردنەوەی ویستی جولەکە بۆ زیاتر پڕدانە جیهان. وەك چۆن لە مێژوودا رووی داوە، ئەڵمانیا تەوەری مەزنە لە خەباتی سەختدا. جا ئەگەر گەل و دەوڵەتەکەمان بوونە نێچیری ئەو جولەکە ملهوڕ و چڵێس و تینوو بە خوێنی گەلانە، ئەوا هەموو

سەرزەوی دەکەوێتە چنگی ئەو ئەختەبوتە. ئەگەر ئەڵمانیا خۆی لە چـنگی رزگـار کـرد، ئـەوا ئـەو مەترسـییە هـەرە گەورەیـە لەسـەر گـەلان، بەبەرچـاوی هـەموو جیهانەوە بەتێکشکاو دادەنرێ..". "بەگشتی، جولەکـە لـەناو دەسـتە نەتەوەییـە جۆراوجۆرەکاندا دەجەنگن، ئەویش بەو چەکانەی کە بەپێی عەقڵیەتی ئەو گەلانـە کاریگەرتر دیارن و مژدەی سەرکەوتنی گەورەتریان پێیە. لەنێو دەستە نەتەوەییە دادڕاوەکـەی ئێمـە لـە رووی خوێنـەوە، ئـەو بیرۆکـە جیهانیانـەی لـەم راسـتیەوە سەرچاوە دەگرن، واتە ئەو مەیلە نێودەوڵەتیانەی لە خەباتیاندا هێز بـەکار دێـنن، گەرا دادەنێن، تا دەوڵەت لەدوای دەوڵەت هەرەس دێنێت و دەیگۆڕێ بۆ تۆپـەڵێك پاشماوە کە بکرێ مەزنیی ئیمپراتۆریەتی نەمری جولەکەی لەسەر بنیات بنرێ".

بۆ پارێزگاریکردنیش لە بێگـەردیی فیتریـی ئاریـەکانیش، واتـە رەگـەزی ئـەڵمانی، پێویستە رەگەزی نـزمتری تێکـەڵ نـەبێ. هیتلـەر جـەخت لـەوە دەکـات شکسـتی نەتـەوە مەزنـەکان لـە رابـردوودا بـەهۆی تێکـەڵبوونی خـوێن و نـەمانی بێگـەریی رەگـەزەوە بـووە. بـۆ خۆپاراسـتن لـەو کارەسـاتەیش ئـەرکی دەوڵەتـە دەسـت وەربدات: تەنانـەت ئەگـەر ترسـنۆك و لاوازەکـانیش ناڕەزاییـان لـە دەسـتبردن بـۆ مافەکانیان دەربڕی، پێویستە دەوڵەت "پارێزگـاری لـە مانـەوەی خـوێنی نەتـەوە بـەپاکی بکـات تـا مرۆڤایـەتی بگاتـە لوتکـەی پێشـکەوتنی. پێویسـتە دەوڵـەت هاوسەرگیری لە چاڵی رسوایی سێکس دەربێنێ و وەك ئامرازێك بـۆ بەرهـەمهێنانی نیمچە خواوەند پیرۆز رایبگرێ، نـەك خـەلقکردنی بونەوەرگـەلێك لـەنێوان مـرۆڤ و مەیموندا".

هیتلـەر بەتونـدی بـاوەڕی بـە بـاڵایی فیتریـی رەگـەزی ئـاری بەسـەر بـاقیی رەگەزەکانـەوە هـەبوو، هەربۆیـە نەیدەشـاردەوە کـە ئـەرك و سـەرمافی رەگـەزی سەرگەورەی دەزانی رەگەزەکانیتر ببەزێنێ. لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیدا بەکاریان بێنێ و دەریانبکات و قڕیان بکات. لەوانەیە ئەڵمانیا بە خەڵکەکەی جەنجاڵ بـووبێ

و پێویستی بە خاکی زیاتر هەبێ تا لەسەری بژین، هەربۆیە بەحوکمی ئەوەی هێزی مەزنی نۆردییە، مافی ئەوەی هەیە دەست بەسەر خاکی سلاڤیدا بگرێ، سلاڤەکان لە خاکەکەیان وەردەربنێت و ئەڵمانیان تێدا نیشتەجێ بکات. بەوە هەموو مرۆڤایەتی بەدرێژایی چاخەکان لە نەریتی پەلهاویشتنی رەگەزی بالا و یەکگرتنی گەلانی پەرتبووی ئەڵمانی لەژێر یەك حوکمڕانیدا، سوودمەند دەبێ. "هەر نەتەوەیەك تەنیا رووبەرێکی فراوانی گونجاو گەرەنتیی ئازادیی مانەوەی بۆ دەکات.. یان ئەوەتا دەبێ ئەڵمانیا هێزێکی جیهانی بێ، یان ئەڵمانیا بەهیچ شێوەیەك نامێنێ".

ئەو پەلهاویشتنە فراوانەی هیتلەریش بیری لێ کردۆتەوە، لە بنەڕەتدا لەسەر حسابی روسیا دەبێ. چاوبرسییانە تەماشای رۆژهەلاتی دەکرد و چاوی بڕیبووە ئەوەی دەکرێ جێبەجێ بکرێ: "ئەگەر چیاکانی ئۆراڵ بە سەرچاوە خاوە گەورەکەی و ئۆکرانیای خاوەن کێڵگە لەژمارە نەهاتووەکانی گەنمەوە بخرایەنە سەر سنووری ئەڵمانیا، گونجاوتر دەبوو". ئەرکی ئەڵمانیایە گەلی روسی لە سەرکردە بەلشەفیەکان رزگار بکات. هەروەها دەڵێ "ئەگەر ئەمڕۆ باسی زەوی لە ئەورووپا بکەین، وەك سەرەتا جگە لە روسیا و ویلایەتەکانی لەسەر سنوور شوێنێکیترمان بەخەیاڵدا نایەت. پێدەچێ بەخت ئاماژەمان بداتێ، بەتەسلیمکردنی روسیا بە بەلشەفیزم، نەتەوەی روسی لەو زیرەکییە دادەماڵین کە پێشتر مانەوەی وەك دەوڵەتێك بەدیهێناوە و مسۆگەر کردووە. ئیمپراتۆریەتی مەزن لە رۆژهەلات پێگەیشتووە تا تووشی داڕمان و هەرەس ببێ".

هیتلەر هەروەها گوتی، هێز بریتییە لە پەلاماردان... سنووری دەوڵەتان مرۆڤ دروستی دەکات و هەر ئەویش دەیگۆڕێ. ئەگەر نەتەوەیەك سەرکەوتوو بوون لە دەستگرتن بەسەر پارچەیەك زەویدا کە مافیان نەبووە تێیدا، ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی نەتەوەیەکی بالاتر پابەند بێ بەوەی تاسەر دانی پێدا بنێ. ئەوە لە

باشترین حاڵەتدا بەڵگەیە لەسەر هێزی پەلاماردەرەکە و لاوازیی نەتەوەکانیتر. ئەوکاتە هەق تەنیا بۆ هێزە.

هیتلەر دان بەوەدا دەنێ کە ڕێگەچارەیتر جگە لە فراوانکردنی ڕووبەری زەوی هەبوون بۆ چارەسەکردنی زیادبوونی خێرای ژمارەی دانیشتوانی ئەڵمانیا. لەوانە سنووردارکردنی وەچەخستنەوە، ئەوەیش قبوڵ نیە لەبەرئەوەی لەگەڵ تیۆری ڕەگەزی سەروەردا ناگونجێ. چارەسەرێکیتر هەیە کە دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا بەر لە جەنگی جیهانیی یەکەم پەنایان بۆ برد، ئەویش زیادکردنی بەرهەمهێنانی کاڵای دروستکراو بۆ بازاڕەکانی دەرەوەیە، واتە زیادکردنی پیشەسازیکاری. بەڵام ئەمە بەدڵی هیتلەر نەبوو لەبەرئەوەی دەیویست ئەڵمانیا خۆی نانی خۆی بدات و پشت بە خۆژێنی ببەستێ. زیاد لەوەیش بەتوندی بەرهەڵستی کرا، لەبەرئەوەی بەهۆی سیستەمە پیشەسازییە قەبەکەوە چینێکی کرێکارانی گوندی دروست دەکات. چارەسەری سێیەم بریتی بوو لە زیادکردنی بەرهەمی ئەو زەویەی ئێستا هەیە. بەڵام هیتلەر بەرهەڵستیی ئەمەی کرد و گوتی، ئەوە چارەسەرێکی بەشەکی و کاتییە و بەو دەرەنجامە گەیشت کە تاکە چارەسەری ڕاستەقینە ئەوەیە ئەڵمانیا دەست بە زەویی نوێ لەودیو سنووری ئێستایدا بگرێ؛ بەوەیش زۆر لە ئەڵمانەکان دەتوانن لەو شوێنانەدا بژین.

ئەم برگەیەی خوارەوە پوختەی ئامانجە دوور مەوداکانی هیتلەر سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوانی زەوی دەخاتە ڕوو.

"..ئێستا ٨٠ ملیۆن ئەڵمانیمان لە ئەورووپا هەیە. ئەم سیاسەتە دەرەکیەیش دروست نابێ تا ژمارەی دانیشتوان پاش نزیکەی سەد ساڵ ٢٥٠ ملیۆن مرۆڤی ئەڵمانی نەبێ لەم کیشوەرەدا. هەروەها لەپێناو باقیی دانیشتوانی جیهاندا وەك کرێکارانی کارگەکان بەتەپەدراوی نەژین، بەڵکو وەك جوتیار و کرێکارانێك کە هەریەکەیان بەکارەکەی بژێویی ئەویتر مسۆگەر دەکات".

بەکورتی هیتلەر پێشبینی کردووە ژمارەی دانیشتوانی ئەڵمانیا لە ماوەی سەد ساڵی داهاتوودا سێ هێندە دەبێ. هەر کەسێك پارچە زەویەکی دەبێ کە دوو هێندەی ئەوە دەبێ کە تاکێك پێشتر هەیبووە. هەروەها هیتلەر سەرسام بووە بە بیرۆکەی دانیشتوانی خاوەن رووبەری بەرفراوانی زەوی، ئەویش لەبەر هۆی (جوگرافیی سەربازی) چونکە بۆ دوژمن زەحمەتتر دەبێ.

بۆ بەدیهێنانی ئامانجە بەرزەفڕەکانیشی، هیتلەر پێشنیاری سێ رێگە دەکات: پڕوپاگەندە و دیپلۆماسیەت و هێز. نووسەر لە هیچ جێیەکیتری کتێبەکەیدا بەئەندازەی ئەوەی لە میانەی باسکردنی بابەتی پڕوپاگەندە (واتە دیعایە)دا کردوویەتی، باسی خۆی و پلانەکانی نەکردووە، کە باوەڕی وابوو پڕوپاگەندە یەکێکە لە چەکە سەرسەخت و هەرە کاریگەرەکان. ماکس لێرنەر دەربارەی هیتلەر دەڵێ "رەنگە گەورەترین مامۆستای پڕوپاگەندە و رێکخستن بێ لە مێژووی نوێدا". پاشان دەڵێ "بۆ ئەوەی هاوتایەکی بۆ بدۆزینەوە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ لۆیالا Loyala و یەسوعیەکان".

هیتلەر بۆ ئەوەی تەکنیکی پڕوپاگەندە بگەیەنێتە ئەوپەڕی پلەی تەواوی، لە رێگەکانی پڕوپاگەندەکردنی مارکسیەکان، رێکخستن و رێگەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی، پڕوپاگەندەی بەریتانی لە جەنگی جیهانیی یەکەم، جاڕنامەی ئەمەریکی و دەروونزانیی فرۆیدی کۆڵیەوە. دەنووسێ "ئەرکی پڕوپاگەندە ئەوە نیە مافی خەڵکی جیاواز هەڵبسەنگێنێ و لێیان ورد بێتەوە، بەڵکو بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو تاکە مافەیە کە ئامادەی کردووە بۆ تاوتوێکردنی. کاری ئەوە نیە توێژینەوەیەکی بابەتی لە حەقیقەت بکات -مادام ئەو کارە لە بەرژەوەندیی دوژمن بێ- و پاشان بە دادپەروەریەکی زانستیانە بیخاتە بەردەم جەماوەر، بەڵکو کاری ئەوەیە هەردەم و بەبێ دوودڵی خزمەتی مافەکانی ئێمە بکات. هەڵەیەکی تەواو بوو لەو روانگەوە تاوتوێی تاوانەکانی جەنگ بکرێ وەك

ئەوەی هەر دەبێ ئەڵمانیا بەتەنها لە هەڵگیرسانی ئاگری ئەو کارەساتە بەرپرس بێ. بەڵام دروستە کە باری هەموو لۆمەیەك بخرێتە سەر شانی دوژمن تەنانەت ئەگەر ئەوە لەگەڵ رووداوە راستەقینەکانیشدا، وەك رووی داوە، یەکنەگرێتەوە.. مەبەست لە پروپاگەندە ئەوە نیە شتێك بدرێتە لاوانی بەجۆش کە سەرقاڵیان بکات و قەناعەتیان پێبکات، مەبەستی من ئیقناعکردنی جەماوەرە".

هیتلەر جەخت لە گرنگیی چڕکردنە سەر و دووبارەکردنەوە دەکات و دەڵێ:

"قبوڵکردنی جەماوەر بۆ ئەوەی دەیبیستێ زۆر سنووردارە، زیرەکیشیان سادەیە، بەڵام توانای لەبیرکردنیان گەورەیە. هەربۆیە هەموو دیعایەیەکی کاریگەر لە چەند خاڵێکی کەمدا کورت بێتەوە، پێویستیشە بەبەردەوامی لەسەر ژێی ئەو هاوارانە بدات تا جەماوەر تێبگات تۆ بە هاوارەکەت چیت لەو دەوێ. هەر تەنیا بە لێبوونەوە لەم هاوارەت و هەوڵدانت بۆ ئەوەی هەمەلایەنە بێ، ئاسەوارەکە دەکوژێتەوە لەبەرئەوەی ئاپۆراکان (واتە حەشاماتی خەڵك) ناتوانن هەرسی ئەو مادانە بکەن کە پێشکەشیان دەکرێ و پارێزگاری لێبکەن. بەم رێگەیە ئەنجامەکە کز دەبێ تا لەکۆتاییدا بەتەواوی دەسڕێتەوە".

باوەڕی هیتلەر بە دیعایە لەوەدا روون دەبێتەوە کە دەڵێ "بە دیعایەی زرنگانە و بڕ دەتوانرێ وا لە جەماوەر بکرێ باوەڕ بێنێ بەوەی بەهەشت دۆزەخە و دۆزەخ بەهەشتە". بۆیە پێویستە لەگەڵ نزمترین ئاستی زیرەکیدا بگونجێ. دیعایە "هەمیشە رووی لە سۆزە و زۆر بەکەمی رووی لە عەقڵی مرۆڤە". پێویست نیە دیعایە "بەوردییەکی زانستیانە کار بکات، هەروەك نابێ پۆستەری سەر دیوارەکان هونەرکاری تێدا بکرێ... لەبەرئەوەی ئاپۆرای ئەو جەماوەرەی پێویستە پێی بگات گەورەیە، پێویستە ئاستی زیرەکیان نزم بێ".

هەروەها هەندێ فێڵی سایکۆلۆژیی دیاریکراویش بۆ دیعایە بەکەڵکە، بۆ نموونە پێویستە مرۆڤ، لە بەیانیاندا، هەوڵ نەدات بیری جەماوەر بۆ بۆچوونێکی نەیار

بگۆڕێ، چونکە روناکیی کز بەکەڵکە. لە ئێواراندا کاتێك خەڵك ماندوون و توانای بەرەنگارییان دابەزیوە، "تا رادەیەك بەدەستهێنانی بەپیرەوەهاتنی عاتیفیی تەواویان ئاسان دەبێ". ئامرازێکیتری بەهێزیش هەیە، ئەویش ئەوەیە داوای پێشنیار لە جەماوەر بکرێ کاتێك رەشەخەڵك دەرفەتی بەشداریکردنیان لە بابەت و خۆپیشاندانە هەمەجۆرەکان کە لە تایبەتمەندییەکانی سیستمی نازییە، هەبێ. هیتلەر گوتەنی "..خۆپیشاندنی ئاپۆرای گەورە گەورە کە سەدان هەزار کەس تێیدا بەشدارن، گیانی شانازی لە تاکێکی بچوك و بێنرخدا دروست دەکات بەوەی کە ئەگەرچی ئەو کرمێکی بێنرخە، بەڵام بەشێکە لە ئەژدیهایەکی زەبەلاح کە رۆژێ لە رۆژان هەناسە ئاگرینەکانی ئەو چینە مامناوەندە خوێنتاڵە دەسووتێنێ، بەوەیش دیکتاتۆریەتی کرێکاران بەبۆنەی سەرکەوتنی کۆتایی خۆی ئاهەنگ دەگێڕێ".

هیتلەر بۆ جاری دووەم و پاشان سێیەم ئەوپەڕی بەسووك سەیرکردنی ئاپۆرای خەڵك دەردەبڕێ کاتێ بە "مێگەلێکی خاوەن سەری بەتاڵ" وەسفی دەکات. ئەو زۆر جار ئەو باوەڕە ریشەدارەی دەردەبڕێ کە مرۆڤایەتی لە حاڵەتی ئاپۆرادا بریتییە لە گردبوونەوەیەکی تەمەڵ و ترسنۆك و ژنانی و عاتیفی کە شایانی بیرکردنەوەی ژیرانە نیە.

دواین رێگەکانی دیعایەی هیتلەری بریتییە لە بنەمای درۆی شاخدار و زل و دەڵێ "ئەم بیردۆزە بەتەواوی راستە، چونکە زلیی درۆ هۆکارێکی بەهێزە وا لە خەڵك دەکات بەڕاستی بزانن... لەگەڵ کرچ و کاڵیی ئاپۆراکاندا درۆی زل لە درۆی بچوك کاریگەرترە، لەبەرئەوەی زۆرجار لە شتی بچوك و بێنرخدا درۆ دەکەن، بەڵام زۆر شەرم دەکەن لەوەی درۆیەکی زل بکەن. کەواتە ئاپۆرا گەورەکان گومان لە درۆیەکی گەورە ناکەن و ئەو ئاپۆرایانە هەرگیز ناتوانن هێندە کەلەڕەق بن تا ئەو

رادەیە حەقیقەت پوچەڵ بکەنەوە". بەکورتی درۆ چەندە زلتر بێ جەماوەر زیاتر باوەڕی پێدەکات.

بنەمایەکیتری گەورەی دیعایە هەیە، ئەویش بنەمای تاکی شەیتانە. بە پێشکەشکردنی ژمارەیەکی زۆر دوژمن جەماوەر شپرزە مەکە و داوای لێ بکەیت لە یەك کاتدا رقی لە هەموویان بێ. چڕ بکە سەر یەك دوژمن و رقی هەمووان لەسەر ئەو دوژمنە چڕ بکەرەوە. بەلای هیتلەرەوە جولەکە دوژمنانی جیهانی بوون. بەچاوپۆشین لەوەی دژی دیموکراسی یان مارکسیزم یان پەیماننامەی ڤێرسای یان فەرەنسا قسەی بکردایە، هەردەم جەختی لەوە دەکرد کە جولەکە پیلانگێڕن و بە بلیمەتیەکی شەیتانانە هەوڵ دەدەن ئەڵمانیا بڕوخێنن و کەلتوری ئاری تێکوپێك بشکێنن. لە نموونەی ئەوەیش، ئەو هاوارە هیستیرییەیە کە دەڵێ: "فەرەنسا گەورەترین دوژمنی ترسناکە و هەر بەو شێوەیش دەمێنێتەوە. ئەم گەلە کە بەبەردەوامی دەگۆڕێ بۆ زنجی و پەیوەندیەکانی بە ئامانجەکانی سەروەریی جولەکە بەسەر جیهاندا دەبەستێتەوە، مەترسیەکە بۆ سەر مانەوەی رەگەزی سپی لە ئەوروپا، لەبەرئەوەی پیسبوون بە خوێنی زنجی لەسەر روباری راین لە جەرگەی ئەوروپادا، پارێزگاری لە تینوێتیی سادی بۆ تۆڵەکردنەوە لەم دوژمنە میراتیەی گەلەکەمان دەکات. بەم شێوەیە دەست بە پیسکردنی کیشوەری ئەوروپا لە ناوجەرگەی خۆیدا دەکات و لەرێی تووشبوون بەپەتای مرۆڤایەتیی پلە نزمترەوە رەگەزی سپی لە بنچینەکانی مانەوەی دەسەڵات بێبەری دەکات".

هیتلەر دەڵێ "کاری دیعایە بە سەرپەرشتیکردنی فێرکردن لەلایەن حکومەتەوە ئاسان دەبێ. فێرکردنی زۆر

لە کتێبەوە هەڵەیە و پێویستە فێرکردنی جەستەیی و تەندروستیی جەستەیی لە پلەی یەکەمدا بێ. دووەمیش پەرەپێدانی کەسایەتی بەتایبەت بە فەزیڵەتە

سەربازیەکان و گوێڕایەڵی و وەفاداری و هێزی ئیرادە و خۆجڵەوکردن و توانای قوربانیدان و شانازیکردن بە بەرپرسیارێتی. لە پلەی سێیەمدا چالاکیی زەینی دێ. پێویستە فێرکردنی کچان بۆ ئامادەکردنیان بێ بۆ دایکایەتی".

هیتلەر رقی لە بیرۆکەی فێرکردنی هەمووان بوو؛ بەلای ئەوەوە هەموو چینێك و هەموو بەشێکی هەر چینێك یەك جۆرە فێرکردنی لەبەردەستدایە. باوەڕی وابوو پێویستە ئاپۆرای مەزنی گەل لە نیعمەتی نەخوێندەواری بەهرەمەند بێ. پێویستە فێرکردنی ئەم گرووپەی دوایی تەنیا بریتی بێ لە "بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکە گشتیانەی کە پێویستە لەڕێی دووبارەکردنەوەوە لە دڵ و زەینی خەڵکدا هەڵبکۆڵرێ". با بنەمای پێشەنگ ئەوە بێ کە منداڵ موڵکی دەوڵەتە و تاکە ئامانجیش لە فێرکردن راهێنانی ئامێرەکانی دەوڵەتە.

بۆچوونەکانی هیتلەر لەبارەی فێرکردنی میللی، لەگەڵ بۆچوونەکانی لەبارەی دیموکراسی بەگشتی شانبەشان دەڕۆن. ئەو لە هەموو بۆنەیەکدا گاڵتە بە نەشیاویی دەوڵەتی دیموکرات دەکات:

"ئەمڕۆ دیموکراسیەتی خۆرئاوایی پێشەکیەکە بۆ مارکسیزم کە بەبێ ئەو ناکرێ بیری لێ بکرێتەوە. (دیموکراسی) کێڵگەی پێویست بۆ پەتا جیهانیەکە دەستەبەر دەکات کە میکرۆبەکانی دەتوانن تێیدا بڵاو ببنەوە... ناکرێ زۆرینە جێی تاك بگرێتەوە، ئەوە هەر نوێنەری گەمژەیی نیە بەڵکو نوێنەری ترسنۆکیشە. چیتر سەد سەری بەتاڵ نابنە پیاوێکی ژیر و سەد ترسنۆك بڕیارێکی قارەمانانەیان پێ نادرێ".

هیتلەر پێی وابوو دیموکراسی "ئەو تیۆرە فریودەرەیە کە جولەکە بەرزی دەکەنەوە، واتە ئەو تیۆرەی دەڵێ خەڵك هەموو بەیەکسانی خولقاون، لەکاتێکدا هەر رێبازێکی خاوەن کۆدەنگیی جیهانی و مافی یەکسان، زیانبەخش و وێرانکەرە".

هیتلەر بنەمای دیموکراسی بە بنەمای پێشەنگ گۆڕی. چرپی دەکردە سەر ئەو خەڵکانەی چاوی لەوە بوو بەبێ پرسیار کوێرانە گوێڕایەڵی بکەن.

فوهرەر (واتە سەرکردە) لە سەروو هەموانەوە بوو. بەرپرسیارێتیی هەموو ئەوەی دەیکات و هەموو ئەوەی نەیتوانیوە بیکات دەگرێتە ئەستۆ.

هیتلەر کە لە کتێبی "خەباتەکەم"دا پلانی بۆ ئەڵمانیا و جیهان دادەنا، بەتەواوی دەستی پێوە گرت لە یەك لادانی گرنگدا نەبێ، ئەویش میساقی نازی و سۆڤیەتی بوو لە ساڵی ١٩٣٩، دژوار بوو بۆی رێکەوتنە روسیەکە قبوڵ بکات وەك لەم قسەیەی نێو کتێبەکەیەوە دیارە:

"لەبیرت نەچێ دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی روسیا تاوانباری ئاسایین و بەخوێن پیس بوون. ئەوانە بودەڵەیەکی بەشەرین کە بەخت یاریان بووە و لە سەعاتێکی مەرگەساتدا دەوڵەتێکی زلهێزیان رامالیوە و بە درندەییەکی تینوو بەخوێن هەزاران کەس لە پێشڕەوە زیرەکەکانی ئەو دەوڵەتەیان کوشتووە و لەناوبردوە..".

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش، مادام زیاتر لە دە ساڵ بەر لەوەی جڵەوی دەسەڵات لە ئەڵمانیا بگرێتە دەست و جەنگی جیهانیی دووەم بەرپا ببێ، هیتلەر نیازەکانی خۆی بەڕوونی لە کتێبی "خەباتەکەم"دا بەڕوونی خستۆتە روو، ئەی کەوابێ بۆچی سیاسیەکانی جیهان بایەخیان بە هۆشداریەکانی نەدا؟

هەندێ کەس ئەو گوێ پێنەدانەیان بۆ ئەو کەشوهەوا گشتیەی ئاشتەوایی و بیرکردنەوەی پڕ ئومێد و حەزی ئاشتیخوازیەی باوی ئەوکاتە دەگێڕنەوە. هۆکارێکیتر چیرۆکی سەرسوڕهێنی چاودێریی نێودەوڵەتییە. کاتێك هیتلەر رازی نەبوو مۆڵەت بە وەرگێڕانێکی تەواوی کتێبی "خەباتەکەم" بدات، لە زمانی ئینگلیزیدا تەنیا چاپێکی دەستکاریکراو بەردەست بوو کە ئەو شتانەی لێ لابرابوو کە ویستبووی لابرێن، تا ساڵی ١٩٣٩. لەو ساڵەدا کە جەنگ خەریك بوو بەرپا

دەبوو، دوو بڵاوکاری ئەمەریکی یەکێکیان بە رەزامەندیی هیتلەر و ئەویتریان بەبێ هیچ رەزامەندیەك دوو چاپی کتێبەکەیان دەرکرد کە چاودێری دەستی تێ نەخستبوون. لە فەرەنسا ساڵی ١٩٣٦ هیتلەر لەرێی بڵاوکارەکەیەوە داوایەکی دژی بڵاوکردنەوەی وەرگێڕانێکی تەواوی کتێبەکە بەبێ مۆڵەتی ئەو -کە ئەو کارە سەرپێچیی یاسا جیهانیەکانی دانان بوو- بەرز کردەوە. لە لەندەنیش چاپێکی چرکراوەی بڵاو کرایەوە کە زۆربەی ئەو برگانەی لێ لابرابوون کە هێرشیان تێدا دەکاتە سەر فەرەنسا، بەشێکیشی لێ لابرابوو کە ستایشی جەنگ دەکات، بەوەیش لە توندیی زمانەکەی کەم کرایەوە و بوو بە کتێبێکی ساختە و فریودەر.

لەو کاتانەدا ملیۆنان دانە لە کۆپیی کتێبەکە بەتەواوی، لە ئەڵمانیا خۆیدا دەفرۆشران و دەستاودەست دەکران. هەر بوك و زاوایەکی نوێ دانەیەکیان بەدیاری دەدرایە، هەروەك دەبوو هەر ئەندامێکی حزبی نازی و هەر فەرمانبەرێکی مەدەنی دانەیەکیان هەبێ. ئەو چاپانەی پاشتر لە ئەڵمانیا دەرچوون ئەو برگانەیان لێ لابرا کە هێرشیان بۆ سەر روسیا و فەرەنسا تێدایە، ئەویش تا مەرامەکانی هیتلەر بشارێتەوە و دوژمنە بەهێزەکان هێور بکاتەوە و بیانکاتە خەو.

ئەگەر وەك رابردوو تەماشای کتێبی "خەباتەکەم" بکرێ، مێژوونووسان پێیان وایە هیتلەر هیچ لە مێژوو حاڵی نەبووە. زانایانی مرۆڤناسی (ئەنترۆپۆلۆژیا) دەڵێن بۆچوونەکانی هیتلەر لەبارەی رەگەزەکان وڕێنەیە. زانایانی پەروەردە دەڵێن بۆچوون و تیۆرەکانی لەبارەی فێرکردن هەرهەموویان بۆ سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێنەوە. سەرجەمیشیان کۆنەپەرستانەن. زانایانی سیاسەت نارەزایی دژی رێبازە حکومییە زۆردارانەکەی و خراپیی وێناکردنی بۆ دیموکراسی دەردەبڕن. شارەزایانی ئەدەبیش دەڵێن هیتلەر نازانێ چۆن برگەیەك بنووسێ یان دەروازەیەك رێك بخات. ویگرت Weigert بەپوختی دەڵێ:

"هیتلەر نیوە خوێندەوار و تێکەڵەیەك بوو لە چەند کاریگەریەك: هونەری ماکیافیلی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بەشێوەیەك کە لەگەڵ ئەخلاقدا ناتەبایە، نەتەوەگەری و ڕۆمانتیکیەتی سۆفیانەی واگنەر، پەرەسەندنی ئەندامییانەی داروین، زێدە دەمارگیری بۆ ڕەگەزێك لای گۆبینو و هاوستۆن ستیوارت چامبەرلین، تێکەڵەی مەسیحیی هەریەك لە فیختە و هیگڵ، شانازی جەنگیانە لای هەریەك لە تریتشك و بێرنهاردی. هەرچی هۆشۆفەرە ئەڵقەی یەککگرتنی نێوان تیۆرەکان و کردارە.

سەرەڕای ئەم عەیبە ڕۆشنانە، وەك ڕەخنەگرێکی زمانتیژ بەناوی هێندریك ویلیەم ڤان لون وەسفی دەکات، کتێبەکە "یەکێکە لە بەڵگەنامە مێژووییە سەراسیمەکانی هەموو سەردەمەکە، کتێبەکە سادەیی جان جاك ڕۆسۆ و توورەیی شێتانەی یەکێك لە پێغەمبەرانی (سەردەمی دێرین، واتە تەورات)ی تێدایە". نۆرمان کزنز پێی وایە "کاریگەرترین کتێبی سەدەی بیستەمە.. بۆ هەر وشەیەکی "خەباتەکەم" پێویستە ١٢٥ کەس، بۆ هەر لاپەڕەیەك ٤٧٠٠ کەس و بۆ هەر دەروازەیەك ١.٢٠٠.٠٠٠ کەس ون بن".

دیارە هێزی کتێبەکە لەوەوە دێ کە ئینجیلێکی سیاسیی گەلی ئەڵمانی بووە و سیاسەتی رایخی سێیەمی لە ساڵی ١٩٣٣ تا کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم بەڕێوە بردووە.

لە بەدبەختیی جیهان، بۆچوونەکانی هیتلەر لەگەڵ مردنی نووسەرەکەیدا نەمردن، هێشتا لایەنگری لە ئەڵمانیا زۆرن. حکومەتە کۆمۆنیستەکانیش زۆر لەو بۆچوونانەیان خواست و بەفراوانی بەکاریان هێنا و هێشتایش. بۆ هەتاهەتایەیش دیکتاتۆرەکان لە هەموو شوێنێك سەرچاوەی مادەیەکی خاو بۆ مەرامە خراپەکانیان لە کتێبی "خەباتەکەم"دا دەبیننەوە، وەك چۆن بۆ ماوەی چوار سەدەی پێشتر کاریان بە بۆچوونەکانی ماکیافیلی دەکرد.

## ١١- "کودەتا لە خولگە ئاسمانیەکاندا"
## نیکۆلاوس کۆپەرنیکۆس Nicolaus Copernicus
### شۆڕشی گەردووونناسی

لە چاخە بەراییەکانەوە مرۆڤ بە دیمەنی تەنە ئاسمانیەکان سەرسام بووە، بە خۆر و مانگ و هەسارە و ئەستێرەکان و جوڵەی نەپساوەیان. هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر و زیاد و کەبوونی قەبارەی مانگ و بەدوای یەکداهاتنی وەرزەکان و پێشکەوتن و پاشکەوتنی هەسارەکان، هەموو ئەمانە راستیەکی هەستپێکراو نەبوون، بەڵکو زۆر شتیان هەبوو کاریان لە مرۆڤ و ژیانی رۆژانەی دەکرد. کەواتە هیچ سەیر نیە کە ژمارەیەکی زۆر ئەفسانە و ئاین لە دەوری دیاردە ئاسمانیەکان پەیدا ببن.

لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانێتی فەیەلسوفەکان هەوڵیان داوە بە هەندێ زاراوەی ماقووڵ تەفسیری جوڵەی تەنە ئاسمانیەکان بکەن. کۆنترین زانا و بیرمەندەکان لە بواری گەردووونناسیدا یۆنانیەکانن، هەر لە فیساگۆرسەوە Pythagoras لە سەدەی پێنجەمی پێش زاین و ئەرستۆ Aristotle لە سەدەی چوارەمی پێش زاین. کلاودیوس بەتڵیمۆس Claudius Ptolomyی میسری کە لە ئەسکەندەریە دەژیا، هەستا بە رێکخستن و ریزبەندیکردنی ئەو توێژینەوە کلاسیکیانەی تایبەت بەو سەردەمە و سەردەمەکانی پێشتر لە کۆمەڵێ تیۆردا کە تێگەیشتنیان ئاسان بێ. سیستمی بەتڵیمۆسی دانا کە ناونرا "هەرە مەزن" Almagest و بۆ ماوەی نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ بەسەر عەقڵی خەڵکدا زاڵ بوو و جیهان بە تێگەیشتنی راستەقینەی لەبارەی گەردوونەوە دادەنا.

تیۆری بەتڵیمۆس لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە زەوی بارستەیەکی جێگیر و سست و بێ جوڵەیە. دەکەوێتە ناوەڕاستی گەردوون و هەمو تەنە ئاسمانیەکان،

بەخۆر و ئەستێرە جێگیرەکانەوە بەدەوریدا دەخولێنەوە. ئەوکاتە ئەو باوەڕە باو بوو کە زەوی چەقی کۆمەڵێ گۆیە کە هەسارەکان بەتوندی پێیانەوە بەستراونەتەوە. هەرچی ئەستێرەکانن بە گۆیەکیتری دەرەوەی ئەو کۆمەڵەیەوە بەستراونەتەوە و هەر هەموویان لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا دەورێك دەسوڕێنەوە. ئەم بیرۆکە ئاڵۆزانە لەبارەی هەسارەکان، بە سوڕانەوە بەدەوری چوارچێوەی بازنەیەکی گەورەدا تەفسیر کران، لەکاتێکدا گۆکانی هەسارەکان بەئاراستەی پێچەوانەی بازنەی ئەستێرەکان دەسوڕێنەوە، بەڵام هێزێکی گەورەتر هەیە رایاندەکێشێ. زوحەل بە دوورترین هەسارە لێمانەوە و نزیکترینیان لە فەزای ئەستێرەکان دادەنرا، بۆیە پێویستی بە ماوەیەکی درێژترە بۆ تەواوکردنی سوڕانەوەکەی. لەبەرئەوەی مانگ نزیکترین هەسارەیە لە سەنتەرەوە، بە ماوەیەکی کورتتر دەورەکەی تەواو دەکات.

رۆزێن Rosen لەبارەی بیرۆکە بەتلیمۆسیەکەوە دەڵێ: رێبازی بۆماوە دەڵێ ئەو هەسارانەی زۆربەی کات بەرەو رۆژهەڵات دەخولێنەوە، ناوبەناو خولانەوەیان خاو دەکەنەوە تا بەتەواوی دەوەستن، جا ئاراستەی خولانەوەکەیان جارێکیتر پێچەوانە دەکەنەوە و گەشتەکەیان بەرەو رۆژهەڵات دەست پێدەکەنەوە و نۆرە گۆڕانەکان بەشێوەیەکی بێکۆتا دووبارە دەکەنەوە".

بەم شێوەیە گەردوون، بەپێی تیۆرەکەی، فەزایەکی داخراوە کە بەرگێکی خڕ دەیبەستێتەوە، هیچیتر پاش ئەو گەردوونە نیە.

دوو فاکتەر لە پەسەندکردنی گشتی بۆ تیۆرەکانی بەتلیمۆس یارمەتیدەر بوون ، هەردووکیان زادەی بیری مرۆڤ بوون، یەکەم: ئەم سیستمە پشتی بە رواڵەتە سروشتیەکان دەبەست، پشتی بە شتەکان دەبەست بەو شێوەیەی کەسێك بە نیگایەکی تێپەڕ دەیانبینێ. دووەم: ئەم سیستمە فزوڵی مرۆڤی تێر دەکرد، زۆر خۆشە مرۆڤ باوەڕی وابێ زەوی چەقی گەردوونە و هەسارە و ئەستێرەکان

بەدەوریدا دەخولێنەوە، چونکە وا دێتە پێش چاو کە هەموو گەردوون لەپێناو مرۆڤدا خەلق کراوە.

ئەم سیستمە جوانە لە بنچینەدا بە دروست مایەوە تا هاتنی چاخە مەزنەکە، واتە سەردەمی راچەنینی زێڕین لە ئەوروپا ناسراو بە رێنیسانس. تێکشکاندنی ئەو سیستمە لەسەر دەستی نیکۆلاس کۆپەرنیکۆسی کاهین و وێنەکێش و شاعیر و پزیشك بوو، کە یەکێکە لە "پیاوە جیهانیەکان" و رێنیسانس بەهۆیەوە ناوبانگی پەیدا کرد.

ماوەی ئەو حەفتا ساڵەی کۆپەرنیکۆسی تێدا ژیا (١٤٧٣-١٥٤٣) یەکێکە لە پڕ وروژانترین و پڕ سەرکێشیترین ماوە لە مێژووی ئەوروپادا. تێیدا کۆلۆمبس کیشوەرە نوێیەکەی دۆزیەوە، ماجەلان لەرێی دەریاوە بەدەوری زەویدا سووڕایەوە، فاسکۆ دی گاما یەکەمین گەشتی دەریایی لە هیند ئەنجامدا، مارتن لۆسەر ریفۆرمە پرۆتستانتیەکەی راگەیاند و میشێل ئەنجلۆ جیهانێکی نوێی هونەری دروست کرد، هەریەك لە پاراکلسوس و ڤیسالیوس بنچینەی پزیشکایەتیی نوێیان دانا، لیۆناردۆ دافینشی، "ئەو بلیمەتە جیهانییە مەزنە" وەك وێنەکێش و پەیکەرتاش و ئەندازیار و تەلارساز و زانای سروشتی و مامۆستا لە زیندەوەرزانی و فەیلەسوف، گەشایەوە. ئای چەند سەردەمێکی لەبارە بۆ مێشکێکی هەڵکەوتوویتر کە کۆپەرنیکۆسە تا سیستمێکی نوێ بۆ گەردوون پێشکەشی جیهان بکات.

نیکۆلاس کۆپەرنیکۆس لە کەناری روباری ڤیستولا لە شارۆچکەی تۆرون لە پۆڵەندە لەدایك بووە. لوکاس واتزلرودی مامی کە پاشتر بوو بە ئوسقوف و حاکمی کانتونی ئەرمیلاند، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر ئایندەی ژیانی سەرەتای هەبوو. خوێندنی نیکۆلاس لە قوتابخانەی ئامادەیی لە تۆرون و پاشان لە زانکۆی کراکاو لە ساڵی ١٤٩١ درێژ و هەمەجۆر بوو. بەهۆی ناوبانگی وەك یەکێك لە

سەنتەرە یەکەمە ئەوروپییەکان لە بواری ماتماتیک و فەلەکدا چووە ئەو شوێنە. پێنج ساڵ پاشتر سەفەری کرد بۆ ئیتاڵیا تا خوێندنەکەی لە بۆلۆگنا لە یەکێك لە کۆنترین و بەناوبانگترین زانکۆ ئەوروپییەکان تەواو بکات. خوێندنی یاسای کەنیسە و فەلەك سەرقاڵیان کرد. پاشان بۆ ماوەی ساڵێك لە رۆما وانەی لە ماتماتیك و گەردووناسیدا دەوتەوە. ماوەی نزیکەی پێنج ساڵ لە پادوا و فرارا پزیشکی و یاسای کەنیسەی دەخوێند، بەوە پرۆگرامە زانستیەکەی تەواو کرد و ساڵی ١٥٠٢ لە فرارا دکتۆرای لە یاسای کەنەسیدا وەرگرت.

کۆپەرنیکۆس بە واسیتەی مامی وەك سەرۆکێکی یاسایی لە کەنیسەی فرونبەرگ دامەزرا و لەوێ باقیی سی و پێنج ساڵەی تەمەنی پاش گەڕانەوەی لە ئیتاڵیا لە ساڵی ١٥٠٦، بەسەر برد.

ئەرکە کەنەسیەکانی کۆپەرنیکۆس هەمەلایەنە بوون، رۆڵێکی پزیشکیی گەورەی لەنێو هاوڕێیانی لە کەنیسە و بۆ خەڵکیش دەگێڕا، یارمەتیدا لە بەرگریکردن لە شارەکەی لە جەنگی نێوان پۆڵەندی و پروسیەکان و سوارە تیوتۆنیکەکان. هەروەها بەشداریی لەو کۆنگرەی ئاشتیەیشدا کرد کە پاش ئەوە بەسترا و راوێژی خۆی بۆ چاککردنی لێدانی سکە و کاغەزی دراو پێشکەش کرد. بۆ خەم بەبادان و ئاسوودەییش وێنەی دەکێشا و شیعری گریکی وەردەگێڕایە سەر زمانی لاتینی.

ئەوکاتە گەردووناسی (یاخود فەلەکناسی) یەکێك بوو لەو چالاکییە زۆر و زەبەندانەی کۆپەرنیکۆسی فرە شارەزوو و زانیاری، پێیەوە سەرقاڵ بوو. بەڵام وردە وردە بوو بە چێژی یەکەمی پاش ئەوەی بۆچوونەکانی دەربارەی دیاردە گەردوونیەکان پەرەپێدا، ئەو رایانەی دیارە کە لە سەروەختێکی زووی ژیانیەوە بۆی هاتوون و لەکاتی خوێندنی لە کراکاو و ئیتاڵیا بەهێزی کردوون. بەتەنیا و بەهێمنی و بەبێ یارمەتی و راوێژی هیچ کەس دەستی بە لێکۆڵینەوەکانی کرد. شوورەیەکی پارێزەری دەوری کەنیسەی کردبووە روانگە (مرصد) بۆ خۆی.

ئەو کەرەستە فەلەکیانـەی کۆپـەرنیکۆس توانیبـووی دەسـتیان بخـا سـەرەتایی و ناورد بوون. نزیکەی سەدەیەك بەر لە دۆزینەوەی تێلیسکۆب دەستی بە کارەکەی کردبوو. بۆ پێوانەکردنەکان سەعاتێکی خۆری (مزولـە) و جیهـازێکی چارەکی (لـە پارچـەیەك تەختـەی سـێ لا پێکهـاتبوو) بـۆ پێوانـەکردنی گۆشـەکانی بـەرزیی ئەسـتێرە و هەسـارەکان بـەکاردەهێنا، کـە خـۆی دروسـتی کردبـوو. هـەروەها ئیسترلابێکی بەکار دەهێنا کە تۆپێـك بـوو لـەناو ئەڵقەیـەکی سـتووونی و یـەکێکی ئاسۆییدا. زیاد لەوەیش جەو بۆ روانگەی فەلەکی لەبار نـەبوو. نزیکـی لـە دەریـای بەڵتیق و روبارەکانی ئەویێ تەمومژ و هەوری دروست دەکرد و رۆژ و شەوانی تەواو سامالی دەگمەن بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا کۆپەرنیکۆس لە هـەموو دەرفەتێکدا سـاڵ دوای ساڵ کاری لە حیساباتە فەلەکیەکانیدا دەکرد.

ئەو بیردۆز (تیۆر)ـە شۆڕشـگێڕانەیەی کۆپـەنیکۆس هەوڵیـدا راسـتی یـان هەڵـەیی بسەلمێنێ، تەواو دژی سیسـتمی بەتلیمۆسـی بـوو کـە بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێـژ جێگەی رێز بوو. بیردۆزەکە بەکورتی ئەوە بوو کـە: زەوی جێگیر نیـە بـەڵکو لـە مـاوەی ٢٤ سـەعاتدا جارێـك بـەدەوری تـەوەری خۆیـدا دەسـوڕێتەوە، سـاڵی جارێکیش بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. ئەو بیرۆکەیە بۆ سەدەی شازدەیەم نامۆ بـوو، تەنانـەت کۆپـەرنیکۆس نـەیوێرا پێشکەشـی بکـات تـا ئەوکاتـەی گەیشـتە قەناعەت کە زانیاریی ئەوتۆی لەلایە بەدرۆ خستنەوەی مەحاڵە. سی ساڵ تێپـەڕی بەر لەوەی بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆس بکەوێتە بەرچاوی جیهان.

لەڕاستیدا هەندێ لە فەلەکناسە گریکییە کۆنەکان پێیان وابوو لەوانەیە خۆر چەقی گـەردوون بـێ نـەك زەوی. بـۆ نموونـە ئەریسـتارکۆس Aristarchus (کۆپەرنیکۆسی کۆن) لە سەدەی سێیەمی پێش زایندا هەڵهاتن و ئاوابوونی خـۆری بە پێویستیی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خولگەکەیدا، لێکدابوویـەوە. بـەڵام ئـەم گریمانە و گریمانە هاوشێوەکانی فەلەکناسەکانیتری خـاوەن بۆچـوونی هاوشێوە،

لەلایەن ئەرستۆ و بەتلیمۆسەوە لەپێناو تیۆری گەردوونێك كە چەقەكەی زەوی بێ، خرانە لاوە. كۆپەرنیكۆس لەڕێی خوێندنەوەی ئەدەبی كلاسیكیەوە بەم تیۆرە كۆنانە ئاشنا بوو و لەوانەیە ئەوانە دڵگەرمیان كردبێ بۆ سەرلەنوێ پشكنینەوەی ئەم پرسە.

كۆپەرنیكۆس باوەڕی وابوو ئەریستاركۆس كە ١٨٠٠ ساڵ بەر لەو ژیاوە، لێكدانەوەیەكی بۆ جوڵەی تەنە ئاسمانیەكان كردووە، كە زۆر لە سیستمی ئاڵۆزی بەتلیمۆسی سادەتر بووە.

دەشێ كۆپەرنیكۆس لە سەروەختێكی زوودا كە لەوانەیە بۆ ساڵی ١٥١٠ بگەڕێتەوە، شەرحێكی گشتی و كورتی بۆ بیردۆزە تازەكەی كردبێ. ناونیشانی ئەو وتارە بریتییە لە "سەرنجی بچوك" Commentariolus و لەكاتی ژیانیدا بڵاو نەكرایەوە، بەڵام چەند دانەیەكی دەستنووسی لەنێوان قوتابیانی فەلەكناسیدا دەستاودەست دەكرا و تائێستایش لانیكەم دوو دانەی دەستنووس ماون.

كۆپەرنیكۆس لە "سەرنجی بچوك"دا ئاماژەی بەوە داوە كە ئەو كاتێك بینیویەتی بیردۆزەكانی بەتلیمۆس لەبارەی گەردوونەوە زۆر ئاڵۆز و تەواو نامەقووڵن و تەفسیرێكی پەسەندكراوی بۆ دیاردە ئاسمانیەكان پێشكەش نەكردووە، دەستی بە لێكۆڵینەوەكانی كردووە. ئەنجامی سەرەكی كە كۆپەرنیكۆس پێی گەیشتووە دەڵێ: زەوی چەقی كۆمەڵەی خۆر نیە، بەڵكو تەنیا چەقی خولگەی مانگە. هەموو هەسارەكانیش بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە. ئەو "سەرنجە بچوك"ـە قۆناغێكی ڕۆشنە لە پەرەسەندنی بۆچوونەكانی ئەو گەردووناسە مەزنەدا.

ئەوە تەواو زانراوە كە نایابترین دانراوی كۆپەرنیكۆس كە ماوەی سی ساڵ سەرەمڕ كاری لەسەر كردووە، نەدەگەیشتە چاپخانە و لەناو دەچوو ئەگەر هەوڵەكانی زانایەكی ئەڵمانیی لاو نەبوایە بەناوی جۆرج جواكیم رتیكوس. لە هاوینی ١٥٣٩ هات بۆ فراونبۆرگ بۆ سەردانی كۆپەرنیكۆس مامۆستای ماتماتیك

لە زانکۆی وتبەرگ، ئەوکاتە تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو. ناوبانگی روو لەزیادی کۆپەرنیکۆس سەرنجی راکێشابوو، هات تا سەرەتا لە ئەندازەی راستەقینەی ناوبانگەکەی بکۆڵێتەوە. چاوەڕوان بوو تەنیا چەند هەفتەیەك لای بمێنێتەوە، بەڵام کۆپەرنیکۆس بەگەرمی پێشوازی لێکرد و وای لێکرد زیاتر لە دوو ساڵ لای بمێنێتەوە. رتیکوس گەیشتە قەناعەت کە خانەخوێکەی هەڵکەوتوویەکی پلەیەکە. بۆ ماوەی سێ مانگ لە دەستنووسەکانی کۆپەرنیکۆسی کۆڵیەوە و لەگەڵ دانەرەکەی تاوتوێی کردن. پاشان رتیکۆس راپۆرتێکی دەربارەی بۆچوونەکانی کۆپەرنیکۆس نووسی و لە شێوەی وتارێکدا ناردی بۆ مامۆستای پێشووی، یۆحەننا سکۆنەر لە نورمبێرگ. ئەو وتارە ساڵی ١٥٤٠ لە دانزیگ Danzig بەناوی چاپ کرا بەناونیشانی راپۆرتی یەکەم Narratio Prema. ئەو "راپۆرتی یەکەم"ـەی رتیکۆس یەکەم حەقیقەت بوو لەبارەی بیردۆزەکانی زانا فەلەکناسە پۆڵەندییەکە، کە جیهانی هەژاند.

لەڕاستیدا ئەو نامیلکەیە بەوردی تەنیا بەشێك لە بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆس باس دەکات، کە ئەو بەشەیە تایبەتە بە جوڵەکانی زەوی. رتیکۆس چاوەڕوان بوو راپۆرتیتر بەدوای راپۆرتی یەکەمەکەدا بێن، بەڵام ئیتر هیچ پێویست بەو راپۆرتانە نەما.

تا ئەو رادەیە کۆپەرنیکۆس لە بڵاوکردنەوەی تەواوی کتێبەکەی دوودڵ بوو. عادەتی وابوو کە لێکۆڵینەوەکانی بگەیەنە پلەی تەواوی و هەستی دەکرد پێویستە جارێك و جارێکیتر لە هەر تێبینیەك دڵنیا بێتەوە. ئەو دانە دەستنووسە ئەسڵیەی پاش سێسەد ساڵ ونبوون لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا لە پراگ دۆزرایەوە، بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە شەش جار پێداچوونەوەی بۆ کراوە. جگە لەم دوودڵییانە، لەوانەیە نەیاریی بەهێزی کەنیسەیش لەمپەر بووبێ، چونکە بزوتنەوەی چاکسازیی پرۆتستانتی و پێگەیشتنی زەینیی رێنیسانس وای لە

ناوەنـدە ئاینیـەکان کردبـوو گومـان لـە تیـۆری سـوڕانەوەی زەوی و هـەر را و بۆچوونێك بکەن کە ببێتە مایەی دوورکەوتنـەوە لـە ڕێنماییـە ڕەسـەنەکان. لـەو ڕووەیشەوە کۆپەرنیکۆس خۆی پیاوی کەنیسە و باوەڕدار بوو، نەیویست ڕۆڵـی زندیق یان شەهیدێك بگێڕێ.

کاتێ "ڕاپۆرتی یەکەم" پێشوازی لێکرا، ڕتیکوس و خەڵکیتریش تکا و ڕجایـان لـە کۆپـەرنیکۆس کـرد تـا ڕێگـە بەبڵاوکردنـەوەی تـەواوی کتێبەکـە بـدات. ئـەویش سەرەنجام قایل بوو و دەستنووسەکەی بە ڕتیکوس سپارد تا بیبا بۆ نۆرمبـەرگ و سەرپەرشتیی لەچاپدانی بکات. بەڵام بەر لە تەواوبوونی ئـەو کـارە ڕتیکـوس وەك مامۆستا لە زانکۆی لیزیج لەو شارە دامـەزرا، ئـەویش ئـەو ئەرکـەی بـە ئەنـدریاس ئۆسلاندەر سپارد.

ئـەوە ڕوونـە کـە ئۆسـلاندەر لەبـەر بۆچـوونە پەرگیرانـەکانی کۆپـەرنیکۆس دڵەخورپەی بوو، لەبەرئەوە بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت پێشـەکیەکەی کۆپەرنیکۆسـی بۆ بەشی یەکەم لابرد و خۆی پێشـەکیەکی بـۆ نووسـی بـەبێ ئـەوەی نـاوی خـۆی بنووسێ، بەڵکو تەنیا ئەوەی گوت کە کتێبەکە تەنیا کۆمەڵێ گریمانەی تێدایـە بـۆ فەلەکناسان جێی بایەخە و پێویست نەبووە، یان ڕاسـت یـان شـیمانە نـەبووە کـە زەوی بخولێتەوە. بەواتەیەکیتر مـەرج نیـە ئـەو کتێبـە بەجـدی وەربگـیرێ. دیـارە ئۆسلاندەر ئەو کارەی بە نیەتپاکانە کردووە بۆ خۆلادان لە ڕەخنەی دوژمنکارانـە.

وەك میـزوا Mizwa دەڵـێ "دەشـێ ئۆسـلاندەر بـەبێ مەبەسـت خزمـەتێکی گەورەی بە کۆپەرنیکۆس کردبێ، گەورەتر لەوەی بەبیردا بـێ، تـا پارێزگـاری لـەم کتێبـە گرنگـە بکـات. بـەهۆی ئـەو پێشـەکییە سـاختە و سـاردکەرەوە و زرنگانـە نووسراوە وەك ئەوەی بەناوی دانەرەوە بۆ خوێنەرانی تیۆرەکانی ئەو نووسـەرەی بێ، کەنیسە لە بایەخی شۆڕشگێڕانەی ئەو "کودەتا"یەی بێئاگـا بـوو و تـا سـاڵی ١٦١٦ نەیخستە لیستی ڕەشەوە".

بەر لە تەواوبوونی چاپ، کۆپەرنیکۆس تووشی شۆکێکی توند بوو، سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو دەڵێ "لە یەکێك لە ساتە درامیەکانی مێژوودا، نێردراوێك لە فراونبێرگەوە هات و یەکەم دانە لە نایابترین کتێبەکانی کۆپەرنیکۆسی لە نورمبێرگەوە هێنابوو و چەند سەعاتێك بەر لەوەی گیانی بسپێرێ لەبەردەستیدا داینا. ئەوەیش لە ٢٤ی ئایاری ١٥٤٣دا بوو، ناونیشانی کتێبەکەیش بریتی بوو لە "سەبارەت بە هەڵگەڕانەوەی گۆ ئاسمانیەکان" De Revolutionbus Orbium Coetestium بوو. وەك باقیی دانراوە زانستیەکانیتری ئەو سەردەمەیش، بەزمانی لاتینی نووسرابوو.

کۆپەرنیکۆس کارێکی دانایانە و ژیرانەی کرد کاتێك ئەو کتێبەی کردە دیاری بۆ پاپا پۆڵسی سێیەم. بە شێوازی کردنەدیاریەکەدا دیارە کۆپەرنیکۆس پێشبینیی کردووە هەندێ زەحمەتی بێنە پێش:

"ئەی باوکی هەمەگیی پیرۆز هەقمە باوەڕی تەواوم هەبێ کە هەندێ خەڵك کاتێك دەبیستن من لەم کتێبانەمدا جوڵەم داوەتە پاڵ زەوی، دەستبەجێ بڕیار دەدەن ئەم رایە پشتگوێ بخرێ. من ئێستا تیۆرەکانی خۆمم زۆر بەدڵ نیە بۆیە گوێ بە حوکمی خەڵك لەبارەیانەوە نادەم. لەبەرئەوە کاتێك کەوتمە بیرکردنەوە لەو کەسانەی باوەڕیان بە جێگیریی زەوی هەیە لەبەرئەوەی بۆچوونەکانی چەندین سەدە پاڵپشتی دەکەن و کاتێك من دەڵێم "زەوی دەجوڵێ" دەڵێن من ماوەیەکی زۆر دوودڵ بووم، ئاخۆ ئەوەی بۆ سەلماندنی جوڵەی نووسیومە بڵاوی بکەمەوە، یان هاوشێوەی شوێنکەوتوانی فیساگۆرس کە عادەتیان وابوو نهێنیە فەلسەفیەکانیان بۆ خزم و دۆستانیان بەزارەکی دەدرکاند. کاتێك زۆر لەمە رامام، خەریك بووم ئەم کارە تەواوە بخەمە لاوە، ئەویش بەهۆی ئەو رقلێبوونەی هەقمە پێشبینی رووبەڕووبوونەوەی بکەم بەهۆی ئەوەی بیردۆزەکەم تازەیە و پێچەوانەی ئەوەیە عەقڵ قبوڵی دەکات. لەگەڵ ئەوەیشدا دۆستانم هانیان دام واز لەوە بێنم و

ئامۆژگارییان کردم ئەو کتێبەی لای خۆم شاردوومەتەوە بڵاو بکەمەوە، نەك بۆ ئەوەی تەنیا چەند ساڵێك بگرێتەوە بەڵکو بۆ چوارهێندەی ئەو ماوەیە. ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی دیاری بواری زانستیش هەمان داوایان لێکردم کە کەسانیتر ئامۆژگارییان کردم بیکەم و گوێ بە دڵەڕاوکێکەم نەدەم و لەوە زیاتر ڕێگە لە دەرکەوتنی کتێبەکەم نەگرم، بەڵکو بڵاوی بکەمەوە تا لە خزمەتی زانایانی ماتماتیکدا بێ..

بێگومان خەڵکانی زیرەك و زانا لەگەڵم کۆك دەبن ئەگەر بیانەوێ بەتەواوی لەو بەڵگانەی لەم کتێبەی بەردەمماندا دەیانخەمە روو تێبگەن. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەوەی زانا و نەزانان بزانن کە من لە حوکمی هیچ کەسێك ناترسم، وام بینی ئەم کارەم بکەمە دیاری بۆ قەداسەتتان نەك بۆ هیچ کەسێکیتر، لەبەرئەوەی ئێوە، تەنانەت بەو دوورییەشتان لەو شوێنەی منی تێدا دەژیم، بەوە ناسراون لە گەورەترین شەیدایانی هەموو بەشەکانی زانست و ماتماتیکن. لەبەرئەوە دەتوانن لەڕێی پێگە و دەسەڵاتتانەوە ژەهری دووزمانان پوچەڵ بکەنەوە، ئەگەرچی پەندەکە دەڵێ گەزینی دووزمان چارەسەری نیە. لەوانەیە هەندێ لە چەنەبازان کە هیچ لە ماتماتیك نازانن بەپشتبەستن بە برگەیەکی کتێبی پیرۆز کە بەئارەزووی خۆیان تەئویلی دەکەن، بڵێن مافی ئەوەیان هەیە حوکم لەسەر کتێبەکەم بدەن. ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە زاتیان کرد رەخنە لە پرۆژەکەم بگرن و لێی بدەن، گوێیان پێنادەم و بریارەکەیان بە هەڵەشەییەکی بێنرخ تەماشا دەکەم".

کۆپەرنیکۆس بیرۆکەکەی لەبارەی گەردوون لەم دەربڕینانەدا پوخت دەکاتەوە:

"دوورترینی تەنە ئاسمانیەکان بازنەی ئەستێرە جێگیرەکانە کە هەموو شتێکیان تێدایە، هەر لەبەر ئەم هۆیە ناجوڵێ. ئەو لەڕاستیدا چوارچێوەی ئەو گەردوونەیە کە جوڵە و سەنتەری هەموو ئەستێرەکانیتری پێوە پەیوەستە، ئەگەرچی هەندێ کەس وادەزانن بەشێوەیەك دەجوڵێ. ئێمە هۆیەکیتر باس دەکەین کە لە

تیۆرەکەی ئێمەدا سەبارەت بە جوڵەی زەوی بەو شێوەیە دیارە. لەنێو تەنە جوڵاوەکاندا زوحەل یەکەمە و لە ماوەی سی ساڵدا دەسوڕێتەوە، پاشان مەریخ کە بەدوو ساڵ دەسوڕێتەوە. چوارەمیان لە ریزبەندیدا کە سوڕانەوەکەی لە ساڵێکدا تەواو دەکات زەوییە کە خولگەی مانگی بەدەوردایە. زوهرە بەپلەی پێنجەم دێ و سوڕانەوەی لە نۆ مانگدا دەبێ، پاشان عەتارید بەپلەی شەشەم دێت و لە هەشتا رۆژدا دەسوڕێتەوە. خۆریش لە ناوەندی هەمووانداییە، کە مەشخەڵی لەم پەرستگە بێئەندازە جوانەدا داناوە لە جێیەکدا هیچ جێیەکیتر هاوتای نیە و دەتوانێ لێیەوە لە یەك کاتدا هەمووان روناك بکاتەوە.. کەواتە لە سیستمە سەرسوڕهێنەکەدا لێکچوونێکی نایاب لە گەردوون و رێژەیەکی دیاریکراو لە هاوئاهەنگی لە جوڵەی ئەو خولگانە و مەودایاندا بە رێگەیەکی وا کە بە هیچ رێگەیەکیتر بەدەست نایەت".

ناوەرۆکی کتێبی "کودەتا لە خولگە ئاسمانیەکاندا" لە پلانی پەرەپێدانی تیۆری ئەو خولگانەدا کورت دەبێتەوە. سەرەتا بە پێشکەشکردنی بەدیاری بۆ پاپا پۆڵسی سێیەم دەست پێدەکات. پاشان ئەو پێشەکییە ساختەیەی ئوسلاندەر نووسی، دوای ئەوە کتێبەکە بۆ شەش بەشی سەرەکی دابەش دەبێ، هەر بەشێکیش بۆ کۆمەڵە دەروازەیەك دابەش دەبێ. بەشی یەکەم بۆچوونەکانی کۆپەرنیکۆس دەربارەی گەردوون و ئەو بەڵگانەی پشتیگری لە تیۆرەکەی دەکەن کە دەڵێ خۆر چەقی گەردوونە، بیرۆکەی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا وەك باقیی هەسارەکانیتر و تاوتوێکردنی وەرزەکان، لەخۆ دەگرێ کە لە چەند دەروازەیەك پێکدێ. لە کۆتایی ئەم بەشەدا بابەتێکی زانستی لەبارەی حسابی سێگۆشەکان لەخۆ دەگرێ. تیۆرەکانی ئەم بەشە لە ماتماتیکدا لە بەشەکانی دواتری کتێبەکەدا بەکار هێناوە.

بەشـی دووەم بـاس لـە جوڵـەی ئـەو تەنـە ئاسمانیانـە دەکـات کـە لـە رووی ماتماتیکیەوە حساب کراون و بە لیستێکی ئەستێرەکان کۆتایی پێدێنێ و شوێنی هەریەکەیان لە ئاسمانـدا روون دەکاتـەوە، ئـەو لیستـەیش زۆربـەی لـە کتێبەکـەی بەتلیمۆس وەرگیراوە، لەگەڵ هەندێ راستکردنەوە.

ئەو چوار بەشـەی مـاون شـەرحێکی بـەوردەکاری بـۆ جوڵـەکانی زەوی و مـانگ و هەسارەکانیان تێدایە. شـیکردنەوەی هـەر حاڵـەتێك کۆمـەڵێ شـێوەی ئەنـدازەیی لەخۆ دەگرێ کە ئەو رێڕەوە روون دەکاتەوە کە هەریەك لە گۆکان لەسەر بنـەمای حساباتەکانی کۆپەرنیکۆس لەسەری دەڕۆن.

یەکێك لـەو هۆیانـەی دژی بـیردۆزی زەویـی جـوڵاو بـاس کـراوە، کـە ئـەو هۆیەیـە بەتلیمۆس باسی کردووە، ئەوەیە پێویستە زەوی جێگیر بێ ئەگینا هەر تـەنێك لـە بۆشایی ئاسماندا مەلە بکات، بەدەم جوڵەوە لە زەوی دوور دەکەوێتەوە، هەروەها هـەر تـەنێك تـووڕ بدرێتـە هـەوا لـە ماوەیـەکی زۆر دوور بـۆ خۆرئـاوا دادەبـەزێ. بەهێزترینی هۆکانیش ئەوەیە ئەگەر راسـت بـێ زەوی بـەو خێراییـە زۆرە بجـوڵێ، ئەوا هەر زوو بۆ بەشی بچوك بچوك ورد دەبێ و لە بۆشایی ئاسماندا پەرش و بڵاو دەبێتەوە.

پـێش دۆزینـەوەی تیۆرەکـانی میکـانیکیی تایبـەت لەلایـەن گـالیلۆ و دۆزینـەوەی یاسـای کێشـکردن لەلایـەن نیوتنـەوە، پوچـاندنەوەی ئـەم بەڵگـە بەتلیمۆسـیانە ئاستەم بوو. کۆپەرنکیکۆس وەڵامـی داوەتـەوە بەوەی کـە ئـەو هەوایـەی دەوری زەوی داوە لەگـەڵی دەسـوڕێتەوە. زیـاتریش ئـەوە ماقووڵـە کـە وا گریمانـە بکـرێ زەوی دەسوڕێتەوە نەك هەوای گەردوون، لەبەرئـەوەی ئەگـەر زەوی نەسـوڕێتەوە ئەوا بـۆ روودانـی شـەو و رۆژ ئاسمـان دەسـوڕێتەوە. بە تێرامـانێکی فەلسـەفیش بەرگری لە قسـەکەی دەکـات و دەڵـێ: ئـەوە سروشـت نیـە کـە خـۆی خـۆی تێـك

بشکێنێ، خوا گەردوونی دروست نەکردووە هەر تەنیا بۆ ئەوەی ئەم گەردوونە خۆی خۆی تێکبشکێنێ.

کۆپەرنیکۆس باوەڕی وایە خۆر ناجوڵێ، ئەو ئەرزێی و جێگیرە لەنێو هەسارە سوڕاوەکاندا. ئەم باوەڕەیش لە بیرۆکەکەی بەتڵیمۆس لەبارەی زەوی دەچێ. کۆپەرنیکۆس باوەڕی وابوو تاکە ئەرکی خۆر ئەوەیە روناکی و گەرما بۆ گەردوون دابین بکات و گەردوونیش زۆر سنووردارە. زانیاریەکانی بەتڵیمۆس دەڵێن هیچ فەزایەك نیە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەستێرەکاندا و رێی تێدەچێ فەزای بێکۆتا لای کۆپەرنیکۆس ناسراو نەبووبێ، هەروەك بەلای بەتڵیمۆسی ١٤٠٠ ساڵ پێش ئەویشەوە ناسراو نەبوو. هەروەك لە سیستمی بەتڵیمۆسیش لەبارەی ئەو خولگە یەی دەوری خولگەی تەنە ئاسمانیەکانی داوە نەخوێنرایەوە.

هەر خولگەیەك لە خولگە جیاوازەکان چەقێکی هەبوو، خۆریش رێك لە چەقی خولگەی هەسارەکاندا نەبوو. گەردووونناسانی پاشتر ئەم دیاردانەیان لە سیستمی کۆپەرنیکۆسدا راست کردەوە.

پەسەندکردنی سیستمی کۆپەرنیکۆس لەلایەن زانایان و گەل بەگشتیەوە لەسەرخۆ بوو. هەندێ بۆچوونی هاوچەرخ هەبوون بەتوندی نەیاری ئەو سیستمە بوون. بەگوێری چیرۆکێك، قوتابیانی زانکۆ هێرشیان کردۆتە سەر ئەو شوێنەی کتێبەکەی کۆپەرنیکۆسی تێدا چاپ دەکرا و هەوڵیاندا چاپخانەکە بشکێنن و دەستنووسە ئەسڵیەکە بدڕێنن، بەڵام کرێکارانی چاپخانەکە بەربەستێکیان لەنێوان خۆیان و هێرشبەراندا دانا تا کارەکانیان تەواو کرد. هەروەها تیپێك ئەکتەری گەڕۆك شانۆگەریەکی کۆمیدییان بۆ گاڵتەکردن بە کۆپەرنیکۆس پێشکەش دەکرد و ئەو پیاوە فەلەکییەیان وا پیشان دەدا کە خۆی بە شەیتان دەفرۆشێ.

بەڵام کاردانەوەی ڕێکخراوە کەنەسیەکان جدیتر و توندتر بوو، چونکە ئەو تیۆرە تازانە دژی بیروباوەڕە فەلسەفی و ئاینیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوون. ئەگەر تیۆرەکەی کۆپەرنیکۆس ڕاست بووایە مرۆڤ
پێگەیەکی ناوەندی لە جیهاندا نەدەگرت، لەو جێیەی لێی وەستابوو دەیگواستەوە و ماڵەکەی دەیگواستەوە بۆ یەکێك لە هەسارەکان.
بەڵام لەو ڕووەوە کتێبەکەی کۆپەرنیکۆس پڕ بوو لە شتیتر، هەروەها بەهۆی پێشەکییە فریودەرەکەی ئوسلاندەرەوە کەنیسە ڕێوشوێنێکی فەوری دژی نەگرتەبەر، بەڵام ڕابەرانی ریفۆرم کەمتر بەربەستیان دروست دەکرد. مارتن لۆسەر لە زۆر بۆنەدا بەتوندی ڕەخنەی لە کۆپەرنیکۆس دەگرت و ئاماژەی بۆ دەکرد بە "ئەو فەلەکناسە نوێیەی بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەوە زەوییە دەسوڕێتەوە نەك ئاسمان و خۆر و مانگ، وەك ئەوەی کەسێك لە عەرەبەیەکی بزۆز یان کەشتیەکی جوڵاودا بێ و وا گومان ببات کە ئەو جێگیرە و ئەوە زەوی و درەختەکانن دەجولێن و بەلایدا تێدەپەڕن. بەڵام ئەمە دۆخەکەیە لەم ڕۆژانەدا، هەر کەس بیەوێ دەریبخات ئەویش بەتوانایە، پێویستە شتێك لای خۆیەوە دابهێنێ و بەباشترین شتی دابنێ لەبەرئەوەی ئەو دایهێناوە ! ئەو بێئەقڵە دەیەوێ هەموو زانستەکانی فەلەك قڵپ بکاتەوە. بەڵام، وەك کتێبی پیرۆز دەڵێ، ئەوە خۆر خۆیەتی نەك زەوی، کە یەشوع فەرمانی پێ کردووە بوەستێ".
هەروەها میلانکسۆن قوتابیی دڵسۆزی لۆسەر گاڵتە بە کۆپەرنیکۆس دەکات و دەڵێ "ئەو خۆری وەستاند و وایکرد زەوی بجولێ".
جۆن گالڤینیش مەزموری ٩٣ "كذلك پبتت المسكونه لاتتزعزع" بە بەڵگە دێنێتەوە و دەپرسێ "کێ زات دەکات دەسەڵاتی کۆپەرنیکۆس لەسەروو دەسەڵاتی ڕۆحی پیرۆز دابنێ؟".

کەنیسـەی کاسـۆلیکی تـا سـاڵی ١٦١٥ ڕێکـاری یەکلاکـەرەوەی دژی کتێبەکـەی کۆپەرنیکۆس نەگرتە بەر. هەموو ئەوەی کردی تۆڵەسەندنەوە بـوو لـە لایـەنگرانی تیۆرەکانی کۆپەرنیکۆس وەك گالیلۆ و برونۆ.

هەڵوێست لە ڕێبازی کۆپەرنیکۆس بەم شێوەیە بوو:

"بیرۆکەی یەکەم کە دەڵێ خۆر چەقە و بەدەوری زەویدا ناخولێتـەوە، بێئـەقڵی و هیچوپوچی و ساختەیە لـە زانسـتی لاهوتـدا، هـەروەها بێبڕواییـە لەبەرئـەوەی لـە ئەلیفەوە تا (یا) پێچەوانەی ئەوەیە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە. بیرۆکەی دووەمیش کە دەڵێ زەوی بەدەورەی خۆردا دەسوڕێتەوە و چەق نیە، لە ڕووی فەلسـەفیەوە هیچوپوچ و ساختەیە. لە ڕووی لاهوتیشەوە لانیکەم لەتەك عەقیدەی ڕاستەقینەدا ناگونجێ".

سـاڵی ١٦١٦ کتێبەکـەی کۆپـەرنیکۆس خرایـە لیسـتی کتێبـە حەرامەکانـەوە "تـا ڕاسـت دەکرێتـەوە". لـە هـەمان کاتـدا سـەرکۆنەی "سـەرجەم ئـەو نووسـینانەی پاڵپشتیی لە جوڵەی زەوی دەکەن" کرد. کۆپـەرنیکۆس بـۆ مـاوەی زیـاتر لـە دوو سەدە لە لیستی ڕەشدا مایەوە. تا ساڵی ١٨٣٥ ئەو نەفرەتە لابرا.

ئەو چارەنووسەی هاتە ڕێی گالیلۆ و برونۆ بوو بە ڕێگر لـەوەی کەسـیتر بـاوەڕ بـە تیۆرەکانی کۆپـەرنیکۆس بێنێ. جیۆناردۆ برونۆ زیاد لەوانیتر ڕۆیشت و باسی لەوە کرد فەزا سنووردارە و خۆر و هەسارەکانی تـەنیا یـەکێکن لـە چـەند کۆمەڵەیـەکی هاوشێوە. زیاد لەوەیش پێی وابوو لەوانەیە جیهانیتر هەبن کە مەخلوقاتی لە ئێمە باشتر تێیاندا نیشتەجێ بن.

برونۆ لەسەر ئەم بێدینییە لەبەردەم دادگەی پشکنینی ئاینیدا تاوانبار کـرا، سـاڵی ١٦٠٠ بەستیانەوە بە ستونێکەوە و سووتاندیان. بـەڵام سـزای زانـای فەلەکناسـی ئیتـاڵی گـالیلۆ سـووکتر بـوو، سـاڵی ١٦٣٢ لەبـەردەم دادگـەی پشـکنینی ئاینیـدا وەستێنرا و هەڕەشەی ئەشکەنجەدان و کوشتنی لێکرا و ناچـار کـرا لەسـەر ئـەژنۆ

كڕنوش ببات و هەموو بیروباوەڕەكانی و تیۆرەكانی كۆپەرنیكۆس بەدرۆ بخاتەوە.
جا سزای بەندكردنی هەتاهەتایی بەسەردا درا.

فەیلەسوف و زاناكانیش بەهەمان شێوەی لاهوتییە كاسۆلیسك و پرۆتستانتەكان لە قبولكردنی بیردۆزەكەی كۆپەرنیكۆسدا دوودڵ بوون. بۆ نموونە فرەنسیس باكۆن كە یەكێكە لە دامەزرێنەرانی رێگە زانستییە نوێكان، هەوڵیدا بیرۆكەی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆر لە خولگەیەدا پوچەڵ بكاتەوە. بەم شێوەیە زاڵبوونی ئەرستۆ و بەتلیمۆس بەسەر زانكۆكانی ئەوروپادا بۆ ماوەیەكی درێژ پاش بڵاوبوونەوەی كتێبی "كودەتا لە خولگە ئاسمانیەكاندا" درزی تێنەكەوت.

لەڕاستیدا وەك ستێبینز دەڵێ "قبولكردنی تیۆری كۆپەرنیكۆس لە هەموو دەوڵەتاندا لەسەرخۆ بوو. لە ئەمەریكا لە هەمان كاتدا هەردوو تیۆری بەتلیمۆسی و كۆپەرنیكییان لە زانكۆی هارڤارد و ییل دەخوێند".

بەلام هێدی هێدی تیۆری كۆپەرنیكۆس خۆی سەپاند و لە دەیان ساڵی پاشتردا لێكۆڵینەوەكان لەسەر دەستی زانا بوێرەكانی وەك جوردانو برۆنو و تیكۆ براهی و یۆحەنا كیپلەر و گالیلۆ گالیلی و ئیسحاق نیوتن بەردەوام بوون و كێوێك بەڵگەیان كۆ كردەوە كە بەدرۆخستنەوە، یان مشتومڕ هەڵناگرن. بەهۆی لێكۆڵینەوەكانی ئەو توێژەرانەوە ناتەواویەكانی تیۆرەكەی كۆپەرنیكۆس پڕ كرانەوە، لەوەیشدا پێشكەوتنی ئامێرەكانی چاودێریكردنی ئاسمان یارمەتیدەر بوو.

مەزنترین زانای فەلەكناس راستەوخۆ پاش كۆپەرنیكۆس هات زانای دانیماركی تیكۆ براهی بوو. تیكۆ براهی هیچی بۆ تیۆری خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆر زیاد نەكرد، بەلام بەپشتبەستن بەو ئامێرە باشانەی پاشای دانیمارك بۆی دابین كرد، توانی زۆر باشتر لە كۆپەرنیكۆس چاودێری و پێوانەكارییە گەردوونیەكانی ئەنجام بدات. لەسەر بنچینەی ئەم زانیاریانە، پاش مردنی تیكۆ، زانای ئەڵمانی یۆحەنا كیپلەر توانی سێ یاسا بەناوبانگەكەی دابڕێژێ: ١- هەسارەكان لە

خولگەیەكی هێلكەیی (اهلیلجی)دا دەجولێن نەك بازنەیی و خۆریش لە یەك چەقدا هەیە.

٢- لەو رووەوە زەوی و باقیی هەسارەكانیتر لە خولگەیەكی هێلكەییدا بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، بە خێراییەكی رێك ناخولێنەوە بەڵكو كاتێك لە خۆرەوە نزیكتر بن خێرایی خولانەوەیان زیاد دەبێ.

٣- دووریی هەسارەكان لە خۆرەوە لەگەڵ ماوەكانی خولانەوەیان بەدەوری خۆردا گونجاوە.

گالیلۆ یەكەم كەس بوو تیلسكۆبی بۆ فەلەكناسی دابین كرد، زۆر لە دۆزینەوە تیلیسكۆبیەكانی راستیی دۆزینەوەكەی كۆپەرنیكۆس دەسەلمێنێ. گالیلۆ بناغەیەكی زانستی پێشكەش كرد كاتێك بنەما بنچینەییەكانی زانستی داینامیكا یان زانستی جوڵەی پێشكەش كرد. ئیسحاق نیوتن بەڵگەی بنبڕی پێشكەش كرد لەسەر راستیی تیۆری كۆپەرنیكۆس، ئەویش بە دۆزینەوەی یاسای كێشكردن و داڕشتنی ئەو یاسایانەی هەسارەكان بەگوێرەیان دەجولێن. تیۆری ئەنیشتانیش لەبارەی گوێرەیی (رێژەیی) كە لە سەدەی بیستەمدا دەركەوت، پەردەی لەسەر هەندێ لە شتە تەمومژاویەكانیتری گەردوون هەڵماڵی.

لەبەر تیشكی ئەو دەستكارییە زۆرانەی زانایانی سەدەكانی پاشتر كردیان، ئەو پرسیارە بەجێ و كراوە پەیدا بووە كە: ئایا تیۆری كۆپەرنیكۆس راستە؟

نكوڵی لەوە ناكەین كۆپەرنیكۆس تیۆرێكی ناتەواو و ناوردی لە چەند خاڵێكدا بەجێهێشت. زاناكان سەلماندیان بیرۆكەكەی لەبارەی سوڕانەوەی تەنە ئاسمانیەكان لە خولكەیەكی بازنەییەدا هەڵەیە، چونكە لە خولگەیەكی هێلكەییدا دەسوڕێنەوە. كۆپەرنیكۆس گەردوونی بە سنووردار دەبینی بەپێچەوانەی تیۆری نوێ كە دەڵێ ژمارەیەكی بێسنوور كۆمەڵەی خۆر هەن. هەروەها لە وردەكاریەكانیتردا ئەو تیۆرانەی پێش پتر لە چوارسەد ساڵ پێشكەشی كردوون

زۆر لە زانیاریەکانی ئەمڕۆمان جیاوازن. بەڵام لە بنچینەی تیۆرەکەدا، کە دەڵێ خۆر چەقی کۆمەڵە هەسارەکانە، کۆپەرنیکۆس حەقیقەتێکی بنچینەیی دۆزیەوە و بناغەیەکی پێشکەشی فەلەکناسیی نوێ کرد.

پێگەی کۆپەرنیکۆس بۆ ئەبەد لە مێژووی زانستەکان ریشەی داکوتا. هەژمونی بەسەر هاوسەردەمەکانی و تەواوی بیری پاش خۆیدا، پێگەیەکی نایابی پێ دەبەخشێ. وەك گۆتە دەڵێ: "هیچ دۆزینەوە و رایەك لەنێو دۆزینەوە و راکاندا، کاریگەریی لەسەر رۆحی مرۆڤایەتی لە کاریگەریی تیۆری کۆپەرنیکۆس مەزنتر نەبووە. دەگمەن بوو خەڵك بزانن دنیا خۆی لە خۆیدا خڕی تەواو خڕە ئەگەر داوا لەم جیهانە بکرایە دەستبەرداری ئەوە ببێ کە ئەو چەقی گەردوونە.. رەنگە داوای شتێکی لەمە گەورەتر لە مرۆڤایەتی نەکرابێ، لەبەرئەوەی بەو دانپێدانانەی زۆر شت لەنێو تەمومـژ و دوکەڵدا ون بوون! بەهەشتەکەمان، دنیاکەمان، دنیای بەربەریەکان و تەقوا و شیعر، رێبەری هەستەکان بوونە تۆمەتبارکردنی عەقیدەیەکی شاعیرانە و ئاینیانە؟ هیچ سەیر نیە کە هاوسەردەمەکانی حەزیان نەکردووە رێگە بدەن هەموو ئەمە تێبپەڕێ، تا توانییان بەرەنگاریی رێبازێکیان کرد کە (ئازادیی بیروڕا) و (مەزنیی بیرکردنەوە)یەکی ئەوتۆی بۆ هەوادارانی هێنایە کایە کە تا ئەوکاتە نەناسرابوون، لەڕاستیدا قەت خەویشی بەو دووانەوە نەدیبوو".

لە کۆتاییدا با لە بۆچوونی سێ لە زانا بەناوبانگە ئەمەریکییە هاوچەرخەکان رابمێنین. ڤانیڤار بوش دەڵێ "دانراوە نایابەکەی کۆپەرنیکۆس بەهۆی کاریگەری لەسەر هەموو لایەنەکانی هزری بەشەری، خاڵێکی وەرچەرخانی مەزنی دروست کرد. نموونەیەکی بەرچاوی لەبارەی کاریگەریی راستیی زانستی لە ئازادکردنی مێشکی مرۆڤ و بەرچاورۆشنبوونی لە هەڵمەتەکانی ئایندەی نەزانی و سستی، پێشکەش کرد".

هارۆلد ك.ئوری خاوەنی خەلاتی نۆبل دەلێ "زمان لەئاست وەسفکردنی کتێبەکەی کۆپەرنیکۆسدا لاڵە. بیرۆکەیەکی دەربارەی کۆمەڵەی خۆر تێکشکاند کە ماوەی هەزار ساڵ بوو هەبوو و بیرۆکەیەکی تەواو پێچەوانەوەی لەبارەی پەیوەندیی هەسارەکان بەخۆرەوە پێشکەش کرد. بەو کارەی بوو بە یەکەم کەس هەموو ڕێگەی نوێی بیری زانستی پێشکەش کرد و بیرکردنەوەمانی سەبارەت بە هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی گۆڕی".

هەروەها زانای فەلەکناسی ناسراو هارلان ترو ستێتسۆن دەڵێ "هەمیشە ئەوە مایەی دۆشدامانە کە لە لیستی دوور و درێژی پیاوانی راستەقینەی بەناوبانگ لە مێژووی زانستەکان کە بەشدارییان لە پێشکەوتنی زانستەکان کردووە، بکۆڵیتەوە پاشان ژمارەیەکی کەمیان وەك سەرکەوتووترینیان دەستنیشان بکەیت. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر داوا لە من بکرێ سێ ناویان هەڵبژێرم، بەبێ دوودڵی دەمگوت: کۆپەرنیکۆس و نیوتن و داروین. ئەو سیانە لە هەندێ تایبەتمەندیدا هاوبەشن کە ناکرێ لە بواری سەرکەوتنی پێشکەوتندا لێك جیابکرێنەوە. ئەو تایبەتمەندیانەیش بریتین لە خەیاڵ و بوێری و بلیمەتی و ناسکیی دەرخستنی تێگەیشتنی موعجیزەئاسا بۆ بیرەکان. بەلەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو مەرجانەی بۆ هەڵبژاردنی مەزنترینی ئەو سیانە پێویستن، پێم وایە پێویستە چەپکە گوڵەکە بۆ کۆپەرنیکۆس بێ، لەبەرئەوەی ئەو بناغەی زانستی فەلکناسیی نوێی دانا و بەبێ ئەوە نیوتن نەیدەتوانی یاسای کێشکردن دابرێژێ. هەر ئەو بوو دەرگای لەبەردەم جۆرە بیرکردنەوەیەکی یاخییانەدا کردەوە، کە گۆڕیی ئەو بنەمایە دەکات کە پێویستە جێگەی خۆی بگرێ بەر لەوەی تیۆری پەیدابوون(ی داروین) پێی لەنێو بیرکردنەوەماندا بچەسپێنێ".

## ١٢- "جوڵەی دڵ"
## ویلیەم هارڤی William Harvey
### کازیوەی پزیشکیی زانستی

زیندەوەرزانی و توێژینەوەکانی لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەیەمدا تەنیا کەمێك لە خوێندنی فەلەکناسی بەر لە کۆپەرنیکۆس پێش کەوتبوو. هێشتا پزیشکان و قوتابخانەکانی پزیشکی لە کارکردن و فێرکردندا پشتیان بە تیۆرەکانی توێکاری و کارئەندامزانیی تایبەت بە دڵ و خوێنبەر و خوێنهێنەرەکان و خوێن، کە لە پزیشکی یۆنانیی مەزن گالین Galenەوە بۆیان مابوویەوە، کە لە سەدەی دووەمدا ژیاوە، دەبەست.

بۆ ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ هیچ زیادەیەکی گرنگ نەخرایە سەر زانیاریەکانی مرۆڤ لەبارەی سوڕی خوێن و کارەکانی دڵ. ئەرستۆ دەیزانی خوێن لە جگەردا دروست دەبێت و لەوێوە دەچێ بۆ دڵ. پاشان لەڕێی لەشەوە بۆ خوێنهێنەرەکان. پێی وابوو هەر دڵیش سەرچاوەی گەرمیی لەش و بارەگای زیرەکییە. ئیرازیستراتوس کە دەرچووی قوتابخانەی ئەسکەندەریە بوو، باوەڕی وابوو خوێنبەرەکان هەڵگری جۆرێکی هێمن لە هەوا یان ڕۆحن.

گالین ئەم بیرۆکەیەی ڕاست کردەوە و دۆزیەوە کە خوێنبەرەکان هەڵگری خوێنن نەك هەوا. بەڵام بۆ چەندین سەدە پاش ئەو سەردەمە، پزیشکان قەناعەتیان وابوو ڕۆحێك یان شتێکی لەو بابەتە ڕۆڵێك لە دەزگای خوێندا دەبینێ، ڕەنگە ئەوەیش بۆ بووژانەوەی دڵ بێ.

تـەنها زانـا هـەرە بوێرەکـان زاتیـان کـردووە قسـە لەسـەر شـتە رابردووەکـان و بیروبـاوەڕە بۆماوەکـانی زانـا کۆنینـەکان بکـەن. پێیـان وابـوو ئـەوەی گـالین نووسیویەتی لە سەرچاوەیەکی پیرۆزەوەیە و هیچ مشتومڕ و گومانێـك هـەڵناگرێ. هـەر بـە گـوێرەی گـالین جگـەر سـەنتەری کۆئەنـدامی خوێنـە. دەڵـێ: خـواردنی هەرسکراو دەچێ بۆ جگەر و لەوێ دەگۆڕێ بۆ خـوێن لەگـەڵ تێکردنـی "ڕۆحێکـی سروشـتی". هـەروەها خـوێن لـە جەسـتەدا بـەرەو پـێش و بـەرەو دوا دەڕوات لـە ڕێگەی خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانەوە وەك ئەوەی لە هەڵکشان و داکشانی دەریادا ڕوودەدات. خوێنی خوێنبەر کە لـە یـەکێك لـە لاکانی دڵـەوە هـاتووە جیـاوازە لـە خوێنی خوێنهێنەر کە لەلاکەیترەوە لەڕێی کونیلەی وردەوە دێ.

بەدرێـژایی سـەدەکان، زۆر شـتی پڕپـوچ لـەبارەی خوێنـەوە بـۆ ئـەم ڕاسـتییە سروشتیانە زیاد کراوە. خوێن لە هەر بەشێکیتری جەستە زیاتر پـیرۆزی هـەبووە، بەبەڵگەی بەکارهێنانی لە قوربانییە ئاینیەکان و ڕژاندنی خـوێن بـە سـەربڕگەکانی خواوەندەکاندا.

کـاتێ سـاڵی ١٦٠٠ هـات گۆڕانکـاری لـە کەشـەکەدا هەموولایـەکی گرتبـووەوە. ڕێنیسـانس لـە ئـەورووپا تـەنها کـاری بـۆ زیندووکردنـەوەی ئـەدەب نـەکرد، بـەڵکو بێدارکردنەوەیەکی زەینیشی گرتەوە کە کاری لە زانستە سروشـتیەکان کـرد. ئـەو سەردەمە سەردەمی گالیۆ و کیپلەر و هارڤی و باکۆن و دیکارت بـوو. پـەنجا سـاڵ بەر لەوەیش ئەندریاس زیسایوس لە ئیتاڵیا نەبوونی ئـەو کونیلانـەی سـەلماند کـە گالین باسی کردبوو. هیچ پەیوەندیـەکی ڕاستەوخۆ لـەنێوان دوو ژوورەکـەی دڵـدا نەبوو. نزیکەی هەمان سەروەخت، سەرڤیتوس کە پاشتر جۆن گـاڵڤن سـووتاندی، بـاوەڕی خـۆی دەربـڕی کـە خـوێن لـەڕێی سیەکانەوە دەسوڕێتەوە، بـەڵام دانـی بـەوەدا نـەنا کـە دڵ ئەنـدامێکی پاڵنـەرە. هـەروەها ریاڵـدو کۆلۆمبـۆ مامۆسـتای توێکاری لە ڕۆما باسی لە بیرۆکەی سوڕی خـوێن لـە سیەکاندا کـرد. سـاڵی ١٦٠٣

فابریکیوسی پادوایی ئەڵقەیەکیتری خستە سەر زانست کاتێک دۆزیەوە کە خوێنهێنەرەکان دەمەوانەیان هەیە ئەگەرچی نەیدەزانی مەبەست لەوانە چییە، بەڵکو تەنیا بەو دەرەنجامە گەیشت کە تەنها بۆ خاوکردنەوەی رۆیشتنی خوێنە بۆ پەلەکان.

بەم شێوەیە ئەمانە و کەسانێکیتری بەجەرگ دەبوو هەڵەشە بن و گومان بخەنە سەر بیروباوەڕە کۆنەکە کە پێشکەوتنی پزیشکی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پەك خستبوو. لەلایەکیترەوە کەسیش نەیتوانی بگاتە راستی تەواو. هەر یەکەیان بە ئەندازەیەکی گەورە بەشدارییان لە لادانی پەردە لەسەر راستیی سوڕی خوێن و ئەرکەکانی دڵدا کرد، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا لە سنووری وەڵامێکی بەشەکی و ناتەواودا وەستا. ئەوەی کۆمەڵێ بیردۆزی سیستماتیك و پۆلێنکراوی دۆزیەوە و دایڕشتن، عەقڵی بلیمەت و تیژی پزیشکی ئینگلیزی ویلیەم هارڤی بوو.

رێنیسانسی زانستی درەنگتر لە گەیشتنی بە کیشوەری ئەورووپا بەتایبەت بە ئیتاڵیا، گەیشتە بەریتانیا. بەڵام لەو سەردەمەی هارڤی تێدا لەدایك بوو (١٥٧٨) گەلی بەریتانی پێی دەنایە یەکێك لە مەزنترین قۆناغە مێژووییەکان. لە سەدەی پاشتردا شاژن ئەلیزابیث حوکمی بەریتانیای کرد، هێزی دەریایی بەرتانیایش بە شکانی کەشتیگەلی ئیسپانی ئەرمادا چەسپا و بدۆزە ئینگلیزەکان زەویی نوێیان دۆزیەوە، شکسپیر و دۆن و سپێنسەر و درایدن و میلتۆن و جۆنسۆن و باکۆن لە جیهانی ئەدەبدا درەوشانەوە، بەوەیش بیری تایبەت بە سەدەکانی ناوەڕاست لەبۆتە درا. ئیتر خۆری بیرکردنەوەی رابردوو بەرەو ئاوابوون چوو، عەقڵی خەڵك لەنێو سنوورێکی دیاریکراودا ئازاد بوو بۆ داهێنانی بیری نوێ و کردنەوەی ئاسۆگەلێك کە پێشتر نەکرابوونەوە.

هارڤی بۆ ئەوەی پزیشکی بخوێنێ، شتێکی سروشتی بوو کە بچێ بۆ ئیتاڵیا. زانکۆی بەناوبانگی پادوا ناونرا "دایك، پەروەردەکەری رێنیسانسە" و بۆ چەندین

ئەوە بە سەنتەری پزیشکیی ئەوروپا مایەوە. پاش ئەوەی هارڤیی لاو زانکۆی کامبرێدجی تەواو کرد ماوەی چوار ساڵی بەسەر برد کە زۆربەی لەژێر ڕێنوێنیی مامۆستای بەناوبانگ و بەتوانا فابریکیوس دۆزەرەوەی دەمانەوانەکانی خوێنهێنەرەکان بوو و فێر بوو تاقیکردنەوە لەسەر ئاژەڵە جیاوازەکان بکات و ڕوونی بکاتەوە. ڕەنگە چاکە بۆ تیۆرەکانی فابریکیوس بگەڕێتەوە لە چێژبینینی لە سوڕی خوێن کە بەدرێژایی تەمەنی لەگەڵی مایەوە.

کاتێ هارڤی ساڵی ١٦٠٢ گەڕایەوە ئینگلتەرا ڕێچکەیەکی ژیانی دەست پێکرد کە چارەنووس وابوو بۆ ماوەی پەنجا ساڵی پاشتر بەردەوام وەك پزیشك و وانەبێژ و نووسەر کار بکات. کچی پزیشکی تایبەتی شاژن ئەلیزابیسی خواست. پاش ئەوە لە زانکۆی شاهانەی پزیشکان کاری کرد، هەروەها وەك پزیشك لە نەخۆشخانەی بارپۆلۆمیو و وەك پزیشکی جێمسی یەکەم و شارلی یەکەم کاری دەکرد.

سەرباری ئەمە، هارڤی زیاتر حەزی لە توێژینەوەی پزیشکی و ئەزموونکاری بوو تا پزیشکایەتی. ساڵی ١٦١٦ دەستی کرد بە وانەگوتنەوە دەربارەی سوڕی خوێن لەبەردەم کۆلێژی پزیشکاندا. هێشتا دەستنووسی وانەکەی ماوە کە بە تێکەڵەیەکی لاتینی و ئینگلیزی نووسراوە و بە خەتێك بەحاڵ دەخوێنرێتەوە. هەندێ لە تاقیکردنەوەکانی لە یاداشتەکانیدا باس کردووە و ڕوونی کردۆتەوە کە لەو بەروارەدا قەناعەتی تەواوی بە تیۆرە بەناوبانگەکانی لەبارەی سوڕی خوێن پەیدا کردووە. دەنووسێ "خوێن بە پاڵنانی لێدانەکانی دڵ لە بازنەیەکی بەردەوامدا دەجوڵێ".

دوازدە ساڵ تێپەڕی بەر لەوەی هارڤی خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئەنجامانەی پێیان گەیشتووە ئامادە بکات. ئەم دواکەوتنە لە ڕاگەیاندنی ئەم جۆرە دۆزینەوە مەزنەدا بۆ جیهان بۆچی؟ چەند لێکدانەوەیەك لەم بارەوە هەن. سێر ویلیەم ئۆسلەر پێی وایە "لەوانەیە پاڵنەرەکەی هەمان پاڵنەری کۆپەرنیکۆس بووبێ کە

لە دەمارگیریی مرۆڤ دەترسا. تەنانەت دەوترێ بۆ ماوەی سێ ساڵ نامە شۆڕشگێڕانەکەی لە دۆڵابەکەیدا دەستبەسەر کردووە. بەهەمان وشەکانی هارڤی، تیۆرەکەی لەبارەی سوڕی خوێنی گشتی "نوێیە و بەجۆرێکە نەبیستراوە، تەنانەت من تەنها لە ئازاردانی کەسێك لەئەنجامی حەسودیی کەسانێکی کەمەوە نیە، بگرە دەرلەرزم لەوەی هەموو مرۆڤ بکەمە دوژمنی خۆم. دابونەریتەکان ئەگەر بگۆڕێن بۆ سروشتێکیتر دەتوانن زۆر شت بکەن. ئەو تیۆرانەی چێنراون و ریشەیان داکوتاوە و لەکۆنەوە جێگیر بوون، کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر تەواوی خەڵك هەیە".

هارڤیش لەو کەسە هەڵەشانە نەبوو کە بەئاسانی روو بکاتە چاپخانە تا تیۆرەکانی بڵاو بکاتەوە، چونکە پێی وابوو "ئاپۆرای نووسەرانی گەمژەی پڕوپوچ هیچیان لە شەپۆلی مێش لە تافی هاویندا کەمتر نیە. ئەوانە بە بێئەقڵی و نووسینە بێنرخەکانیان و بەرهەمە بێ ناوەڕۆکەکانیان، هەڕەشەی خنکاندنمان لێدەکەن کاتێك جگەرە دەکێشین".

سەرەنجام دوای ساڵانێك لە ئەزموون و تێبینی، هارڤی بڕیاریدا ئیتر کاتی هاتووە. لە ساڵی ١٦٢٨ لە فرانکفۆرتی ئەڵمانیا نامیلکەیەکی ٧٢ لاپەڕەیی دەرچوو کە زۆر لە هەڵکەوتووانی پزیشکی بە گرنگترین کتێبی پزیشکییان دانا کە تا ئەوکاتە دانرابێ. بەتەبیعەتی حاڵ، ئەو نامیلکەیە بە زمانی لاتینی بوو، کە زمانی جیهانیی زانست بوو. ناونیشانی تەواوی بریتی بوو لە: Exercitatio Anatomica de Motu Cordis et Sanguinis in Animalibus

واتە "کۆمەڵێ راهێنانی توێکاری لەسەر جوڵەی دڵ و خوێن لە ئاژەڵاندا".

بەتەواوی نازانین لەبەرچی ئەم نامیلکەیە لە ئەڵمانیا دەرچووە، رەنگە لەبەرئەوە بووبێ بازاڕی ساڵانەی کتێب کە لە فرانکفۆرت دەکرێتەوە خێرا بڵاوبوونەوە و دەستاودەستکردنی لەنێو زانایانی کیشوەری ئەوروپادا مسۆگەر دەکات.

بەدڵنیاییەوە خەتناخۆشیی هارڤی بەرپرسە لە زۆر لەو هەڵانەی چاپ کە روویان داوە.

کردنی ئەم کتێبە "جوڵەی دڵ" بەدیاری بۆ دوو کەش کتێبەکەیان پیرۆز کرد. یەکەمیان بۆ شارلی یەکەم کە پاشا لە مەملەکەتەکەیدا لە دڵ لەنێو جەستەدا دەچێ. دووەمیشیان گوتارێك بوو ئاراستەی دکتۆر ئارجێنت راگری کۆلێژی شاهان و "باقیی پزیشك و دکتۆرە قەدر گرانەکانی" کرد. لەمەی دواییدا هارڤی بۆچوونی خۆی لەبارەی پێویستیی قبوڵکردنی راستی، بەچاوپۆشین لە سەرچاوەکەی، دەربڕیوە و ئاماژە بەوە دەکات کە راستی لە نەریتە کۆنەکان بەنرخترە. دەڵێ: "رایدەگەیەنم کە من توێکاری فێر دەبم و فێر دەکەم، نەك لە کتێبان بەڵکو لە توێکاریی کرداری، نەك لە شوێنی فەیلەسوفانەوە بەڵکو لە نەخشی سروشتەوە". هارڤی بەمەبەست و بەگیانی توێژینەوەی زانستیی نوێ دەستی بەم دەستەواژەیەوە گرتووە.

کتێبەکە لە جەوهەردا لە پێشەکیەك و حەڤدە دەروازە پێکدێت و وەسفێکی روون و یەکبین بۆ کاری دڵ و جوڵەی بازنەیی خوێن لە تەواوی جەستەدا دەکات. پێشەکیەکە تیۆرەکانی گالین و فابریکیوس و ریالدۆ کۆلۆمب و باقیی پزیشکانی کۆن دەخاتە روو و بەوردی و روونی هەڵەکانیان شی دەکاتەوە.

هارڤی لە دەروازەی یەکەمدا هەندێ لەو کێشانە باس دەکات کە لە توێژینەوەکانیدا هاتوونەتە رێگەی و دەڵێ:

"کاتێ یەکەم جار لێبڕام روو بکەمە توێکاریکردنی ئاژەڵانی زیندوو وەك رێگەیەك بۆ دۆزینەوەی جوڵە و ئەرکەکانی دڵ و هەوڵمدا ئەمە بە پشکنینی کرداری بدۆزمەوە نەك بەوەی کەسانیتر نووسیویانە، بینیم ئەو کارە زۆر قورس و پیسە بە مادەی پاشەڕۆیی و پڕ لە زەحمەتی، تا خەریك بوو وەك فراکاستۆریوس بگەمە ئەو باوەڕەی جوڵەی دڵ کەس ناتوانێ بیزانێ تەنها خوا خۆی نەبێ. سەرەتا

نەمزانی کەی گرژبوون و کەی کشـان ڕوودەدات. نـە کـەی و نـە چـۆن ڕوودەدەن، ئـەویش بـەهۆی خێرایـی جوڵانیـان کـە لـە زۆر ئاژەڵدا لـە مـاوەی چاوترووکانێکدا ڕوودەدەن. بەخێرایی بروسکە دێن و دەچن".

دواجار هارڤی گەیشتە قەناعەت کە دەکرێ بە زەحمەتیەکی کەمتر لـە جوڵـەی دڵ لە ئاژەڵە خوێنساردەکان بکۆڵرێتەوە، وەك بـۆق و مـار و ماسـیی بچـوك و قرژاڵـی دەریـا و ڕۆبیـان و قۆزاخـە و گوێچکەماسـی. بینـی لـە ئاژەڵـە خوێنسـاردەکاندا جوڵەکان "خاوتر و دەگمەنترە". هەروەها تێبینیکردنـی ئـەم دیاردانـە لـە ئاژەڵـە خوێنگەرمەکاندا ئاسانترە لەو کاتەی لە گیانداندان، لەبەرئەوەی لەو ساتەدا کـاری دڵ ڕوو لە خاوبوونەوە دەکات.

هـارڤی بـەهۆی ئەزموونەکانیـەوە تێبینـی ئـەوەی کـرد کـە گرژبـوونی دڵ پـاڵ بـە خوێنـەوە دەنـێ بـۆ دەرەوە، کـاتێکیش گـرژ دەبـێ خوێنبـەرەکان دەکشـێن بـۆ وەرگرتنی خوێن. لەبەرئەوەی دڵ ماسولکەیەکە کاری جۆرە مزەخەیەك دەکـات و خوێن ناچار دەکات لە سوڕانەوەیەکی بەردەوامدا مل بنێ. ناچارکردنی بـۆ جـوڵان لەنێو خوێنبەرەکاندا، دەبێتە هۆی دڵلێدان، "وەك کە مرۆڤ فوو بـە دەسکێشـێکدا دەکات".

بەپێچەوانەی تیۆری کۆنی هەڵکشان و داکشان (المد و الجزر) سوڕی خوێن بە یەك ئاراستە دەبێ. هارڤی ڕوونـی کـردەوە کـە خـوێن لـەڕێی خوێنبەرەکانـەوە بـەلای چەپی دڵدا دەچێ بۆ کۆتاکان، پاشان لەڕێی خوێنهێنەرەکانـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ لای ڕاستی دڵ. جوڵەی سـوڕەکە لـەڕێی بەسـتنی خوێنبـەر و خوێنهێنـەرەکان لـە چـەند خـاڵێکی جیـاوازدا زانـرا. بـەکورتی، دۆزیـەوە کـە هـەمان ئـەو خوێنـەی خوێنبەرەکان هەڵیدەگرن، خوێنهێنەرەکان دەیگێڕنەوە و سوڕێکی تـەواو دروسـت دەکەن.

هارڤی بەشێوەیەکی نایاب باسی ئەم پرۆسەیە دەکات و دەڵێ:

"ئـەم دوو جوڵەیـە، جوڵـەی هـەردوو سـکۆڵە و هـەردوو گوێچـکەڵە بـەدوای یەکـدا ڕوودەدەن بـەڵام بەشـێوەیەك کـە هاوئاهـەنگی لـەنێوان دوو جوڵەکـەدا هەیـە، بەشـێوەیەك ڕوودەدەن کـە یـەك جوڵـەیان دیـار بـێ بەتایبـەت لـە ئاژەڵـە خوێنگەرمەکاندا کە هەردوو جوڵەکە تێیاندا خێران. هـەردوو جوڵەکـە وەك ئـەوەی لـە پارچـەیەکی ئامێرێکـدا بـن ڕوودەدەن. ئەگەرچـی یـەکێك لـە ڕەوڕەوەکـانی ئەویتریان دەبزوێنێ، بەڵام هەموو ڕەوڕەوەکان وا دیارن کە لەیەك کاتدا دەجوڵێن. یـان وەك پارچـەکانی تفـەنگ، کاتێـك دەسـت بـە پەلەپیتکـەدا دەنـرێ لێدەرەکـە دادەبەزێ و لە پۆڵاکە دەدات و پریشکە ئاگرێك لەنێو بارودەکەدا دروست دەکـات و گڕ دەگرێ و کڵپە دەکات، دەرزیی هاوێژەرەکـە دێنێتـە ژوورەوە و تەقینەوەکـە ڕوودەدات و فیشەکەکە بەرەو ئامانجەکە دەنێرێ. بەهۆی خێراییی ڕوودانی هەموو ئەم جوڵانەوە، وا دیارە وەك ئەوەی لە چاوتروکانێکدا ڕوویدەن".

کـاتێ هـارڤی بـیری لـەوە کـردەوە کـە جوڵـەی خـوێن بازنەییـە، دەشـێ لـەژێر کاریگـەریی فەیلەسـوفە دێرینـەکانی وەك ئەرسـتۆدا بـووبێ کـە دەیزانـی جوڵـەی بازنەیی تەواوە و نموونەییترینی هەموو جوڵەکانە.

هەرچی زانای فەلەکناس جۆردانۆ برونۆی هاوسەردەمی هارڤییە، بـەو دەرەنجامـە گەیشـت کـە بازنـە "دروشـم و تـەرزی بنچینەیین بـۆ هـەموو ژیـان و کارەکـان لـە گەردووندا". شایانی گوتنە هـارڤی لـە بابەتەکەیـدا دەسـتەواژەی وەك "جوڵەیـەك وەك ئەوەی بازنە بێ" و "دەکرێ جوڵەی خوێن بـە بازنـەیی نـاو بنـێین"ی بـەکار هێناوە.

شێوازی هارڤی لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر سوڕی خوێن ورد بوو. بـەڵێ بەگشـتی تـا ڕادەیەکی نایاب ورد بوو، بەڵام ئەڵقەیەکی بزری تێدا بوو. ئەویش ئەوە بوو: چـۆن چۆنی خوێن لە خوێنبەرەکانەوە دەچێ بۆ خوێنهێنەرەکان؟ هارڤی دەیزانی خوێن لە لای چەپی دڵەوە دەچێ بۆ خوێنبەرەکان و لە خوێنهێنەرەکانەوە دەگەڕێتـەوە

بۆ لای راستی دڵ. لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێ "هەرگیز سەرکەوتوو نەبووم لە شوێنکەوتنی هیچ پەیوەندیەك لەنێوان خوێنبەر و خوێنهێنەرەکان بە کرانەوەی راستەوخۆ لەنێوان کونەکانیاندا".

سەرباری باوەڕی هارڤی بە پێویستیی بوونی ئەو جۆگەلانە، لەبەرئەوەی میکرۆسکۆبی لەبەردەست نەبوو نەیتوانی مولولەکان ببینێ، کە ئەو مولولە وردانەن خڕۆکەکانی خوێن پێیاندا لە خوێنبەرەکانەوە دەپەڕنەوە بۆ خوێنهێنەرەکان. چەند ساڵێك پاش مردنی هارڤی ئەو لوغزە لەلایەن مارسێلۆ مالپیجی مامۆستای توێکاری لە زانکۆی پۆلۆنیاوە کرایەوە. لەوکاتەی بە میکرۆسکۆبێکی نوێ بۆقێکی دەپشکنی، تۆڕی مولولە خوێنەکانی بینی کە خوێنبەرەکان بە خوێنهێنەرەکان دەگەیەنن، رێك وەك ئەوەی هارڤی پێشبینی کرد. بەم شێوەیە دواین هەنگاو لە سەلماندنی سوڕی خوێن تەواو بوو.

هارڤی بۆ ئەوەی بەسەر وەسواسەکانی زاڵ بێ، بەڵگەی زیاتری لەسەر سوڕی خوێن پێشکەش کرد، لەوانە بەکارهێنانی ئەوەی زانایانی سروشت بە رێگەی بڕ (طريقة الكم) ناوی دەبەن. بەڵگەی هێنایەوە لەسەر ئەوەی دڵ لە ماوەی کاتژمێرێکدا لە نزیکەی چوار هەزار لێداندا پاڵ بە ئەندازەیەك خوێنەوە دەنێ کە زیاترە لە بڕی هەموو ئەو خوێنەی لە لەشدایە. خۆ ئەگەر ئەو بڕە خوێنەی دڵ لە رۆژێکدا دەینێرێ پێوانە بکرێ، بینی بڕەکەی زۆر زیاترە لە کۆی خواردنی خوراو و هەرسکراو. بەوەیش هەڵەیی تیۆرە کۆنەکەی گالینی سەلماند. هارڤی نووسی "بەکورتی، جگە لە کردنی سوڕێك و گەڕانەوە، ناکرێ خوێن بهێنرێ".

بەڵگەیتر هەن لەسەر سوڕی خوێن کە لە کاریگەریی ژەهر لەسەر جەستەوە دیارە: "لە حاڵەتی نەخۆشییە درمەکان و لە برینە ژەهراویکەرەکان و پێوەدانی مار و گەستنی سەگی هار و زوهەری و شتی لەو شێوەیەدا، دەبینین هەموو جەستە ژەهراوی دەبێ لەکاتێکدا شوێنی بەرکەوتنەکە بەحاڵ ئازاری هەیە یان چاك

دەبێتەوە.. دیارە ئەو پەتایەی بەر شوێنێکی دیاریکراو کەوتووە، لەرێی ئەو خوێنەی بۆ دڵ دەگەڕێتەوە گوێزراوەتەوە و پاشتر لەوێوە بە هەموو بەشەکانی خوێندا بڵاو بۆتەوە.. هەروەها دەشێ هۆی ئەوەیش کە ئەو دەرمانە پزیشکیانەی لەسەر پێست بەکار دێن، هەمان کاریگەرییان دەبێ وەك ئەوەی لەرێی دەمەوە بەکار هاتبێ، بۆ هەمان شت بگەڕێتەوە".

بەکارهێنانی ئاژەڵ لەلایەن هارفیەوە بەمەبەستی تاقیکردنەوە، شتێکی نوێ بوو. باوەڕی وابوو "ئەگەر زانایانی توێکاری وەك کە لە جەستەی مرۆڤدا پسپۆڕن، لە توێکاریی ئاژەڵە بچوکەکانیشدا پسپۆڕ بوونایە، ئەو شتانەی تووشی حیرەتی کردبوون نەدەمان و گومانەکانیان دەڕەوینەوە و ئەو زەحمەتیانەی رووبەڕوویان بوونەتەوە لەناو دەچوون".

هەر بەڕاستی دەتوانرێ هارفی بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی توێکاریزانیی بەراوردکاری دابنرێ. بۆ نموونە باسی تاقیکردنەوە لەسەر مەڕ و سەگ و مامز و بەراز و باڵندە و جوجەڵە لەناو هێلکە و مار و ماسی و مارماسی و بۆق و قۆزاخەکان و رۆبیان و قرژاڵ و گوێچکەماسی و ئیسفەنج و کرم و هەنگ و زەردەواڵە و هەنگ و سمۆرە و مێش و ئەسپێ دەکات.

"تێبینیم کرد نزیکەی هەموو حەیوانەکان دڵیان هەیە نەك تەنها حەیوانە گەورە خوێندارەکاندا وەك ئەرستۆ پێی وابوو، بەڵکو لە حەیوانە بچوکە بێ خوێنەکانیشدا هەیە، وەك قرژاڵی دەریا و رۆبیان و زۆریتر. تەنانەت لە زەردەواڵە و هەنگ و مێشیشدا. ئاوێنەیەکم بەکارهێنا و دڵێکی لێدەرم لە بەشی سەرەوەی ئەوەی پێی دەوترێ کلك بینی و بەزیندوویی پیشانی کەسانیتریشمدا. لەو ئاژەڵە بێ خوێنانەدا دڵ بەخاوی لێدەدات، بەخاویش گرژ دەبێ وەك لە ئاژەڵە باڵاکان لەکاتی گیاندانیاندا. ئەمە بەئاسانی لە قۆزاخەدا دەبینرێ کە دڵ دەکەوێتە بنی ئەو فەتحەیەی دەکەوێتە لای راست، کە وا دیارە لەکاتی دەرکردنی لیکدا

دەکرێتەوە و دادەخرێ... جۆرە ماسیەکی بچوك هەیە کە وەك خواردنی قرژاڵی دەریا بەکار دێ، لە دەریا و روباری تەیمس راو دەکرێ، هەموو لەشی شەفافە. ئەو مەخلوقەم لە ئاودا دانا و چەند جارێك پیشانی هەندێ لە هاوڕێیانمدا کە چۆن دڵی بەڕوونی لێدەدات".

جگە لەم دۆزینەوە بەناوبانگانەی هارڤی، گەورەترین بەشداریکردنی لە خزمەتکردنی زانست و توێژنەوە پزیشکیەکاندا، رێگە کارگەییەکان یاخود تاقیکردنەوەکانە. بنچینەیەکی دانا کە زانستی کارئەندامزانی و پزیشکی بۆ ماوەی زیاتر لە سی ساڵ کاری لەسەر کرد. خۆی دەڵێ بڕیار "ئەوەبوو لە رێی تاقیکردنەوەوە لە نهێنیەکانی سروشت بکۆڵمەوە".

پزیشکی مێژوویەکی هەیە بۆ هەزاران ساڵ بەر لە هاتنەدنیای هارڤی دەگەڕێتەوە. پزیشکەکان فێر بوون بەوردی ئەو نەخۆشیانەی تووشی مرۆڤ دەبن بزانن و وەسف بکەن. تێبینیکردن، سەرەڕای گرنگیەکەی، بەس نیە و زۆرجار سەردەکێشێ بۆ هەندێ ئەنجامگیری کە هەموویان هەڵەن. ئەمە گەورەترین جیاوازییە لەنێوان هارڤی و پێشینانی. هارڤی تێبینیکردنی رووکەشانەی تێپەڕاند، بەکەمی بە خورافات یان رێزگرتنی تیۆرە کۆنەکانەوە وابەستە بوو، کۆمەڵێ گریمانەی دانا و بە تاقیکردنەوە پشکنینی بۆ کردن. یەکەمین کەس بوو رێگەی زانستیانەی بۆ ئەزموونکردن لەپێناو چارەسەری پرسە بایۆلۆژیەکان بەکار هێنا. هەموو ئەوانەی لە ١٦٢٨ەوە پاش ئەو هاتن رێچکەی ئەویان گرتەبەر.

ئەوەی مایەی خۆشییە قبوڵکردنی دۆزینەوەکانی هارڤییە لەلایەن هاوسەردەمەکانیەوە. کتێبەکەی بابەتێکی ئەدەبی نەبوو. رەنگە هارڤی خۆیشی دەرکی بە قووڵیی ناوەڕۆکەکەی نەکردبێ. هەندێ بەرهەڵستی لە موحافیزەکار و دەمارگیرەکانەوە پەیدا بوو. جۆن ئۆبری کە هاوسەردەمی بووە دەڵێ کە ئەو گوێی لە هارڤی بووە گوتوێتی پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی لەبارەی سوڕی

خوێن، بەجدی تاقیکردنەوە دەکات. خەڵك عەوام و کەسانی گەمژە ئەویان بە شێت دەزانی و هەموو پزیشکەکانیش دژی بوون.

سێر ویلیەم تێمپڵ هەستی کەسێکی زیرەکی ئەو سەردەمەی دەربڕیوە و لەبارەی هەردوو کتێبەکەی کۆپەرنیکۆس و هارڤیەوە دەنووسێ "ئەوە جێی مشتومڕە کە ئاخۆ ئەم دووانە دوو دۆزینەوەی نوێن یان لە بناغەگەلێکی کۆن وەرگیراون. ئایا ڕاستەقینەن یان ناڕاستەقینەن. ئەگەرچی لەوانەیە عەقڵ زیاتر لە دژەڕاکانیتر بەلایەوە خۆش بێ، بەڵام عەقڵ کەم دەیانبڕێ. بۆ ئەوەی مرۆڤ قایل بکەن دەبێ یەکبگرن، بەڵام ئەگەر ئەم دوو دۆزینەوە مەزنە ڕاستەقینە بن ئەوا هیچ گۆڕانێك نە لە ئەنجامەکانی زانستی فەلەك و نە لە کاری پزیشکیدا ناکەن. بەم شێوەیە ئەوان سوودیان بۆ جیهان کەم بوو، ئەگەرچی بوونە مایەی شەرەفێکی گەورە بۆ دانەرەکانیان".

هارڤی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ڕەخنەلێگرانی فەرامۆش کردووە، بەڵام دژایەتیی قوتابخانەی پزیشکیی زانکۆی پاریس دواجار هانیدا بێدەنگیەکەی بشکێنێ. جۆن ریۆلان مامۆستای توێکاری لە قوتابخانەی پاریس هانی کۆلێژیدا بۆ قەدەغەکردنی خوێندنی بیردۆزەکەی هارڤی. هارڤی هەوڵیدا بەرهەڵستیەکەی نەهێڵێ، هەربۆیە دوو توێژینەوەی پشتئەستوور بە بەڵگەی بنبڕی لەبارەی سوڕی خوێن بۆ ریۆلان نارد. ئەو دوو توێژینەوەیە ساڵی ١٦٤٩ لە نامیلکەیەکدا بڵاو کرانەوە، واتە بیست و یەك ساڵ پاش دەرچوونی کتێبی "جوڵەی دڵ". تێیاندا بەوردی بەرپەرچی ئەوانەی دابوویەوە کە ڕەخنەیان لە کتێبەکەی گرتبوو.

هارڤی لە توێژینەوەی دووەمیدا خەمباریی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

"لەوەتی سوڕی خوێن لەدایك بووە، کەم ڕۆژ یان سەعات تێدەپەڕن شتێکی باش یان خراپ لەبارەی ئەم دۆزینەوەیەم نەبیستم. هەندێ زەمی دەکەن و دەڵێن ئەوە لە منداڵێکی شیرەخۆری لاواز دەچێ و شایانی ئەوە نیە ڕوناکی ببینێ. هەندێکیتر

پێیان وایە ئەو منداڵە شایستەی خۆشەویستی و چاودێرییە. ئەوانە سەرسەختانە بەرهەڵستی دەکەن، ئەوانیتریش بە ئامۆژگاریکردنی زۆرەوە دەیپارێزن. یەکێك لەو دوو لایەنە پێی وایە من بە تاقیکردنەوە و تێبینیەکان و پشکنینی عەینی بەڵگەی تەواوم لەسەر سوڕی خوێن پێشکەش کردووە. لایەنەکەیتر پێی وایە من بەئەندازەی پێویست روونم نەکردۆتەوە و لە هەموو بەرهەڵستیەکان سەلامەت نەبووم. هەندێکیتر هەن دەڵێن من لەخۆباییانە شەیدابیەکی زۆرم بە توێکاریکردنی زیندەوەرەکان پیشان داوە و گاڵتە بە پێشکەشکردنی بۆق و مار و مێش و حەیوانە بچوکەکانیتر لەسەر شانۆ دەکەن.. جا بۆ ئەوەی وەڵامی قسە خراپەکان بە قسەی خراپی وەك خۆیان بدەمەوە رایدەگەیەنم کە من شایانی فەلسەفە و گەڕان بەدوای حەقیقەتدا نیم و باوەڕیشم وایە بۆ من وا باشتر و راستترە ئەگەر رووبەڕووی زۆر لەو بەرهەڵستی و نیەتە خراپانە بوومەوە، لەبەر تیشکی تێبینییە دڵنیا و راست و بنبڕەکاندا بەرەو روویان ببمەوە".

خۆشبەختانە، هارڤی نەمرد تا بەچاوی خۆی پەسەندکردنی تیۆرەکانی لەلایەن هاوشانەکانیەوە بینی. دامەزراندنی وەك راگری کۆلێژی پزیشکی لە ساڵی ١٦٥٤ سێ ساڵ بەر لە مردنی، بەڵگەیە لەسەر بڵندیی پلە و پایەی لەنێو هاوڕێ هاوپیشەکانیدا.

ئەو رستە لاتینیەی لەسەر گۆڕەکەی هارڤی نووسرابوو، بەڕوونی رای هاوسەردەمەکانی لەبارەیەوە پیشان دەدات:

"ویلیەم هارڤی، کە هەموو ئەکادیمیاکان بەرزەپێ بۆ رێزگرتن لە ناوی سەنگینی هەڵدەستن، یەکەمین کەس بوو پاش هەزاران ساڵ جوڵەی سوڕی خوێنی دۆزیەوە، بەوە تەندروستی بۆ دنیا و نەمری بۆ خۆی هێنا. ئەو تاکە کەسەی بنەچەی ئاژەڵ و وەچەکانی لە فەلسەفەی درۆزن رزگار کرد کە مرۆڤایەتی بەبەدەستهێنانی زانیاری قەرزاریەتی، پزیشکی بەبوونی خۆی قەرزاریەتی. پزیشکی یەکەم و

هاوڕێی هەردوو خاوەن شکۆ جەیمس و شارڵ؛ هەردوو پاشای دورگە بەریتانیەکان، مامۆستای چالاك و فرە سەرکەوتوو لە توێکاری و نەشتەرگەری لە زانکۆی پزیشکی لە لەندەن. لەپێناو هەردووکیاندا قوتابخانەیەکی بەناوبانگی دروست کرد و لە میراتی تایبەتی خۆی کتێبی بەنرخی بۆ دابین کرد. دواجار پاش کۆششە سەرکەوتووەکان لە تێبینی و چارەسەر و دۆزینەوەدا و پاش دروستکردنی چەندین پەیکەر لەپێناویدا، لە نیشتمانەکەی و لە دەرەوە، کاتێك سوڕی تەواوی ژیانی وەك پزیشك و مامۆستای پزیشکی تەواو کرد، بەبێ وەچە لە ۳ی حوزەیرانی ساڵی پیرۆزی ١٦٥٧ لە تەمەنی هەشتا ساڵەی پڕ لە کار و ناوبانگدا، کۆچی دوایی کرد".

ئەگەرچی بڕێکی زۆر زانیاری لەبارەی دڵ و بۆریەکانی خوێن و سیەکان کەڵەکە کراوە، بەڵام شتێکی جەوهەریی کەم خراوەتە سەر دۆزینەوەکەی هارفی، واتە سوڕی خوێن. ئێستا زۆر شت دەربارەی پێکهاتەی دڵ و ئەرکەکانی لە بواری تەندروستی و نەخۆشی و جوڵە ئاڵۆزەکانی و ئەرکەکانی خوێن دەزانرێ، کە لە سەردەمی هارفی خۆیدا بەخەیاڵیشدا نەدەهاتن.

لەگەڵ ئەوەیشدا، وەك کیلگۆر دەڵێ: "ئەوە روون و ئاشکرایە کە بەشداریی هارفی لە پزیشکی و نەشتەرگەری لە وەسفکردن نایەت. (دۆزینەوەکەی ئەو) بنچینەی هەموو کارەکانی تایبەت بە چاککردنی بۆریە لەناوچوو یان نەخۆشەکانی خوێن و چارەسەری فشاری بەرزی خوێن بە نەشتەرگەری و نەخۆشیی تاجی و پرۆسەی "شیرەخۆری شین" کە زۆر ناسراوە و هیتریشە. جگە لەوەیش، زانستی کارئەندامزانی گشتی زیاتر لە هەر شتێکیتر قەرزاری ئەوە، لەبەرئەوەی جوڵەی سوڕاوی خوێن بنچینەی زانیاریەکانی ئێستامانە لەبارەی ژینگەی ناوەوەی جەستە، کە خۆ هاوسەنگییە. ئەم شلەیە کە هارفی بە بیرتیژیی خۆی سوڕەکەی دۆزیەوە، گرنگترین رۆڵ لە دینامیکیەتی دەزگاکانی جەستەی مرۆڤدا دەگێڕێ".

ڕەنگە كەس مانای ژیانی هارڤی لە پێشكەوتنی پزیشكیدا باشتر لە پێشڕەوی پزیشكیی سەردەمەكەمان، سێر ویلیەم ئۆسلەر پوخت نەكردبێتەوە. ئەوە بوو لە ساڵیادی هارڤی و لە گوتارێكیدێ سەبارەت بە دڵ لە كۆلێژی شاهانی پزیشكان لە لەندەن گوتی ".. ئەو بە شكاندنی نەریتە كۆنەكان لەلایەن ڕۆحی نوێوە دەناسرێتەوە. ئیتر خەڵكانێك نەماون تەنیا بە تیۆری باش تاشراو و خەونی باش داڕێژراو كە دەبنە عوزرێكی گشتی بۆ نەزانی، ڕازی بن، بەڵكو لێرە بۆ یەكەمین جار پرسێكی فسیۆلۆژیی مەزن هەیە كە لایەنی پشتئەستوور بە تاقیكردنەوەی زانستیەوە كاری لەسەر دەكەین، كە پیاوێكی خاوەن عەقڵێكی زانستیانەی نوێ پێی هەستاوە، توانی بەڵگەكان بكێشێ و لێیان دوور نەكەوێتەوە، بزانیەكەی توانای ئەوە پێدا واز لە ئەنجامەكان بێنێ، تا بەشێوەیەكی سروشتی و بەتۆكمەیی پشتئەستوور بە تێبینیەكان دەریكەون. ئەو سەردەمە سەردەمی گوێگران بوو، كە تێیدا گوێیان گرت، تەنیا گوێگرتن، پاش ئەوە سەردەمی چاو هات كە تێیدا خەڵك بینییان و تەنیا بە بینین قایل بوون. پاشان سەردەمی دەست هات، دەستی بیركەرەوە و نەخشەڕێژ، دەستی كاركەر وەك ئامرازێكی عەقڵ، ئێستا جارێكیتر لە شێوەی ناميلكەیەكی سادە كە ٧٢ لاپەڕەیە پێشكەشی دنیا دەكرێتەوە. دەتوانین لێیەوە مێژووی سەرەتای پزیشكیی ئەزموونی دەست پێبكەین".



## ١٣- "بیردۆزە ماتماتیکیەکان"
## ئیسحاق نیوتن Sir Isaac Newton
### سیستمی جیهان

کتێبی "بیردۆزە ماتماتیکەکانی فەلسەفەی سروشتی" Philosophiae Naturalis Principia mathematica ی سێر ئیسحاق نیوتن ناوبانگترینی هەموو کتێبە خاوەن کاریگەریە قووڵەکان بوو لە کاروباری مرۆڤ، هەروەك هیچکام لەو کتێبانەیش هێندەی ئەم کتێبە ژمارەیەکی کەمتر خەڵك نەیانخوێندۆتەوە. لەبەرئەوەی کتێبەکەی، بەپشوودرێژیەوە، بە زمانی هونەریی لاتینی فرە ئاڵۆز نووسی و بۆ روونکردنەوەیش ژمارەیەکی زۆر شێوەی ئەندازەیی ئاڵۆزی بەکارهێناوە. هەربۆیە خوێندنەوەی لەنێو بازنەی زانایانی شارەزای گەردوون و ماتماتیك و سروشتدا قەتیس بوو.

یەکێك لە بەناوبانگترین ژیاننووسانی نیوتن دەڵێ، کاتێك لە دووا چارەکی سەدەی حەقدەیەمدا کتێبی "بنەماکانی ماتماتیك" بڵاو کرایەوە، تەنها سێ چوار کەس لە ژیاندا مابوون کە دەیانتوانی لێی تێبگەن. نووسەرێکیتر ئەم ژمارەیەی بۆ دە یان دوازدە کەس زیاد کردووە.

نیوتن خۆیشی دان بەوەدا دەنێ کە "کتێبێکی قورسە"، بەڵام هیچ بیانوویەکی باس نەکردووە کە بۆچی بەو شێوەیە دایناوە، هیچ ئاسانکاریەکیشی دانەناوە بۆ ئەوانەی لە رووی ماتماتیکیەوە نەخوێندەوارن.

سەرباری ئەمەیش، گەورە پیاوانی زانست دان بەوەدا دەنێن کە نیوتن لە گەورەترین کەسایەتییە فیکریەکانە لە تەواوی سەردەمەکەدا. لاپلاس زانای

گەردووناسی هەڵکەوتووی فەرەنسی کتێبی "تیۆرە ماتماتیکەکان" وەسف دەکات بەوەی "لەسەروو سەرجەم بەرهەمەکانی بلیمەتیی مرۆڤەوەیە". زانای ماتماتیکی بەناوبانگ لاگرانج دەڵێ "نیوتن گەورەترین بلیمەت بوو لەسەر زەوی ژیابێ". بۆڵتزمان پێشرەوی زانستە سروشتی و ماتماتیکییە نوێیەکان دەڵێ "ئەو کتێبە یەکەم و مەزنترین کتێبە لە زانستە سروشتی و ماتماتیکیەکاندا لە تەواوی جیهاندا دانرابێ".

زانای گەردووناسی ئەمەریکیی بەناوبانگ و. و. کامپڵ دەڵێ "ئەوە بەلای منەوە روونە کە سێر ئیسحاق نیوتن کە بەهەق شایستەی ئەوەیە مەزنترین پیاو بێ لە زانستە سروشتی و ماتماتیکیەکاندا لە سەرجەم سەردەمەکانی مێژوودا، پێگەیەکی تاکانەی هەیە بەوەی پێشرەوی مەزنە لە زانستە سروشتییە گەردوونیەکاندا".

نیوتن رێك سەدەیەك پاش مردنی کۆپەرنیکۆس و لە هەمان ساڵی مردنی گالیلۆدا هاتە دنیا. ئەم دوو مەزنە پیاوە و لەگەڵیاندا یۆحەنا کیپلەر بوونە ئەو بنچینەیەی نیوتن تیۆرەکانی لەسەر دامەزراند.

نیوتن جادوگەرێکی ماتماتیکی بوو لە سەردەمی زانا بەهرەدارەکانی ماتماتیکدا. وەك مارڤین دەڵێ: سەدەی حەڤدەیەم سەردەمی گەشەکردنی ماتماتیك بوو، وەك چۆن سەدەی هەژدەیەم سەدەی گەشەی کیمیا و سەدەی نۆزدەیەم سەدەی گەشەی زیندەوەرزانی بوو. چل ساڵی کۆتای سەدەی حەڤدەیەم کۆمەڵێ هەنگاوی بۆ پێشەوە نا کە لە هەر ماوەیەکیتر لە تەواوی مێژوودا زیاتر بوو". ئاخر نیوتن گەورەترین زانستە سروشتیەکانی لەخۆیدا کۆ کردبوویەوە – ماتماتیك و کیمیا و فیزیا و فەلەك– چونکە لە سەدەی حەڤدەیەمدا و بەر لە سەردەمی پسپۆڕی، زانا دەیتوانی هەموو بوارەکان بگرێتە بەر.

نیوتن کە لە رۆژی جەژنی کریسمسی ساڵی ١٦٤٢دا لەدایك بوو، لە سەرەتاکانی ژیانیدا کەوتنی حکومەتی کۆمۆنوێڵس بەسەرۆکایەتیی ئۆلیڤەر کرۆموێل و ئەو

ئـاگرە گەورەیـەی لەنـدەنی بەتـەواوی وێـران کـرد و ئـەو تاعونـەی سـێ-یـەکی دانیشتوانی شارەکەی لەناوبرد، بینی. دوای هەژدە ساڵ مانەوە لە گوندێکی بچوك بەناوی ولشۆرپ، نێردرا بۆ زانکۆی کامبرێدج و بەخت یاوەری بوو لەوێ کەوتە ژێـر ڕێنـوێنیی مامۆسـتایەکی بلیمـەت و لێهـاتوو ئـەویش ئیسـحاق بـارۆ مامۆسـتای ماتماتیك بوو، کە بە "باوکی عەقڵی"ی نیوتن ناو براوە. بارۆ بلیمـەتی لـە نیـوتنی لاودا بینی، هەربۆیە هانی ئـەو بلیمەتەیدا. کاتێـك نیـوتن هێشـتا قوتـابی بـوو لـە کۆلێژەکەدا تیۆری دوو سەرە (ذات الحدین)ی دۆزیەوە.

زانکۆی کامبرێدج ساڵی ١٦٦٥ بەهۆی تاعونەوە داخرا و نیوتن گەڕایـەوە بـۆ گونـد. مـاوەی دوو سـاڵی داهـاتوو لـە دنیـا دابڕابـوو، هەربۆیـە خـۆی بـۆ بیرکردنـەوە و تاقیکردنەوەی زانستی تـەرخان کـرد. ئـەنجامی ئـەوەیش سەرسوڕهێن بـوو. بـەر لەوەی تەمەنی بگاتە ٢٥ ساڵ سێ دۆزینـەوەی کـرد کـە پایـەیان بـەرز کـردەوە و بردیانە ریزی عەقڵە زانستییە هەڵکەوتووەکانی هەموو سەردەمەکان. یەکـەم شـت حسابی جیاکاری (التفاضل)ی دۆزیەوە کە نیوتن ناوینا Fluxions لەبەرئـەوەی دەچێتە ناو هەموو بابەتەکانی زیادکردن و جوڵەی تەنەکان و شـەپۆلدانەکان و بـۆ حەلکردنی پرسە سروشتیەکان پێویستە و مامەڵە لەتـەك هـەموو جـۆرە جوڵەیـەك دەکـات. "وا دیـارە دەرگاکـانی لای تەنیشـتی ئـەمباری گەنجینـە ماتماتیکیـەکان دەکاتەوە و جیهانی ماتماتیك دەخاتە ژێر پێکانی نیوتن و شوێنکەوتووانی".

دۆزینەوەی مەزنی دووەمی نیوتن دۆزینەوەی یاسای پێکهاتەی تیشك بوو، کە بەو پێیە دەستی کرد بە شیکردنەوەی ڕەنگـەکان و ڕونـاکیی سپی و سـەلماندی کـە تیشکی سپیی خۆر لـە هـەموو ڕەنگـەکانی پەلکـە زێڕینـە پێکدێ. کەواتـە ڕەنـگ تایبەتمەندیەکی تیشکە و دەرکەوتنی تیشکی سپی -وەك لەڕێی ئاوێزەیەکەوە بـە تاقیکردنەوە ڕوونی کردەوە- لـە تێکـەڵبوونی ڕەنگـەکانی شـەبەنگ پێکدێ. بـەو

زانیاریانەی نیوتن لـەم دۆزینـەوە بەدەسـتی هێنـان، تـوانی یەکـەمین تێلیسـکۆبی پێچەوانەکەرەوە دروست بکات کە ئەنجامی گەورەی هەبوو.

هەرچی بیرۆکەی سێیەمە شایانی سەرنجدانێکی مەزنە، ئەویش یاسای کێشـکردنی گشتییە، کـە دەوتـرێ ئـەم دۆزینـەوە زیـاتر لـە هـەر دۆزینەوەیـەکیتری تیـۆریی سـەردەمە نوێکـان، خـەیاڵی زانایـانی بزوانـدوە. بـەپێی چـیرۆکێکی بـاوەڕپێکراو، نیوتن ئەم بیرۆکەیەی لەکاتی کەوتنـەخوارەوەی سێوێك بـۆ هـاتووە و سـەری لـە دارشتنی ئەو یاسایەوە دەرچووە. شتێکی نوێ بـۆ بیرۆکـەی راکێشـانی زەوی بـۆ ئەو تەنانەی لە رووی زەویەوە نـزیکن زیـاد نـەکرابوو، بـەڵام بەشـداریی نیـوتن لـە گەنجینە زانستیەکەدا خەیاڵکردنـە مەزنەکـەی بـوو، کـە وایکـرد بـەکارهێنانی ئـەو یاسـای کێشـکردنە مـەودای جیهانیانـە وەربگـرێ: تەنـە ئاسمانیـەکان هێزێکـی کێشـکردنیان هەیـە کـە لـە هێـزی کێشـکردنی زەوی کـەمتر نیـە. پاشـان بەڵگـەی ماتماتیکی بۆ بیردۆزەکەی خستە روو.

سەیر لەوەدایە نیوتن هیچکام لەم سێ دۆزینەوە هەرە گرنگانەی، واتـە: جیاکـاری و رەنگەکان و کێشکردن، بڵاو نـەکردەوە. ئـەو لەکاتێکدا بەتەبیعـەت حـەزی لـە شاردنەوەی نهێنیەکانی و پارێزگاریکردن لە زانیاریەکانی لە سینگی خۆیدا هەبوو، هاوکات رقی لە تێبینـی و چەنەچـەنەکانی جـەماوەر بـوو. هەربۆیـە حـەزی لێبـوو ئەنجامی ئەزموونەکانی بشارێتەوە. هەموو ئەوەیش پاشتر بـڵاوی کردنـەوە لـەژێر فشاری هاوڕێکانیدا بوو، دواتر پەشیمان بوو لەوە ملکەچی داوا و تکاکانیان بووە، چونکە بەهۆی بڵاوکردنەوەکەوە هاوڕێ زاناکانی کەوتنە مشتومڕ و رەخنەگرتن لـە کارەکانی. ئەمەیش ئەو شتە بوو نیوتن بـەهۆی سروشـتە هەسـتیارەکەیەوە رقـی لێی بوو.

دوای ئـەو گۆشـەگیریە ناچـاری و بەتاڵیـەی بـەهۆی سـاڵانی بڵاوبوونـەوەی تاعونەکەوە بەسەر نیوتندا هاتبوو، گەڕایەوە کامبرێدج و پلەی ئوستادی بەدەست

هێنـا و لـە كۆلێـژی ترینیتـی Trinity دامـەزرا. ماوەیـەكی كـورت پـاش ئـەوە مامۆستای پێشووی، بارۆ خانەنشین بوو و نیوتن كە لـە تەمـەنی بیسـت و حـەوت سـاڵیدا بـوو، بـوو بـە ئوسـتادی ماتماتیـك، كـە نیـوتن مـاوەی ٢٧ سـاڵی دواتـر پارێزگاری لەو پێگەیە كرد. لە دە یان بیست ساڵی یەكەمدا شتێكی كـەم لـەبارەی نیوتنەوە بیستراوە. ئەوە زانراوە ئەو لە توێژینـەوەكانی لـەبارەی تیشـك (ضـوء) بەردەوام بووە و بابەتێكی دەربـارەی دۆزینەوەیـەكی لـەبارەی سروشـتی ئـاڵۆزی تیشـكی سـپی بـڵاو كردۆتـەوە. راسـتەوخۆ دوای ئەمـە كەوتۆتـە دەمەتـەقێ و مشتومڕ. یەكەم شت لەبەرئەوەی تیۆرەكانی لەبارەی تیشك لەگەڵ ئـەو تیۆرانـەی ئەوكاتە باو بوون ناكۆك بوون، دووەم لەبەرئەوەی بابەتەكەی راستیەكی لـەبارەی فەلسەفەی ئەو بۆ زانستە سروشتیەكان لـەخۆ گرتبـوو. لـەو بابەتـەدا جـەختی لـە بۆچوونی خۆی كردبـوو كـە ئـەركی سـەرەكیی زانسـتە سروشـتیەكان ئەنجامـدانی تاقیكردنـــەوەی بـــەوردی رێكخـــراو و تۆمـــاركردنی تێبینیەكانـــە لەســـەر ئـــەم تاقیكردنەوانـە، پاشـان دارشـتنی ئـەو یاسـا ماتماتیكیانـەی لەسـەر ئەنجامـەكان دادەمەزرێن. وەك نیوتن دەڵێ "رێگەی نموونەیی بۆ زانینی تایبەتمەندیی شتەكان ئەوەیە لە ئەزموونەكان ئەنجامگیری بكرێن".

سەرەڕای تەواو كۆكبوونی ئـەم تیـۆرە لەگـەڵ توێژینـەوە زانسـتییە نوێكانـدا، لـە سـەردەمی نیوتنـدا بـەهیچ شـێوەیەك قـابیلی قبـوڵكردن نـەبوو، لەبەرئـەوەی بیروبـاوەڕی دامـەزراو لەســەر خـەیاڵ و عـەقڵ و رواڵـەتی شـتەكانیان، كـە لـە فەیلەسوفە كۆنەكانەوە مابوویەوە، لەو بەڵگانە پێ باشتر كە زادەی بەڵگە بوون.

نیوتن بە هێرشـی زانـا بەناوبانگـەكان بـۆ سـەر بابەتەكـەی تـووڕە بـوو بەتایبـەت هـۆیجێنز و هـوك و بڕیاریـدا لـە ئاینـدەدا خـۆی لـەو رقـە لابـدا بـەوەی هـیچ بـڵاو نەكاتـەوە. گـوتی "لەئـەنجامی ئـەو مشـتومڕانەی لـە بڵاوكردنـەوەی تیۆرەكـەم سەبارەت بە تیشك هاتە كایە چەوسێنرامەوە، بەشێوەیەك لۆمـەی دانـایی خـۆمم

کرد لە راگەیاندنی ئەم نیعمەتە مەزنە وەك ئەوەی بەدوای سێبەردا بگەڕێم".
هەروەك ئاماژەی بەوەدا کە ئەو چێژ و تامەزرۆییەی پێشووی بۆ خودی زانستەکانیش نەماوە.
ساڵی ١٦٨٤ پیکارد ژمێرکاریەکی وردی کرد بۆ زانینی درێژی چێوەی گۆی زەوی بەوردی بۆ یەکەمین جار.
نیوتن ئەو زانیاریانەی ئەو فەلەکناسە فەرەنسییە پێی گەیشتبوو، لەگەڵ تیۆری کێشکردن بەکار هێنا بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو هێزەی مانگ بەدەوری زەوی و ئەستێرەکان بەدەوری خۆردا دەسوڕێنێتەوە، بریتییە لە هێزی کێشکردن. ئەم هێزە راستەوانە دەگونجێ لەتەك بارستەی تەنە هاوسێکان، پێچەوانەیش دەگونجێ لەتەك دووجای دووریی نێوانیان. لێرەوە نیوتن پاش ئەوە هەوڵیدەدا ئەوە بسەلمێنێ کە ئەمەیە وادەکات خولگەی هاسارەکان شێوە هێلکەیی بێ، چونکە هێزی توندیی ئەم کێشکردنەیە پارێزگاری لە سوڕانەوەی مانگ و هەسارەکان لە خولگەکانیان و هێزی دوورخەرەوەی ناوەندیی جوڵەکانیان هاوسەنگ دەکات.
بۆ دووەم جار نیوتن شکستی هێنا لە بەڵگەهێنانەوە لەسەر دۆزینەوەی دیاردەی گەورەترین نهێنیی سروشت. وا رێکەوت هەندێ زانایتریش بە دوای چارەسەری هەمان پرسەوە سەرقاڵی توێژینەوە بوون. زۆر لە زانایانی فەلەکناس رایان وابوو هەسارەکان بەهێزی کێشکردن بەخۆرەوە دەبەسترێنەوە. یەکێك لەوانە رۆبێرت هوك بوو، کە یەکێك لە رەخنەگرە سەرسەختەکان بوو لە نیوتن. بەڵام هیچکام لەوانە نەیتوانی بەڵگەیەکی ماتماتیکی پێشکەش بکات. لەو سەروەختەدا نیوتن وەك زانایەکی ماتماتیك ناوبانگێکی زۆری پەیدا کردبوو و زانای فەلەکناس ئێدمۆند هالی لە کامبرێدج سەردانی کرد و داوای یارمەتی لێکرد. کاتێك هالی باسی کێشەکەی کرد، زانی نیوتن دوو ساڵ لەوەوبەر چارەسەری کردووە. زیاد

لەوەیش، نیوتن یاسا بنچینەییەکانی جوڵەی تەنە جوڵاوەکانی خستە ژێر هێزی کێشکردن. بەتەبیعەتی حاڵ، نیوتن نەیدەویست دۆزینەوەکانی ئاشکرا بکات.

هالی یەکسەر هەستی بە گرنگیی دۆزینەوەکانی نیوتن کرد، هەربۆیە هەموو توانای هاندانی خۆی خستەگەڕ تا نیوتن قایل بکات بەوەی پێویستە دۆزینەوەکەی ئاشکرا بکات و کەڵکی لێوەربگیرێ. دڵگەرمیەکەی هالی کاری لە نیوتن کرد و بەهۆی گەرمبوونەوەی خۆیشی، دەستی کرد بە نووسینی نایابترین دانراوەکانی بەناونیشانی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" کە لانجەر بە "گەنجینەیەکی راستەقینەی فەلسەفەی ماتماتیك و مەزنترین دانراوی ناسك کە عەقڵی بەشەری بەرهەمی هێناوە" وەسفی کردووە.

شتی سەیر لە کتێبی "تیۆرە ماتماتیکیەکان"دا، کە هیچی لە گرنگیی ئەوانیتر کەمتر نیە، ئەوەیە هەژدە مانگ خەریکی دانانی بووە. نیوتن بەرادەیەك پێوەی سەرقاڵ بووبوو زۆرجار نانخواردنی لەبیر دەچوو و زۆر بەکەمیش دەخەوت. دەرکردنی ئەم کارە زەینییە گەورەیە لە ماوەیەکی کورتدا بەبێ چڕکردنێکی سەرەمڕ و بەهێز نەبێ نایەتەدی. راستیەکەی ئەو کارە نیوتنی لەڕووی زەینی و جەستەییەوە شەکەت کرد.

زیاد لەوەیش نیوتن لەکاتی دانانی ئەو کتێبەدا هەستی بە ئاسوودەیی نەدەکرد، بەڵکو ئەو دەمەدەمە بەردەوامانە بێزاریان دەکرد بەتایبەت لەلایەن هوکەوە کە سوور بوو لەسەر ئەوەی شەرەفی دۆزینەوەی تیۆری دووجاکردنی پێچەوانە (التربيع العكسي)ی کێشکردن لە جوڵەی هەسارەکان بەو ببڕێ. نیوتن لەو کاتەدا دوو لەسەر سێی کتێبەکەی تەواو کردبوو، ئەو لاقلێدانانە نادادپەروەرانەیە بەرادەیەك تووڕەی کرد کە هەڕەشەی کرد بەشی سێیەم هەڵبوەشێنێتەوە کە گرنگترینیانە. لێرەدا هالی هاتە سەر خەت، هەژموونی خۆی بەکار هێنا و پێداگری کرد کە نیوتن بەو شێوەیەی بەرنامەی بۆ داناوە کتێبەکەی تەواو بکات.

ئێدموند هالی ڕۆڵێکی لە مێژووی کتێبی تیۆرە ماتماتیکیەکاندا هەیە کە شایستەی گەورەترین ڕێزە، نەك هەر لەبەرئەوەی ئەو لە هاندانی نیوتن بۆ هەستان بەو کارە بەرپرسە، بەڵکو لەبەرئەوەی ڕەزامەندیی کۆمەڵەی شاهانە بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبەکە بەدەست هێناوە. باسی هەموو ئەوەی لە سەرپەرشتیکردنی کۆتایی بۆ دەرچوونی کتێبەکەیش لە چاپخانە کردوویەتی، نەکردووە. کاتێکیش کۆمەڵەی شاهانە گفتەکەی بۆ گرتنەئەستۆی خەرجی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە نەبردە سەر، هالی، سەرباری ئەوەی باری ئابووری مامناوەند بوو و بەخێوکردنی خێزانێکی لەئەستۆ بوو، لە باخەڵی خۆی تەواوی خەرجیەکانی دایەوە.

دوای ئەوەی ئەو کتێبە هەموو بەربەستەکانی بڕی،ساڵی ١٦٨٧ بە قەبارەیەکی بچوك لە چاپخانە دەرچوو و دانەی بە دە یان دوازدە شلن دەفرۆشرا. لە لاپەڕەی تایبەت بە ناونیشانی کتێبەکە و ناوی دانەرەکەی، ناوی سامۆیل پێپیز سەرۆکی کۆمەڵەی شاهانە دەرکەوت کە ئەو خاوەن ئیمتیازی چاپکردنی ئەو کتێبەیە، ئەگەرچی، وەك ڕەخنەگرێك دەڵێ، گومان هەیە لەوەی "لە یەك تاکە ڕستەی تێبگات".

ئامادەکردنی هەر پوختەیەکی ئەو کتێبە بە زمانێکی سادە، ئەگەر مەحاڵ نەبێ، ئاستەمە. بەڵام دەکرێ هەندێ روون بکرێتەوە. نووسەر بەگشتی باسی جوڵەی تەنەکان دەکات لەڕووی ماتماتیکیەوە، بەتایبەت لە رووی داینەمیکی و کێشکردنی گشتیی کۆمەڵەی خۆرەوە. بە شەرحکردنی ژمێرکاریەکانی جیاکاری کە نیوتن دایهێنا و لە سەرجەم ژمێرکاریەکانی ئەو کتێبەدا بەکاری هێنا، دەست پێدەکات. پاش ئەوە دێتە سەر پێناسەی مانای فەزا و زەمەن و روونکردنەوەی یاساکانی جوڵە وەك نیوتن دایڕشتبوو، لەگەڵ کۆمەڵێ وێنە بۆ روونکردنەوەی بەکارهێنانیان. بیردۆزە بنچینەییەکە دەڵێ: هەر گەردیلەیەکی ماددە لەلایەن گەردیلەیەکیتری ماددەوە کێش دەکرێ بەهێزێك، کە پێچەوانە

دەگونجێ لەتەك دووجای دووریی نێوان هەر گەردیلەیەك و گەردیلەیەکتر. هەروەها ئەو یاسایە روون دەکاتەوە کە ئەو تەنانەی بەیەکتر دەگەن ملکەچین. هەموو شتێکیشی هاوپێچ لەگەڵ وێنەگەلی ئەندازەیی کلاسیکی شەرح و روون کردۆتەوە.

بەشی یەکەمی کتێبی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" باس لە جوڵەی تەنەکان دەکات لە فەزای کراوەدا. بەشی دووەمیش باسی جوڵە دەکات لە "ناوەندێکی بەرەنگاریکار"ی وەك ئاودا. نیوتن مەسەلەکانی جوڵەی شلە و رێگەکانی شیبوونەوەی لەبەرچاو گرتووە. هەروەها بەشێوەیەکی ماتماتیکی کۆمەڵێ رێگەی بۆ مەزەندەکردنی خێرایی دەنگ و جوڵەی شەپۆلەکان تاوتوێ کردووە. لێرەدا بنچینەی زانستی نوێی شتە سروشتییە ماتماتیەکیەکان و ئیدرۆستاتیکا و ئیدرۆداینەمیکای دانا.

نیوتن لە بەشی دووەمدا ئەو سیستەمە گەردوونییەی بەتەواوی تێکشکاند کە دیکارت داینا و ئەوکاتە باو بوو. بەگوێرەی تیۆرەکەی دیکارت، تەنە ئاسمانیەکان بەپێی جوڵەیەکی گێژاوی (دوامی) دەجوڵێن. بەپێی ئەو تیۆرە، هەموو فەزا پڕە لە مادەیەکی تواوە (مائع) کە گێژاو لە چەند خاڵێکی دیاریکراو دروست دەکات. بۆ نموونە کۆمەڵەی خۆر لە چواردە گێژاو (دوامة) پێکدێ گەورەترینیان خۆری تێدایە. هەرچی هەسارەکانن هەموویان وەك سوڕانەوەی کاغەزەکان بەدەم گێژاوی گێژەڵوکە لولپێچەکانەوە دەسوڕێنەوە. دیکارت دیاردەی کێشکردنی بەم گێژاوانە تەفسیر دەکرد، بەڵام کە نیوتن هات دەستی بەبەڵگەهێنانەوە کرد بە پشتبەستن بە ئەزموون و کرداری ماتماتیکی، بەوە سەلماندی "تیۆری گێژاوەکان بەتەواوی لەگەڵ راستییە گەردوونیەکاندا ناکۆکە، لەبەرئەوە زۆر دوورە لەوەی تەفسیری جوڵەی تەنە ئاسمانیەکانی پێ بکرێ".

لە بەشی سێیەمدا بەناونیشانی "سیستمی گەردوون" نیوتن دەماخی بەتەواوی بۆ وردکردنەوەی ئەنجامە فەلەکیەکانی یاسای کێشکردن سووتاندوە و دەنووسێ:

"لە دوو بەشی رابردوودا تیۆرەکانی فەلسەفە (زانستەکان)م دانا، ئەو تیۆراوانە ماتماتیکین نەك فەلسەفی.. ئەو تیۆرانە یاساگەل و مەرجی هەندێ جولەی دیاریکراو یان کۆمەڵێ توانا یاخود هێزن.. لێرە و لەوێ شەرحم کردوون... بەپێی هەندێ شتی خاوەن سروشتی گشتی... وەك چڕی و بەرەنگاریی تەنەکان و فەزای بەتاڵ لە هەموو تەنەکان و جولەی روناکی و دەنگ. ماوەتەوە پەیکەری سیستمی گەردوون شەرح بکەم".

نیوتن هۆی نەکردنی بە کتێبێکی جەماوەری باس دەکات و دەڵێ:

"لەڕاستیدا من بەشی سێیەمی ئەم کتێبەم بەشێوەیەکی میللی داناوە تا زۆر کەس بیخوێننەوە، بەڵام کاتێك بینیم ئەوانەی بەئەندازەی پێویست دیراسەی ئەو تیۆرانەیان نەکردووە ناتوانن بەئاسانی دەرك بە هێزی ئەنجامەکان بکەن، هەروەك دەستبەرداری ئەو بیروباوەڕ و دەمارگیرییانە نابن کە چەندین ساڵە خوویان پێوە گرتووە. لەبەرئەوە، بۆ خۆلادان لەو مرخێش مرخێشانەی لەوانەیە لێی بکەونەوە، بڕیارمدا مادەی ئەم کتێبە لە شێوەی بیرۆکە (بە رێگەی ماتماتیکی)دا کورت بکەمەوە، کە تەنها ئەوانە بیخوێننەوە لەو تیۆرانەی لە دوو بەشەکەی پێشوودان حاڵی بوون، چونکە کاتێکی زۆری ناوێ تەنانەت بۆ ئەوانەیش کە بەدواداچوونیان لە بواری ماتماتیکدا باشە".

لەبەرئەوەیە، شێوازی کتێبی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" بە "زۆر قورس و نووسراو بە شێوازێکی زۆر ئاڵۆز کە جگە لە کامینێکی باڵا کەس پەنای بۆ نابات" وەسف کراوە.

نیوتن لەم بەشەدا قسەکانی بە باسکردنی راستیەکی بنچینەیی دەست پێدەکات کە تەواو لە تیۆرەکانی رابردوو جیاوازە. ئەویش ئەوەیە جیاوازی لەنێوان دیاردە زەمینی و دیاردە ئاسمانیەکاندا نیە و جەخت لەوە دەکات، ئاسەواری هاوشێوە لە سروشتدا لە هۆی هاوشێوە دەکەوێتەوە. بۆ نموونە هەناسەدان لە مرۆڤ و حەیواندا. کەوتنی بەرد لە ئەورووپا و ئەمەریکا، تیشکی ئاگری مۆبەق و تیشکی خۆر، پێچەوانەبوونەوەی تیشك لەسەر زەوی و لەسەر هەسارەکانیتر. بەوەیش ئەو بیروباوەڕەی پوچ کردەوە کە دەڵێ جیهانەکانیتر تەواون و تەنها زەوییە کە ناتەواوە. بەڵام نیوتن سەلماندی هەمووان ملکەچی هەمان یاساگەلی ماقووڵن.

تەنها ئامادەکردنی لیستێك بەو بابەتانەی لە بەشی سێیەمدا باس کراون کارێکی بەڕاستی سەرسوڕهێنە. بەشێوەیەکی گومانبڕ جوڵەی هەسارەکان و جوڵەی پاشکۆکانیانی بەدەوریاندا سەلماند. رێگەکانی پێوانەکردنی بارستەکانی خۆر و هەسارەکانی روون کردەوە. هەروەها بابەتەکانی چڕیی زەوی و پێشوازیکردنی هەردوو وەرزە فێنکەکەی بەهار و پایز وتیۆری هەڵکشان و داکشانی دەریا و خولگەی کلکدارەکان و جوڵەی مانگ و هەموو بابەتەکانی پەیوەست بەمانەی باس و تەفسیر کردووە.

نیوتن لەڕێی تیۆری "شلۆقیەکان"ەوە سەلماندی زەوی و خۆر مانگ کێش دەکەن، بەوەیش مانگ بەو کێشکردنەی خۆر شلۆق دەبێ ئەگەرچی کێشکردنی زەوی بۆی لە کێشکردنی خۆر بەهێزترە. هەروەها هەسارەکانیتریش ئەگەری شلۆقبوونیان لێ دەکرێ. خۆریش چەقی جێگیری گەردوون نیە، بەپێچەوانەی بیروباوەڕە پێشووەکان، بەڵکو وەك چۆن ئەو هەسارەکان کێش دەکات هەسارەکانیش ئەو کێش دەکەن و بەهەمان شێوە

دەجولێ. لە سەدەکانی پاشتردا تیۆری شلۆقیەکان بووە مایەی دۆزینەوەی هەردوو هەسارەی نیپتۆن و پلۆتۆ.

نیوتن ئەندازەی بارستەی هەسارەکان و بارستەی خۆری بەبەراورد بە بارستەی زەوی دۆزیەوە. چڕیی زەوی لەنێوان پێنج تا شەش هێندەی چڕیی ئاو مەزەندە کرد (ئەو چڕیەی ئەمڕۆ زانایانی سروشت بەکاری دێنن بریتییە لە ٥.٥). لەسەر ئەم بناغەیە نیوتن بارستەکانی خۆر و هەسارەکان و پاشکۆکانیانی حسێب کرد، کە ئادەم سمیث ئەوە بە کارێك "لەسەروو مەودای عەقڵ و کاری مرۆڤەوە" وەسف دەکات.

دوای ئەوە ئەو راستیە دێ کە دەڵێ زەوی گۆیەکی تەواو خڕ نیە، بەڵکو بەهۆی سوڕانەوەوە لە هەردوو جەمسەرەکەیدا تەختە. نیوتن ئەمەی شەرح کرد و ئەندازەی تەختیەکەی حسێب کرد. نیوتن لە روانگەی تەختبوونی زەوی لە هەردوو جەمسەرەکەوە و خواربوونەوەی لای هێڵی کەمەرەیی، گەیشتە ئەو دەرەنجامەی هێزی کێشکردن دەبێ لە هەردوو جەمسەرەکە کەمتر بێ لە هێڵی کەمەرەیی. ئەمەیش تەفسیری "پێشوازیکردن"ی دوو وەرزە فێنکەکە و جوڵەی قووچەکیی تەوەری زەوی دەکات. بەلێکۆڵینەوە لە شێوەی هەسارەکە توانرا درێژیی شەو و رۆژ لەسەر ئەو هەسارەیە مەزەندە بکرێ.

نیوتن لە گەڕانی بەدوای هۆکانی هەڵکشان و داکشان (المد و الجزر)دا یاسای کێشکردنی گەردوونی بەکار هێنا. کاتێك مانگ پڕ بێ ئەوپەڕی کێشکردن دەکەوێتە سەر ئاوی سەرزەوی و هەڵکشان روودەدات. هەروەها خۆر کار لە هەڵکشان و داکشان دەکات. کاتێك خۆر و مانگ لەسەر یەك هێڵ بن، هەڵکشان دەگاتە لوتکە.

بابەتێکیتریش هەیە کە جێی بایەخی هەموانە و نیوتنیش تیشکی خستۆتە سەر، ئەویش بابەتی کلکدارەکانە. تیۆرەکەی ئەوە بوو کلکدارەکان کاتێك

لەژێر کێشکردنی زەویدا دەچن، ڕێڕەوگەلێکی هێلکەیی خاوەن مەودای زۆر دوور دەگرنەبەر کە برینی ساڵانێکی دەوێ. لەبەرئەوە کلکدارەکان کە خورافاتەکان بە نیشانەی شوومیان دەزانی، وەك دیاردەیەکی ئاسمانی جوان و بێ زیان جێگەی راستی خۆیان دەگرن. ئێدموند هالی بەبەکارهێنانی تیۆرەکانی نیوتن لەبارەی کلکدارەکان، توانی کلکداری ناسراو بەناوی "کلکداری هالی" بناسێتەوە و پێشبینیی دەرکەوتنەوەی هەر ٧٥ ساڵ جارێك بکات. بە بینینی هەر کلکدارێك دەتوانرێ بەوردی ڕێڕەوی لە ئایندەدا دیاری بکرێ.

یەکێك لە دۆزینەوە مەزن و سەرسوڕهێنەکانی نیوتن ڕێگەی مەزەندەکردنی دووریی ئەستێرەیەکی جێگیرە، کە پشت بە بڕی ئەو تیشکە دەبەستێ کە دەکرێ بە پێچەوانەبوونەوەی تیشکی خۆر لە هەسارەیەکەوە، دەست بکەوێ. کتێبی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" هیچ هەوڵێکی بۆ شەرحکردنی هۆکەی پیشان نەداوە بەڵکو تەنیا چۆنێتیی گەردوونیەکەی شەرح کردووە. دوای ئەوە نیوتن ئەو تۆمەتانە ڕەت دەکاتەوە کە ڕێگەکەی ڕێگەیەکی میکانیکیی رووت بێ و بەهیچ شێوەیەك هۆکانی نەدابێتە پاڵ بەدیهێنی مەزن (واتە خوا)، هەربۆیە لە چاپی دووەمدا دانپێدانان و باوەڕی بە بەدیهێن زیاد کردووە. دەنووسێ:

"هاتنەکایەی ئەم سیستەمە قەشەنگەی خۆر و هەسارە و کلکدارەکان بەبێ ڕێنمایی و سەروەریی بونەوەرێکی فرە زیرەك و بەهێز ناکرێ... وەك چۆن مرۆڤی کوێر هیچ بیرۆکەیەکی لەبارەی ڕەنگەکانەوە نیە، بەهەمان شێوە هیچ بیرۆکەیەکمان نیە لەبارەی ئەوەی خوای دانا چۆن چۆنی هەموو شتەکان دەبینێ و لێیان دەگات".

نیوتن باوەڕی وابوو ئەرکی زانستەکان بنیاتنانی زانیاری و بڕەوپێدانیەتی، چەندەیش زانیاریەکانمان تەواوتر بێ زیاتر لە تێگەیشتنی هۆکە نزیك

دەبینــەوە، ئەگەرچـی لەوانەیـە مـرۆڤ هــەرگیز یاسـا زانسـتییە راسـتەقینە سروشتیەکان نەدۆزێتەوە.

کتێبی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" زادەی زیرەکێکی بێوێنەیە، لەبەرئەوە ئەوانـەی بە نیوتن سەرسـامن و بـۆی دڵگـەرمن، جـەخت لـەوە دەکـەن کـە لـە بۆشـاییدا نەینووسیوە. وەك کۆهین دەڵێ: "تیـۆرە مەزنـەکانی نیـوتن لەسـەر کارەکـانی ئەوانەی پێش خۆی بنیـات نـراوە. ئەنـدازەی شـیکاری لـە داهێنـانی دیکـارت و فۆرما، جەبر لە داهێنانی ئۆگترێد و هاریۆت و والیس، یاسای جوڵە لە داهێنانی کیپلـەر و یاسـای تەنـە داخزاوەکـان لـە داهێنـانی گـالیلۆ. هـەروەها یاسـای پێکهاتنی خێراییەکانی گالیلۆی بەرهەم هێنا، کە یاسایەکە دەڵـێ دەکـرێ هـەر جوڵەیــەك بــۆ پێکهێنــەرەکانی شــی بکرێتــەوە، کــە هەریەکــەیان لــەویتر سەربەخۆیە.. ئەمە کەمێکە لەو بابەتە زۆرانـەی چـاوەڕوانی تیـۆرە مەزنـەکانی نیوتنیان دەکرد. بەڵام دەبوو بلیمەتیی نیـوتن دوایـن پێداچـوونەوەی مـەزنیان بۆ بکات، تا لە کۆتاییـدا و بـۆ دوایـن جـار بیسـەلمێنێ کـە سیسـتمی گـەردوون چۆن چۆنی بەگوێرەیی یاسایەکی ماتماتیکی بەڕێوە دەچێ".

وەك جان دەڵێ، جیهان پێویستی بـە پیـاوێك هەیـە بتـوانێ تیـۆر زیـاد بکـات، ئەنجامگیریی تیـۆر بکـات و تیـۆر درێـژ بکـات، ئـەو پیـاوەیش زۆر بـەنایابی لـە کەسایەتیی نیوتندا دەرکەوت.

نیـوتن خـۆی دان بـەوەدا دەنـێ کـە "سیسـتمەکەی بـۆ جیهـان"، زانسـتی میکانیکای گەردوون لەسەر بنچینەی ئـەو کارانـە دامـەزراوە کـە کۆپـەرنیکۆس دەستی پێ کرد و هەریەك لە تیکۆ براهی و کیپلەر و گالیلۆ لێیانەوە وەرگرت. نیوتن دەڵی "ئەگەر من دوورتر لـە پیـاوانیترم بینیـوە، ئـەوە لەبەرئەوەیـە مـن لەسەر شانی هەرە مەزنەکان وەستاوم".

لەڕاستیدا دەشێ هۆی ئەو بەرهەڵستی و مشتومڕانەی ژیانی نیوتنیان پڕ کردووە، مەیینی زەینیی باوی سەردەمەکەی بێ. کەشەکە پڕ بوو لەو تیۆرە نوێیانەی ژمارەیەکی زۆر لە زانا بەتواناکان پشکنینیان بۆ کردوون. بۆیە سەیر نیە نزیکەی لە هەمان کاتدا دوو پیاو بەجیا لەیەکتر دوو دۆزینەوە بدۆزنەوە. پێدەچێ ئەمە ڕێك لە هەردوو دۆزینەوە سەرەکیەکانی نیوتندا رووی دابێ کە لیبنز و هوك دۆزیانەوە. لیبنز حسابی جیاکاری و هوك گۆڕانکاری لە تیۆری کێشکردنی زەویدا کرد ماوەیەك دوای ئەوەی نیوتن دۆزینیەوە. بەڵام ئەوان بەر لە نیوتن، کە بڵاوکردنی کتێبەکەی پشتگوێ خست، بە جیهانیان ڕاگەیاند.
هاوسەردەمانی نیوتن لە ئینگلتەرا و ئیسکوتلەندا گەرمتر لە خەڵکی کیشوەری ئەوروپا پێشوازییان لە کتێبەکەی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" کرد، بەڵام پێشوازیکردنی لە هەموو شوێنێك لەسەرخۆ بوو. وەك نیوتن پێشبینی کرد، تێگەیشتن لە کتێبەکە پێویستی بە توانایەکی ماتماتیکیی گەورە هەبوو، بەڵام شێوازی بێوێنەی پێشکەشکردنی وای لە خەڵك کرد، تەنانەت ئەوانەیش بیرۆکەیەکی سادەیان دەربارەی کتێبەکە هەبوو، رووی تێ بکەن. وردە وردە زانایان، لە هەموو شوێنێك، تیۆرەکانی نیوتنیان پەسەند کرد. لە سەدەی هەژدەیەمدا لە دنیای زانستدا دانیان پێدانا.
پێدەچێ نیوتن دوای نووسینی "تیۆرە ماتماتیکیەکان" چیتر چێژێکی ئەوتۆی لە توێژینەوە زانستیەکان نەبینیبێ، ئەگەرچی چل ساڵ پاش بڵاوکردنەوەی ژیا و لەو ماوەیەدا چەندین ڕێزلێنانی بینی: ئەوە بوو کرا بە بەڕێوەبەری خانەی سکە و شاژن ئان Anne نازناوی (سوار)ی پێبەخشی. ساڵی ۱۷۰۳ بە سەرۆکی کۆمەڵەی شاهانە هاتە هەڵبژاردن تا مردنی لە ساڵی ۱۷۲۷ و بڵاوبوونەوەی چاپی دووەم و سێیەمی کتێبەکەی بینی. بەگشتی ئەوپەڕی ڕێز و شکۆی لێنرا.

دۆزینەوە زانستیەكانی سەدەی بیستەم گۆڕانكاری لە تیۆرەكانی نیوتندا كرد یان نەگونجاویی هەندێكیانی دەرخست، بەتایبەت لە بواری فەلەكناسیدا. بۆ نموونە تیۆری گوێرەیی-ی ئەنیشتاین جەخت لەوە دەكات كە فەزا و زەمەن رەها نین وەك نیوتن وای دەزانی. بەگشتی، وەك هەندێ لە كەسانی جێمتمانە و پیاوی مەیدانی زانست و تەكنەلۆژیا باسی دەكەن، پێكهاتەی باڵەخانەیەكی هەوربڕ، ئاسایشی پردی هێڵێكی ئاسنین و جوڵەی ئۆتۆمبێلێك و فرینی فڕۆكەیەك و مەلەی كەشتیەك لە ئۆقیانووس و پێوانەكردنی زەمەن و شتی لەو جۆرانەی شارستانێتیی هاوچەرخمان، هێشتا لە بناغەدا لەسەر یاساكانی نیوتن دەوەستن. وەك سێر جەیمس جۆنز دەڵێ "تیۆرەكانی نیوتن نەك هەر لە بواری پێشخستنە مەزنەكانی بۆ زاستە نوێكان گونجاون، بگرە بابای فەلەكناس كاتێك دەیەوێ ساڵنامە دەریاوانیەكەی (ملاحی) ئامادە بكات یان جوڵەی هەسارەكان گەنگەشە بكات، خەریكە بڵێین هەر تیۆرەكانی نیوتن بەكار دێنێ. ئەو ئەندازیارەی دەیەوێ پردێك یان كەشتیەك دروست بكات یان ئۆتۆمبێلێك دیزاین بكات، رێك هەمان ئەوە دەكات كە لە حاڵەتێكدا دەیكرد كە تیۆرەكانی نیوتن نەگونجاوی نەسەلماندایە. هەمان شت بۆ ئەندازیارێكی كارەباییش راستە جا چ تەلیفۆنێك چاك بكاتەوە یان وێستگەیەكی بەرهەمهێنانی كارەبا دیزاین بكات. هێشتا زانستە بەكارهێنراوەكانی ژیانی رۆژانەمان لەسەر یاساكانی نیوتن دامەزراون. مەحاڵە بزانرێ ئەو زانستانە چەندە قەرزاری عەقڵی ساف و تیژی نیوتنن، كە لەسەر رێگەی راست دایْنان. تیۆرەكانی بەرادەیەك دامەزراو و قایلكەرن كە هیچ كەسێك نیە لێیان تێگەیشتبێ و توانیبێتی گومان لە راستییان بكات".

دەبێ ئەو ستایش و پەسنكردنەی نیوتن لەسەر زاری ئەنیشتاین بەدەستی هێنا، هەر جۆرە پلارێكی فەیلەسوفە ركابەركان بسڕێتەوە "چونكە سروشت

کتێبێکی کراوە بوو لە بەردەمیدا و توانی بەبێ زەحمەتی پیتەکانی بخوێنێتەوە. ئەو لە یەك کەسدا کەسایەتیی زانایەك کە تاقیکردنەوەی ئەنجام داوە و تیۆر دارێژ و میکانیکی و هونەرکار لە دەربڕینی لە خۆیدا کۆ کردبووەوە".

نیوتن لە کۆتاکانی ژیانیدا هەڵسەنگاندنێکی لەخۆبوردوانەی بۆ ژیانی خۆی کردووە کاتێك دەڵێ "نازانم چۆن دێمە بەرچاوی دنیا، بەڵام وەك لاوێك دێمە بەرچاوی خۆم کە لە کەناری دەریایەکدایە، ناوبەناو بە دۆزینەوەی چەوێکی لوستر یان گوێچکەماسیەکی جوانتر لە هی ئاسایی دڵی خۆش دەبێ، لەکاتێکدا ئۆقیانووسی گەورەی حەقیقەت هەمووی لەبەردەممدایە بەبێ ئەوەی بدۆزرێتەوە".



## ١٤- "بنەچەی رەگەزەکان"
## چارلز داروین Charles Darwin
### مانەوەی شیاوترین

لە رێکەوتێکی سەیردا ساڵی ١٨٠٩، رەنگە زیاتر لە هەر ساڵێك لە تەواوی مێژوودا، لەدایکبوونی ژمارەیەك سەرکردەی هەرە مەزنی بەخۆوە بینی. چارەنووس وابوو هەریەك لەو مەزنانە لە بواری خۆیدا دەربکەوێ. هەریەك لە چارلز داروین (نیوتنی زیندەوەرزانی) و ئەبراهام لینکۆڵن ئەو پیاوە مەزنەی پرسی ئازادکردنی کۆیلەی نایە کۆڵی و بەدیهێنا، لە هەمان رۆژدا لەدایك بوون و هەر خەریك بوو لە هەمان سەعاتیشدا بێ.

لەو مەزنە پیاوانەی لەو ساڵەدا چاویان بە روناکی هەڵهێنا، هەریەك لە گلادستۆن، جێنیسۆن، ئەدگار ئالان پۆ، ئۆلیڤەر وێندڵ هۆڵمیز، ئەلیزابیث بارێل براونینگ و فێلیکس ماندیلسۆهن بوون.

هیچکام لەو ناوە بەناوبانگانە، لەڕاستیدا لەنێو ئەو ملیۆنان کەسەیش کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا لەدایك بوون، جگە لە کارل مارکس، کەسیان لە داروین زیاتر رۆڵیان لە گۆڕینی ئاراستە سەرەکیەکانی هزر و هێنانەکایەی دیدێکی نوێ لە بابەتە مرۆییەکاندا نەبووە. "داروینیزم" بیرۆکەیەکە وەك مارکسیزم و ماڵتۆسیزم و میکیافیلیزم لە عەقڵی خەڵکدا چەسپا و جێگیر بوو.

ئەگەرچی بنەما بنچینەییەکانی تیۆرەکانی داروین لە جیهانی زانستدا بەشێوەیەکی گشتی پەسەند کراون، بەڵام ماوەی سەدەیەك مشتومڕیان لەسەر بووە. شەڕە بنچینەییە نوێکانی هەردوو سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم کە لە

بوارەکانی "بابەتی مەیمون"دا لە ویلایەتی تێنێسی گەیشتە لوتکە، شتێکی کەمە لە نموونەی شەڕێك کە ساڵی ١٨٥٩ دەستی پێکرد و تا ئەم دواییە هیچ ئاماژەیەك بۆ هاتنەکایەی ئاگربەست بەدی نەدەکرا.

داروین بەلاوی ئاماژەیەکی ئەوتۆی پیشان نەدەدا کە ئەوەی لێ بخوێنرێتەوە ئەو کەسە لە ئایندەدا دەبێتە زانایەکی خاوەن ناوبانگی جیهانی..لە بنەماڵەیەکەوە هاتووە کە ژمارەیەك زانای دیار و پیاوانی پرۆفیشناڵی تێدا بووە، بەڵام تەنانەت باوکیشی گومانی هەبوو لەوەی کوڕەکەی ببێتە شتێك. لە قوتابخانەی "ڕێساکانی زمان" چارلی بچوك لە خوێندنی زمانە مردووەکان و میتۆدی کلاسیکیی وشك و قورس بێزار بوو. چاودێری ئەو قوتابخانەیە سەرنجی دابوو داروین کاتی خۆی بە تاقیکردنەوەی کیمیایی و کۆکردنەوەی جڕ و جانەوەر و کانزاکانەوە دەکوژێ. بۆ ئەوەی ڕێچکەی باوکی بگرێ؛ لە تەمەنی شازدە ساڵیدا نێردرا بۆ زانکۆی ئەدەنبرە بۆ خوێندنی پزیشکی. دوای دوو ساڵ بڕیاریدا کە پیشەی پزیشکی بۆ ئەو دەست نادات. هەربۆیە چوو بۆ کامبرێدج تا مەشق لەسەر کەهەنوتی کەنیسەی ئینگلیزی بکات.

لە ڕوانگەی خوێندنی شکڵیەوە، داروین خوێندنی سێ ساڵەکەی لە کامبرێدج بە کات بەفیڕۆدان دادەنا. بەڵام بەخت یاوەری بوو کە بوو بە هاوڕێی دوو مامۆستای خاوەن ئەزموونی گەورە. داروین کاتێکی زۆری لەگەڵ هێنسلۆ مامۆستای ڕووەکناسی و سێدگویك مامۆستای جیۆلۆجیا بەسەر برد لە گەشتەکانیدا بۆ کێڵگەکان و کۆکردنەوەی قۆلانچە و تێبینیەکانی مێژووی سروشتی.

داروین لابەلایی، لەڕێی سێدگویکەوە دەرفەتی بۆ هەڵکەوت وەك زانایەکی سروشتی لەسەر پشتی کەشتیەکی دەریایی بەناوی بیگل Beagle گەشتێك بکات، لە نێردەیەکدا دەرچوو بۆ ئەنجامدانی ڕووپێوێکی فراوان لە نیوە گۆی باشووری زەوی. ئەو گەشتە کە داروین "بە گرنگترین و مەزنترین ڕووداو لە

ژیانمدا" دایدەنێ، بڕیاری لە كایەی هەموو ئایندە ژیانیدا. بیرۆكەی بوونە كاهینیش لەسەر بیگڵ مردنێكی سروشتی مرد.

بیگڵ لە ماوەی پێنج ساڵی نێوان ١٨٣١-١٨٣٦ بەنزیكەیی لەسەر هەموو كیشوەر و هەموو دورگەیەكی گەورە لەنگەری گرت. داوا لە داروین كرا وەك كەسێكی جیۆلۆجی و زانا لە رووەكناسی و ئاژەڵناسی و لە زانستە سروشتیەكاندا بەشێوەیەكی گشتی كار بكات. ئەوەیش ئامادەكردنێكی نایاب بوو بۆ ژیانی ئایندەی لە توێژینەوە و نووسیندا. بۆ هەركوێ بڕۆیشتایە كۆمەڵێكی زۆر رووەك و ئاژەڵی بەبەردبوو و زیندووی وشكانی و ئاوی كۆدەكردەوە. بەچاوی زانایەكی سروشتی هەموو ئەو رووەك و ئاژەڵانەی دەپشكنی كە لەسەر زەوی و دەریادا دەژیان. لە دەشتەكانی بامبا لە ئەرجەنیتن و لێژاییەكانی چیای ئەندێزی وشك و دەریاچە سوێرەكان و بیابانەكان لە شیكی و ئوستراليا و دارستانە چڕەكانی بەرازیل و تیرادێل فویگۆ و تاهیتی و دورگەكانی سەری سەوز و پێكهاتنە جیۆلۆجیەكانی كەناری ئەمەریكای باشور و چیاكانی و گڕكانە زیندوو و كوژاوەكان بە دورگە و زەویەكانی كیشوەرەكە، بەربەستە مەرجانیەكان و مەمكدارە بەبەردبووەكان لە پاتاگۆنیا و رەگەزە مرۆییە لەناوچووەكان لە پیرۆ و نیشتمانییە ئەسڵیەكان لە

تیرادێل فویگۆ و پاتاگۆنیا.

لەنێو سەرجەم ئەو ناوچانەی داروین سەردانی كردن، هیچیان وەك دورگەكانی گالاپاگۆس Galapagosلە دووریی ٥٠٠ میل لە خۆرئاوای كەناری ئەمەریكای باشور، چێژیان پێ نەبەخشی. داروین بینی لە هەموو شوێنێكی ئەم دورگە گڕكانییە چەپ و چۆڵەوانییە وشكەلانەدا، كیسەڵی زەبەلاح دەژین.. مارمێلكەی زل زلی لێ بوو كە لە زۆر زووەوە لە بەشەكانیتری جیهاندا پوكاوەتەوە، هەروەها قرژاڵی زەبەلاح و شێری زل زلی دەریای لێ بوو. ئەوەی بەشێوەیەكی تایبەت

تووشـی سەرسـوڕمانی کـرد ئـەوە بـوو باڵنـدەکانی ئـەو دورگەیـە لـە باڵنـدەکانی کیشوەرەکەی تەنیشتی دەچوون، بەڵام تەواو وەك یـەك نـەبوون. زیـاد لـەوەیش، جیاوازی لەنێوان رەگەزە جیاوازەکانی باڵندە لەنێوان دورگەیـەك و دورگەیـەکیتردا هەبوو.

ئەو دیاردە غەریبانەی لە دورگەکانی گالاباگۆس و هەندێ راستیتریش کە پێشتر لە ئەمەریکای باشوور تێبینی کردبوون، بیرۆکەی پەرەسـەندنی لـە مێشـکی داروینـدا بـەهێزتر کـرد، کـە خـەریك بـوو لـە زەینیـدا چـەکەرەی دەکـرد. ئەمـە دەقـی چیرۆکەکەیە وەك خۆی دەیگێڕێتەوە:

"سەرم زۆر سوڕما کاتێك لە پێکهاتەکانی بامبادا هەندێ ئاژەڵی حـەفریی گـەورەم دۆزیەوە کە بە قـاوغی هاوشـێوەی قـاوغی ئـەرمادیۆی ئێسـتا داپۆشـراوە. دووەم (سەرم سـوڕما) لـە شـێوازی جێگرتنـەوەی ئاژەڵـە سـەیر لێکچووەکان بـۆ یـەکتر لەکاتی چوونیاندا بەرەو باشور لە کیشوەرەکەدا. سێیەمش بە مۆرکی ئەمـەریکای باشوریانەی زۆربەی بەرهەمەکانی ئەرخـەبیل گالاباگۆس، بەتایبـەت لـە چۆنێتیی جیاوازبوونی کەمیان لە هەر دورگەیەکی ئەو کۆمەڵـە دورگانـە. هـیچ دورگەیـەکیان نیە بەمانا جیۆلۆجیەکە زۆر کۆن بێ".

داروین چـیتر زانیاریـەکانی "التکوین"ی بەڕاسـت نـەدەزانی کـە دەیگـوت هـەر رەگەزێك بەتەواوی خەلق کـراوە و بەدرێـژایی سـەردەمەکان نـەگۆڕاوە. (مەبەسـت سیفری تەکوینی تەوراتە-وەرگێڕ).

هـەر لەگـەڵ گەڕانـەوەی بـۆ ئینگلتـەرا، دەسـتی کـرد بـە پاراستنی یاداشتەکانی لەبارەی پەرەسەندن و کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی رەگەزە جیاوازەکان. ئەمـە بۆچوونی بوو لەبارەی "بنەچەی رەگـەزەکان". سـاڵی ١٨٤٢ یەکـەم رەشنووسـی تیۆرەکەی لە ٣٥ لاپەڕەدا نووسی. گرێکوێرەی گەورە لە سەرەتادا ئەوە بوو چۆن دەرکـەوتن و نـەمانی جۆرەکـان لێـك بداتـەوە. بۆچـی رەگـەزەکان پـەیدا دەبـن و

بەتێپەڕینی کات گۆڕانیان بەسەردا دێت و بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبن و زۆربەری جاریش بەتەواوی بزر دەبن؟

داروین بەڕێکەوت کتێبەکەی مالتۆسی لەبارەی دانیشتوان خوێندەوە، لەوەدا کلیلی ئەو گرێکوێرەیەی دۆزیەوە. مالتۆس روونی کردەوە کە تێکرای زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان "کۆمەڵێ هۆکاری ئەرێنیانەی پەکخستن" وەك نەخۆشی و رووداوەکان و جەنگەکان و برسێتیەکان، دوایان خستووە. داروین ئەوەی بەبیردا هات کە هۆکارگەلێکی هاوشێوە کار بۆ نزمکردنەوەی ژمارەی ئاژەڵ و رووەکەکان دەکەن. بۆیە دەنووسێ:

"کاتێ بەپشتبەستن بە سەرنجدانی بەردەوام و دوور و درێژم لە عادەتی ئاژەڵ و رووەکەکان، تەواو ئامادە بووم بۆ مەزەندەکردنی بەهای ململانێی مانەوە کە لە هەموو جێیەك لەئارادایە، دەستبەجێ ئەوەم بەخەیاڵدا هات کە لەم جۆرە هەلومەرجانەدا رەگەزە باشەکان هەوڵ دەدەن پارێزگاری لە رەگەزەکەیان بکەن لەکاتێکدا رەگەزە بێکەڵکەکان دەپووکێنەوە. ئەنجامی ئەمەیش پێکهاتنی رەگەزگەلی باشە. سەرەنجام بیردۆزێکم لەلا گەڵاڵە بوو کە دەتوانم لەبەر تیشکیدا کار بکەم".

بەم شێوەیە رێبازی بەناوبانگی داروین "هەڵبژاردنی سروشتی" یان "ململانێی مانەوە" یان "مانەوەی باشترین" لەدایك بوو، کە بەردی بناغە بوو بۆ نووسینی "بنەچەی رەگەزەکان" (اصل الاجناس).

داروین بۆ ماوەی بیست ساڵ یاداشتەکانی دەنووسیەوە و بەڵگەی بۆ بیردۆزەکانی دەهێنایەوە. بۆ ئەوە بڕێکی زۆر دەقی خوێندەوە، وەك بەستەی تەواوی گۆڤارە دەوریەکان، کتێبەکانی گەشتنامە و ماتماتیك و چاندنی گوڵ و میوە و سەوزە و پەروەردەکردنی ئاژەڵ و مێژووی سروشتیی گشتی. خۆی دەڵێ "کاتێ لە لیستی

ئـەو كتێبانــەی خوێندومنەتــەوە و كــورتم كردوونەتــەوە رادەمێـنم، كـە چـەندین بەستەی تەواوی رۆژنامە و گۆڤار دەگرێتەوە، بە چالاكیی خۆم سەرسام بووم".

قسەی لەگەڵ پسپۆڕانی بەخێوكردنی ئاژەڵ و رووەك كرد و كۆمەڵێ پرسـیاری بـۆ هەر كەسێك دەنارد كە گومانی هەبوو لەوانەیە زانیاریی بەكەڵكیان لەلا بێ. ئێسكە پەیكـەری چـەند جۆرێـك لـە باڵنـدە ماڵیـەكانی ئامـادە كـرد و تـەمـەن و كێشـی ئێسكیانی بە هی رەگەزەكانی باڵندە كێویەكان بەراورد كرد، كۆتری مـاڵی بـەخێو كرد و تاقیكردنەوەی زۆری لە تێكەڵكردنی رەگـەزی ئاژەڵـەكان (واتـە پێكهێنـانی جـۆری دوو رەگ) كـرد. هـەروەها تاقیكردنـەوەی لەسـەر میـوە و ئـەو تۆوانــەی دەكەونـە سـەر رووی دەریـا كـرد، چـەند شـتێكیتری پشـكنی كـە پەیوەنـدیان بـە گواستنەوەی تۆوەوە هەیە و بۆ ئەو مەبەستە هـەموو زانیاریـەكانی رووەكناسـی و ئاژەڵناسی و زانستی كنەكاری یان ئەو لەشـە بەبەردبووانـەی بـەكار هێنـا، كـە لـە گەشـتەكەی لەسـەر كەشـتیی دەریـایی بیگـڵ بەدەسـتی هێنـابوون. بۆچـوونی شەخسـیی خۆیشـی بـۆ ئـەم زانیاریانـە زیـاد كـرد، چـونكە خـۆی هەمیشـە لـە بیركردنەوەدا بوو لە تیۆرە شۆڕشگێڕانەكانی.

داروین باوەڕی وابوو پاڵپشتیكردنی بەهێزی رێبازەكـەی "هەڵبـژاردنی سروشـتی" لە لێكۆڵینەوە لە "هەڵبژاردنی دەستكرد" (الانتقاء الصناعی)ەوە هاتووە. ئـەوەتا لە حاڵەتی ئاژەڵە ماڵیەكان و رووەكە ماڵیەكاندا (ئەسپ و سەگ و پشیلە و گەنم و جۆ و گوڵەكانی باخچە) مـرۆڤ بەسـوودترینیانی هەڵبـژاردووە و بـەخێوی كـردوون. بەم شێوەیە لەڕێی ئەم پرۆسـەیەوە ئاژەڵـە ماڵیـەكان و بەروبومـەكان و گوڵـەكان دەستكاری كراون، بەشـێوەیەك بەكـەمی دەتـوانرێ بناسـرێنەوە كـە ئەوانـە هـیچ پەیوەندیەكیان بە پێشینە كێویەكانیانەوە هەیە. بەم شێوەیە رەگەزی نوێ لەڕێی هەڵبژاردنــەوە پەیــدا بــوون. پەروەردەكــەر ئــەو ئاژەڵانــە هەڵدەبــژێرێ كــە سـیفاتەكانیانی بەدڵـە و ئـەوانیتر بـەخێو ناكـا. سـەرەنجام دوای چـەند نەوەیـەك

هەندێ رەگەز پەیدا دەبن کە جیاوازن لەوانەی پێشتر هەبوون. سەرجەم جۆرە جیاوازەکانی سەگ، وەك سەگی لەشدرێژ و قاچ کورت، سەگی پاسەوانی مەڕ و مالآت، رەنگ سپیی گوێ درێژ و هەموو جۆرەکانی سەگی راو، هەر هەموویان لە گورگەوە هاتوون.

داروین گوتی، ئەگەر بکرێ پەرەسەندن لەڕێی هەڵبژاردنی دەستکردەوە بکرێ، ئاخۆ سروشت ناتوانێ لەڕێی هەڵبژاردنی سروشتیەوە ئەوە بکات؟ لە سروشتدا "ململانێی مانەوە" جێگەی بەخێوکەر دەگرێتەوە. داروین سەرنجیدا لەنێو سەرجەم جۆرەکانی ژیاندا، دەبێ ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکان لەناو بچن. لەنێو ئەوانەی لە هەر جۆرێکدا لەدایك دەبن، تەنیا رێژەیەکی کەمیان دەتوانن بژین. هەندێ رەگەز خۆراك بۆ هەندێ رەگەزیتر دەستەبەر دەکەن. شەڕەکە بەبێ پچڕان بەردەوام دەبێ. رکابەریی توند ئاژەڵ و رووەکە ناباشەکان لەناو دەبات و دەپووکێنەوە و گۆڕانکاری لە رەگەزەکاندا روو دەدات، تا لەگەڵ بارودۆخی پێویست بۆ مانەوەیان بگونجێن.

بەم شێوەیە داروین سوور بوو لەسەر ئەوەی قەلآیەك بەڵگە بۆ تیۆرەکانی دروست بکات کە گژبەریی هەموو هێرشێك بکات. بەڵام بلآوکردنەوەی تا پەنجاکانی سەدەی نۆزدەیەم پشتگوێ خست. سەرەنجام، پاش پێداگریی هاورێ دڵسۆزەکانی، دەستی بە ئامادەسازی کرد بۆ کارێکی مێژوویی لە چەند بەرگێکدا. بەڵام لەو کاتەی ئەو کارە نزیکەی لە ناوەڕاستدا بوو، بروسکەیەك روویدا، داروین نامەیەکی لە ئەلفرید روسڵ والآسەوە پێگەیشت، کە یەکێك بوو لە هاورێ زاناکانی و سەرقاڵی توێژینەوە و دۆزینەوە بوو لە مێژووی سروشتیدا لە ئەرخەبیلی مەلایۆ. والآس باسی لەوە کرد کە ئەویش بیری خۆی بە لێکۆڵینەوە لە بنەچەی رەگەزەکانەوە سەرقاڵ کردووە، ئەویش وەك داروین، کتێبەکەی مالتۆسی خوێندۆتەوە و ئەو کارەی بەخەیاڵیدا هێناوە.

نامەکە وتارێکی تێدا بوو لەبارەی "مەیلی جۆرەکانی رەگەزەکان بۆ بەجێهێشتنی یەکجارەکیی شێوە ئەسڵییەکەیان". ئەوە رێك یەکێك بوو لە راستیەکانی تیۆری داروین. داروین گوتی "ئەگەر والاس چاوی بە یاداشتە دەسخەتەکانم کە ساڵی ١٨٤٢ نووسینم بکەوتایە، پوختەیەکی لەمە باشتری نەدەنووسی. تەنانەت زاراوەکانیشی هەمان ناونیشانی دەروازەکانی کتێبەکەی منە".

داروین تووشی گرێکوێرەك بوو، ئەوە روونە کە هەردووکیان رێك بەهەمان ئەنجام گەیشتبوون، لەکاتێکدا سەربەخۆ و جیا لە یەکتر کاریان دەکرد، هەروەها سەرباری ئەوەی داروین ساڵانێکی بە بیرکردنەوە و توێژینەوە لەو بابەتەدا بەسەر برد و بۆچوونەکانی والاس لەپڕ لێی پەیدا بوون. سەرەنجام بڕیار هاتە سەر ئەوەی هەریەکەیان کارنامەکەی خۆی لە کۆبوونەوەی داهاتووی کۆمەڵەی لینائی Linaenn پێشکەش بکات. بەو هۆیەوە تیۆری پەرەسەندن و هەڵبژاردنی سروشتی بۆ یەکەم جار لە سەرەتای تەممووزی ١٨٥٨ راگەیەنرا. ماوەیەکی کورت پاش ئەوە وتارەکەی هەردووکیان لە رۆژنامەی کۆمەڵەکەدا بڵاو کرانەوە.

رووداوەکەی والاس حەماسی داروینی تاودا و وازی لەو کتێبە قەبەیە هێنا کە ئامادەی دەکرد و بڕیاریدا "پوختە"یەك بنووسێ. لەنزیك کۆتایی ساڵی ١٨٥٩ جۆن مورای لە لەندەن ئەو کتێبەی بڵاو کردەوە کە بوو بە بەردی بناغە لە مێژووی زانستەکان. تیراژی چاپی یەکەم ١٥٠٠ دانە بوو هەر هەمووی لە یەکەم رۆژدا فرۆشرا و چاپیتری بەدوودا هات، تا ژمارەی ئەو کتێبانەی لە ژیانی دارویندا (ساڵی ١٨٨٥ مرد) فرۆشران، تەنها لە ئینگلتەرادا گەیشتە ٢٤ هەزار دانە. کتێبەکە بۆ نزیکەی هەموو زمانە شارستانیەکان وەرگێڕدراوە. ناونیشانی ئەسڵیی کتێبەکە بریتی بوو لە "بنەچەی رەگەزەکان لە رێگەی هەڵبژاردنی سروشتی یان مانەوەی رەگەزە باشەکان لە ململانێ لەپێناو مانەوەدا". پاشان زەمەن ئەو ناونیشانە دوور و درێژەی کورت کردەوە بۆ "بنەچەی رەگەزەکان".

داروین لە چوار دەروازەی یەکەمی کتێبەکەیدا بنچینە جەوهەرییەکانی تیۆرەکەی شیکردۆتەوە. ئەو چوار دەروازەیە لەسەر ئەو بەرهەڵستیانە وەستاون کە رەنگە رووبەڕووی تیۆرەکە ببنەوە. دوای ئەوە چەند دەروازەیەك دێن، کە باس لە زانستی چینەکانی زەوی و دابەشبوونی جوگرافیانەی رووەك و ئاژەڵەکان و راستییە گونجاوەکان بۆ پۆلێنکردنیان و زانستی رووی دەرەوەی بونەوەرەکان و زانستی کۆرپەلەزانی دەکەن. دواین دەروازەیش هەموو ئەوانەی کورت کردۆتەوە.
داروین لە سەرەتای "بنەچەی رەگەزەکان"دا ئەو گۆڕانانەی لەئەنجامی چاوێدریکردنی مرۆڤەوە بەسەر ئاژەڵەماڵیەکان و رووەکە ماڵیەکاندا هاتووە، لێك دەداتەوە و ئەو جۆرانەی لە "هەڵبژاردنی دەستکرد" کەوتوونەتەوە لەتەك ئەو گۆڕانانەی لە سروشتدا یان لە "هەڵبژاردنی سروشتی"دا روودەدەن، بەراورد دەکات. لە کوێ ژیان هەبێ گۆڕانیش بەبەردەوامی روودەدات. هیچ دوو کەسێکیش نین تەواو لێك بچن.
داروین ململانێی مانەوەی بۆ هەمەجۆری زیاد کرد و هەندێ نموونەی بەناوبانگی بەکارهێنا بۆ شەرحکردنی ئەوەی چۆن چۆنی توانای بونەوەرە زیندووەکان بۆ زۆربوون زیاد دەکات و تا ج رادەیەك لە بارێکدا توانای ژیانی هەبێ. تەنانەت خاوترین ئاژەڵیش لە زاوزێدا بەخێرایی دنیا پڕ دەکات. ئەگەر هەموو فیلێك بۆ تەمەنی باڵقبوون گەورە ببێ و بەسروشتی زیاد بکات، ئەوا وەك داروین دەڵێ "دوای ٧٤٠ بۆ ٧٥٠ ساڵ ١٩ ملیۆن فیل لە وەچەی ئەو جووتانەی یەکەم لەژیاندا دەبن". لەو رووەوە ژمارەی ئەوانەی لەدایك دەبن زۆر زیاترن لەوانەی دەکرێ بژین، کەواتە دەبێ ململانێ لەسەر مانەوە هەبێ، جا یان لەنێوان تاکێك و تاکێکیتری هەمان رەگەز، یان لەنێوان رەگەزە جیاوازەکاندا، یان لەنێوان بونەوەرە زیندووەکان و بارودۆخی ژیانی سروشتیدا".

ئەو ڕێسایەی هیچ ریزپەڕێکی نیە کە دەڵێ هەموو رووەك یان ماسی یان باڵندە یان ئاژەڵێك، بەمرۆڤیشەوە، بێشومار تۆو بەرهەم دێنێ زیاتر لەوەی دەتوانێ لەگەڵ دنیای جەنجاڵدا بگونجێ، یان زیاتر لەوەی لەدایك دەبێ. تێکڕای زیادبوونیش بەپێی زیادبوونێکی لەدوایەکی ئەندازەییە، واتە جاران بوونە.

هەروەها رەسمێکی لەبارەی بۆ روونکردنەوەی پشت بەیەکتربەستنی بونەوەرە زیندووەکان پێشکەش کردووە. داروین بینی پیتاندنی رووەکی لەرێگەی هەنگەوە، بۆ بەپیتکردنی گوڵەکانی بانسیە و هەندێ جۆری بەرسیم گرنگە.

"ژمارەی هەنگ لە هەر ناوچەیەکدا تا رادەیەکی زۆر لەسەر ژمارەی ئەو مشکانەی کێڵگە کە خانەکانی تێکدەدەن و ئەو شانە هەنگوینانەی دروستیان دەکات دەوەستێ.. ژمارەی مشکیش، وەك هەموو مرۆڤێك دەزانێ، لەسەر ژمارەی پشیلە دەوەستێ.. کەواتە زۆر عەقڵ دەیبڕێ کە بوونی هەر ئاژەڵێکی راوچی (دڕندە) بە ژمارەیەکی زۆر لە هەر ناوچەیەکدا، لەرێی پشتبەستنی کائینێك بەویتر، یەکەم شت بڕیار لەسەر ژمارەی مشك و پاشان ژمارەی هەنگ و دوای ئەوەیش بوونی گوڵێکی دیاریکراو لەو ناوچەیە، دەدات".

کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان" بە روونکردنەوەی چۆنێتیی کارکردنی بنەمای "هەڵبژاردنی سروشتی" لە وەستاندنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان دەست پێدەکات. هەندێ تاکی رەگەزێك لە هەندێکیتریان بەهێزترن، یان خێراتر دەڕۆن، یان زیرەکترن، یان بەرگرییان بۆ نەخۆشی زیاترە، یان زیاتر بەرگەی سەختیی کەشوهەوا دەگرن. ئەوانە بەزیندوویی دەمێننەوە و زیاد دەکەن و لاوازەکان لەناو دەچن. کەروێشکی سپی لە ناوچە جەمسەرییەکان دەژی لەکاتێکدا رێوی و گورگ و کەروێشکی قاوەیی کە گەورەتریشن، لەریشە دێن. زەرافەی مل درێژ توانیویانە بژین لەبەرئەوەی توانیویانە لەکاتی وشکەساڵیدا دەمیان بگاتە خواردن لە لوتکەی درەختەکان، لەکاتێکدا زەرافە ملکورتەکان لەبرسا مردوون. ئەم جیاوازیانە

بنەمای "مانەوەی باشترین" دەسەلمێنن، کە لە ماوەی دەیان هەزارساڵدا بووەتە مایەی دروستبوونی رەگەزی نوێ.

داروین ئاماژە بۆ رواڵەتێکی گرنگ لە رواڵەتەکانی "هەڵبژاردنی سروشتی" دەکات و دەڵێ:

"واباوە ئەو نێرینانەی زیاتر لەگەڵ شوێنە سروشتیەکانیان گونجاون، وەچەی زیاتر دەخەنەوە.. بزنی کوڵ (واتە بێ شاخ) یان کەڵەشێری بێ چڕنوك دەرفەتیان بۆ خستنەوەی وەچەی زۆر لاوازترە"، "بەزۆری ململانێ لەنێوان باڵندەکاندا هێمنتر دەبێ"، ئەوا نێرینەی رەگەزە جیاوازەکان هەوڵ دەدەن لەرێی خوێندنی زوڵاڵ یان پەڕی جوان یان ئەنجامدانی هەندێ فێڵی سەیرەوە مێینەکان کێش بکەن.

هەروەها کەشوهەوایش فاکتەرێکی بەهێزە لە هەڵبژاردنی سروشتیدا، لەبەرئەوەی وادیارە وەرزە زۆر سارد و وشکەکان زیاتر بەربەستن لەبەردەم زاوزێکردندا. لەیەکەم سەرنجدا وا دەردەکەوێ کاریگەریی کەشوهەوا هیچ پەیوەندی بە ململانێی مانەوەوە نیە، بەڵام لەو رووەوە کەشوهەوا دەبێتە هۆی کەمکرنەوەی خواردن، ئەمیش لەتەك خۆیدا ململانێیەکی توند لەنێوان تاکەکاندا دێنێ، چ لەنێوان هەمان رەگەز یان لەنێوان تاکەکانی رەگەزە جیاوازەکان کە هەمان جۆر خواردن دەخۆن. واش چاوەڕوان دەکرێ ئەوەی زیاتر لەوانیتر دەژی ئەو تاکانە بەهێزانە بن کە توانای بەرگەگرتنی گەرما یان سەرمایان هەیە و زیاتر توانای بەدەستهێنانی خواردنیان هەیە.

داروین دەنووسێ:

"هەڵبژاردنی سروشتی هەموو رۆژێك و بگرە هەموو سەعاتێك لە جیهاندا لە بۆسەدایە بۆ کەمترین جیاوازیەکان و جا ئەوەی بێکەڵکە فڕێی دەدات و دەست بە هەموو باشەکانەوە دەگرێ. بەهێمنی و دەستبەجێ و لە هەر کوێ دەرفەتی بۆ

بڕەخسێ لە باشكردنی هەر زیندەوەرێكی ئەندامی كار دەكا، ئەویش بەگوێرەی بارودۆخی ژیانە ئەندامی یان نائەندامیەكەی. هیچ لەم گۆڕانە هێواشانەمان نەدی لەكاتی پێشڕەویكردندا، تا دەستی زەمەن تێپەڕینی سەردەمەكانی روون كردەوە. تێڕوانینمان بۆ چاخە جیۆلۆجییە زۆر كۆنەكان ناتەواو دەبێ و جگە لە جیاوازیی شێوەكانی ژیانی ئێستا لە باری ژیان لە رابردوودا، نابینین".

داروین لە دوایین دەروازەكانی كتێبەكەیدا ئاماژە بەوە دەدات كە هیچ سنوورێك بۆ هێزی هەڵبژاردنی سروشتی نیە و پێی وایە مرۆڤ دەتوانێ "لە لێكچوونەوە بەو دەرەنجامە بگا كە شیمانە هەیە هەموو بوونەوەرە ئەندامیەكان كە لەسەر زەوی ژیاون لە یەك وێنەی ئەسڵیەوە هاتبن، كە یەكەم جار ژیانی تێ گەڕاوە".

بەم شێوەیە لە شەڕی سروشت و لە برسێتیەكان و لە مردنەوە، گەورەترین بابەت بۆ بیرلێكردنەوە دەدۆزینەوە، ئەویش بەرهەمهێنانی ئاژەڵە باڵاكانە. مەزنیەك هەیە لەم بۆچوونە لەبارەی ژیان بە سەرجەم هێزەكانیەوە كە بەدیهێنەر كردوویەتیە وێنەیەك یان چەند وێنەیەك. لەكاتێكدا ئەم هەسارەیە بەپێی یاسای جێگیری كێشكردن دەسوڕێ، هەر لەم سەرەتا سادەیەوە بێشومار وێنەی ئەوپەڕی جوان و سەرسوڕهێن پەیدا بوون و هێشتایش پەیدا دەبن.

تیۆری پەرەسەندنی بێكۆتا كە كتێبی "بنەچەی رەگەزەكان" پێشكەشی كرد بەم شێوەیە. لەگەڵ ئەوەیشدا بەپێچەوانەی رای باو، داروین بەدیهێنەری تیۆری پەرەسەندن نین، ئەم بیرۆكەیە لە ئەرستۆ و لۆكریتۆسیش كۆنترە. زۆر لە عەقڵە زۆر زیرەكەكانی پشتگیری ئەم رێبازەیان كردووە، لەوانە بوفۆن و گۆتە و ئێراسموس داروین (باپیری چارلز) و لامارك و هێربەر سپێنسەر.

تیۆرەكەی چارلز داروین لە دوو رووەوە ناوبانگی دەركرد: یەكەمیان كۆنیی بەڵگەكان كە مشتومڕ هەڵدەگرن بۆ سەلماندنی راستیی تیۆری پەرەسەندن، زیاتر لەوانەی پێشتر پێشكەشیان كرد. دووەمیان ئەو تیۆرە بەناوبانگەكەی لەبارەی

هەڵبژاردنی سروشتی بە تەفسیرێکی ماقووڵ بۆ شێوەی پەرەسەندنەکە خستە روو.

جا ئەگەر ئەم تیۆرە شۆڕشگێڕانە نوێیە راست بێ، ئیتر پاش ئەوە نابێ چیرۆکەکەی تەورات لەبارەی دروستبوون (ی گەردوون و مرۆڤ) قبوڵ بکرێ. کەنیسە یەکسەر زانی تیۆری داروین مەترسییە لەسەر دین و گەردەلولێك بەرهەڵستی بەرپا کرد. ئەگەرچی داروین زۆر بەئاگایی جوڵایەوە و بیردۆزەکەی لەسەر رەگەزی بەشەری جێبەجێ نەکرد، کەچی ئەو تۆمەتە بڵاوبوویەوە کە ئەو دانەرە دەڵێ مرۆڤ لە مەیمونەوە هاتووە.

هەوڵی زۆر دران بۆ کەمکردنەوەی پایەی داروین لەرێی گاڵتەپێکردنەوە. وتارێك لە رۆژنامەی کوارتەرلی ریڤیو Quarterly Review داروینی بە "کەسێکی وەهمدار" وەسف کرد کە لە کتێبەکەیدا دەیەوێ "چنینی مەزەندەی بۆگەن و رامانە پیسەکانی پشتئەستوور بکات"، "هەروەها شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ سروشت ئابڕووبەرە، چ ئابڕووبەرێك".

رۆژنامەی سپێکتەیتەر Spectator ئەو تیۆرەی بەدڵ نەبوو "لەبەرئەوە نکوڵی لە کۆتا ئامانجەکان دەکات، بەوەیش ئاماژەیە بۆ تێگەیشتنێکی نائەخلاقیانە لەلایەن ئەوانەی بەرگری لێدەکەن". زیاد لەوەیش، داروین بەوە تۆمەبتار کرا کە برێك راستی کۆ کردۆتەوە بۆ پاڵپشتیکردنی بنەمایەکی قەڵب "ناتوانیت لە زنجیرەیەك بلقی هەوایی پیاوێك دروست بکەیت".

مامۆستا هوێل رازی نەبوو دانەیەك لە کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان" لە کتێبخانەی کامبریدج دابنرێ، کە داروین تێیدا خوێندی و پەروەردە بوو.

داروین پاڵپشتیەکی بەهێزی لەلایەن هاورێ زاناکانیەوە لێکرا، هەندێکیش بەتەواوی بەرهەڵستییان دەکرد. لەو کەسانەی بۆچوونی کۆنەپەرستانەیان هەبوو، کەسانی وەك ئۆوین لە ئینگلتەرا و ئاگاسیز لە ئەمەریکا بوون. هەردووکیان پێیان

وابوو بیرە داروینیەکان بێدینیەکی زانستییە و زۆر نابات لەبیر دەچێتەوە. زانای فەلەکناس سێر جۆن هێرچیل داروینیزم بە "یاسای هەڵگەڕاندنەوەی دۆخەکان" وەسف دەکات. سێدگوێك مامۆستای داروین بۆ زانستی چینەکانی زەوی لە زانکۆی کامبرێدج دەڵێ ئەم تیۆرە "تا ئەندازەیەکی خەمهێنەر بەتاڵ و شەرخوازە". داروین دەنووسێ کە ئەو "هێندە بە کتێبەکەی پێکەنیوە تا شەویلاگی هاتۆتە ئێش".

بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، کەسانێکی بوێریش هەبوون لەپشت داروین، لە پێشیانەوە چارل لایل زانای چینەکانی زەوی، تۆماس هوکسلی ئوستادی زیندەوەرانی، جۆزێف هووکەر زانای رووەکناس، ئاسا گرای زانای رووەکناسی ئەمەریکیی بەناوبانگ. لەناو ئەمانەدا داروین لە هەموویان زیاتر پشتی بە هوکسلی دەبەست کە ناونرابوو "بریکاری گشتی" و وەك "پاسەوانی بەئەمەکی داروین" ئاماژەی بۆ دەکرا. داروین پیاوی جەدەل نەبوو و هەرگیز بۆ بەرگریکردن لە تیۆرەکەی لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا نەبینراوە، بەڵکو ئەوەی زۆربەی ئەرکی بەرگریکردنەکەی گرتۆتە ئەستۆ، هوکسلی بوێر بووە.

هوکسلی یەکێك بوو لەو کەسانەی یەکێك لە دوو رۆڵە گرنگەکەی دەبینی لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی بەریتانی لە ئۆکسفۆرد ساڵی ١٨٦٠. بەرنامەی کۆبوونەوەکەی تیۆری داروین بوو. بەرگریکاری هەرە گەورە لە لایەنی نەیارانەوە قەشە ویبەرفۆرس قەشەی ئۆکسفۆرد بوو، کە لە کۆتایی وتارێکی پڕ هەرا و هۆریادا کە پێی وابوو تیۆرەکەی داروینی شرو وڕ کردوە، ئاوڕی لە هوکسلی دایەوە کە لەسەر سەکۆی وتاردانەکە دانیشتبوو و بە تەشقەڵەوە لێی پرسی: "دەمەوێ لە ئوستاد هوکسلی بپرسم: ئایا هاتنەکەی لە مەیمونەوە لەسەری باپیریەوە بووە یان داپیری؟". هوکسلی بەدەنگی بەرز بە هاوڕێیەکی گوت "خودا

خستیە بەردەستم". جا سەرکەوت تا وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە. دەڵێن گوتویەتی:

"مرۆڤ بۆی نیە شەرم بکات لەوەی باپیری مەیمونە، بەڵکو ئەو باپیرەی بەهۆیەوە هەست بە ریسوایی دەکەم ئەوەیە پیاوێك بێ زیرەکیەکی لەرزۆك و ناجێگیری هەبێ، بە سەرکەوتن لە بواری کارەکەیدا قانع نیە، بەڵکو خۆی دەدات بەمل هەندێ مەسەلەی زانستیدا کە شارەزاییەکی راستەقینەی تێیاندا نیە، هەربۆیە بە رەوانبێژییەکی بێ ئامانج تەمومژیان بەدەوردا دروست دەکات و بەوریاییەوە و لەرێی لادانێکی رەوانبێژانە و بانگەشەیەکی زیرەکانە بۆ دەمارگیریی ئاینی، سەرنجی گوێگرانی لە جەوهەری بابەتەکە دوور دەخاتەوە".

ئەمە یەکێکە لە بەریەککەوتنە زۆرەکانی نێوان کەنیسە و زانست بەهۆی رێبازەکەی داروین و ئەو پەرەسەندنەی لە ساڵانی دواتردا بەردەوام بوو.

داروین لەگەڵ چوونە تەمەندا بۆچوونی لەبارەی ئاینەوە گۆڕی. کاتێك گەنج بوو باوەڕی بە بیرۆکەی دروستکردن هێنا بەبێ ئەوەی لە ژیانی و لەرێی گوتارەکانیەوە دەریبڕێ و تێیدا باوەڕی خۆی پیشان بدات بەوەی مرۆڤ، لە ئایندەیەکی دووردا دەبێتە مەخلوقێکی تەواوتر لەوەی ئێستا هەیە.

داروین هەروەها دەڵێ:

"سەرچاوەیەکیتر کاری تێکردم بۆ پرسیارکردن لە بوونی "خوا" کە پەیوەندی بە عەقڵەوە هەیە نەك شعور، کە کامیان گرنگترە. ئەوەیش لە ئاستەمی، یان وردتر بڵێین مەحاڵیی وێناکردنی ئەم جیهانە پان و بەرینە سەرسوڕهێنەوە دێ، کە مرۆڤیش دەگرێتەوە و توانای تەماشاکردنی رابردوو و ئایندەی هەیە، وەك ئەوەی ئەنجامی دەرفەتی کوێر یان پێویستیی کوێر بێ. لەکاتێکدا من لەمە رادەمێنم، هەست دەکەم ناچارم بۆ کائینێکی یەکەم بڕوانم کە خاوەن عەقڵێکی زیرەکە بەرادەیەك لە عەقڵی مرۆڤ دەچێ. بەڕاستی من شایستەی ئەوەم بە ئیلحاد وەسف

بکرێم. وەك بیرم بێ، لە سەروەختی نووسینی "بنەچەی رەگەزەکان"دا ئەم بیرۆکەیە لە مێشکمدا بەهێز بوو. لەو کاتەوە -لەگەڵ هەندێ گۆڕانکاریدا- وردە وردە رووی لە لاوازی دەکات. بەڵام ئەوکاتە گومان پەیدا دەبێ: ئاخۆ دەکرێ متمانە بە عەقڵی مرۆڤ بکەین، کە بەبڕوای من، لە عەقڵێکی وەك عەقڵی ئایخترین ئاژەڵەوە پەرەی سەندووە. ئاخۆ دەکرێ متمانەی پێ بکەین لەکاتێکدا لە ئەنجامگیریدا بەم ئەنجامانە دەگات؟".

لەوێدا داروین هەردوو دەستی بەرز کردەوە و گوتی:

"من لافی ئەوە لێنادەم کەمترین تیشکم خستۆتە سەر ئەو پرسانە، چونکە لوغزی پەیدابوونی سەرجەم بوونەوەرەکان لەڕێی ئێمەوە مەحاڵە. پێویستە من وەك تاکێك، قایل بم بەوەی لە لایەنگرانی رێبازی بەسنەبوونی عەقڵی بەشەری بۆ تێگەیشتن لە وەحی بمێنمەوە".

دوای کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"، قەڵەمە بەبڕشتەکەی داروین چەندین کتێبیتری بەرهەم هێنا، کە باسیان لە بابەتی تایبەتمەندانەتر دەکرد و بڕیار وا بوو ببنە پاشکۆیەك بۆ پەرەسەندن لەڕێی هەڵبژاردنی سروشتیەوە و تەواو و پاڵپشتی بکەن، ئەو پەرەسەندنەی بەشێوەیەکی روون لە کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"دا پێشکەش کرا. یەکەم جار دوو بەرگی بچوك بەناونیشانی "لەبارەی رێگە جیاوازەکانی پیتاندنی ئۆرکیدەکان بەهۆی جانەوەرەوە" و "سروشتی رووەکە هەڵزناوەکان" دەرچوون. دوای ئەوە دوو کتێبی قەبە دەرچوون: "هەمەجۆریی ئاژەڵ و رووەکەکان بە دڵدانەوە" و "دابەزین (انحدار)ی مرۆڤ و هەڵبژاردن سەبارەت بە رەگەز". ئەم کتێبانەی دوایی باسیان لە دەربڕینی سۆزەکان لە مرۆڤ و ئاژەڵەکان و رووەکە جانەوەر خۆرەکان و ئاسەواری پیتاندن بە موتوربەکردن و هێزی جوڵە لە رووەکەکان بوون.

داروین لە کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"دا مەبەستی بوو گەنگەشەکردنی بابەتی

پەیدابوونی مرۆڤ کاڵ بکاتەوە، لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو هەر پێداگریەك لەسەر قۆناغی پەرەسەندن، دەبێتە مایەی فرێدانی تەواوی تیۆرەکە. لەگەڵ ئەوەیشدا بڕێکی زۆر بەڵگەی لەسەر "دابەزینی مرۆڤ لە ئاژەڵێترەوە" خستە روو، تا روونی بکاتەوە کە مرۆڤیش بەرهەمی پەرەسەندنە لە وێنەی ئەویترەوە.

داروین جێپەنجەی خۆی بەقووڵی لەسەر سەرجەم بوارە مەزنەکانی زانستەکان بەجێهێشت. زانایانی زیندەوەرزانی رێبازی پەرەسەندنی ئەندامییان پەسەند کرد، زانایانی چینەکانی زەوی و کیمیاناس و فیزیاناسەکانیش بەهەمان شێوە. پێشتریش زانایانی رەگەزە مرۆییەکان و زانایانی دەروونناس و فەیلەسوف و زانایانی کۆمەڵناس و تەنانەت زانایانی مێژوو و زانایانی سیاسەت و فەقیهەکانی زمان.

چارلز ئێلوود دەڵێ:

"کاتێ مرۆڤ لەو کاریگەرییە گەورەیەی کتێبەکەی داروین لەسەر هەموو لقەکانی فیکری بەشەری بەتایبەت زانستەکانی زیندەوەران و دەروون و کۆمەڵایەتی، رادەمێنێ دەگاتە ئەو ئەنجامەی.. پێویستە بالاترین کورسیی شەرەف وەك مەزنترین بیرمەند بدرێتە داروین، کە بیری خۆی لە سەدەی نۆزدەیەمدا وەبەرهێناوە، نەك تەنها لە ئینگلتەرا بگرە لە سەرتاسەری دنیادا".

وێست لەبارەی کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"ەوە دەڵێ "بەڕاستی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، تەنیا بە پێشکەشکردنی بنەمایەکی نوێی بەرز نەك مت، هەموو لقێکی توێژینەوەی ژێرلوژوور کرد، لە فەلەکناسیەوە بۆ مێژوو، لە زانستی کنەکردنەکانەوە بۆ دەروونناسی و لە کۆرپەلەناسیەوە بۆ ئاین".

لەلایەکیترەوە هەندێ پراکتیزەکردن بۆ تیۆرەکانی داروین هەن، کە بێگومان ئەو لەوە بێئاگا بووە، وەك فاشیزم کە بیرۆکەی هەڵبژاردنی سروشتی، یان مانەوەی باشترینی بەکار هێنا تا پاساو بە پاکتاوکردنی هەندێ رەگەزی تایبەت بدات.

بەهەمان رێگە بەرگری لە جەنگی نێوان گەلان کرا، گوایە ئامرازێکە بۆ لەناوبردنی لاوازەکان و بەردەوامیی مانەوەی بەهێزەکان. هەروەها داروینیزم لەلایەن لایەنگرانی مارکسیزمەوە شێوێنراوە بەهۆی جیبەجێکردنی لە ململانێی چینەکاندا، هەروەها هەندێ گرووپی درندە داروینیزمیان بۆ پاساودانی لەناوبردنی کۆمەڵگە بچوکەکان بەکار هێنا.

لەبەرئەوەی داروین تابلێیت ورد بوو لە تێبینی و ئەزموونکردندا، کتێبەکەی لەگەڵ فراوانبوونی مەعریفەی زانستی لە زۆربەی بارەکانیدا بەپتەوی مایەوە. ئەگەرچی دۆزینەوەکانی زانستە نوێکان گۆڕانکاری لە تیۆرەکانیدا کرد، بەڵام توانی بەشێوەیەکی سەیر پێشبینیی ئەو بۆچوونانە بکات کە ئێستا لە بۆماوەزانی و کنەکاری و زۆر بواریتردا باون.

نرخاندنێکیتری پێگەی باڵای داروین لە مێژووی زانستەکاندا لەلایەن زانایەکی گەورەی زیندەوەرانەوە بوو، ئەویش جولیان هوکسلی نەوەی هوکسلیی هاوڕێی بوو. جولیان دەڵێ:

"کتێبەکەی داروین جیهانی ژیانی خستە چوارچێوەی یاسای سروشتی. چیتر پێویست نیە یان مومکین نیە وا بیر بکەینەوە هەر جۆرە ئاژەڵ یان رووەکێك بەشێوەیەکی تایبەت خەلق کرابێ. یان رێگە جوان و زیرەکانەکانی لە بەدەستهێنانی خۆراك یان هەڵاتن لە دوژمن، باسی هێزێکی بان سروشتی تێدا کراوە، یان ئامانجێکی مەبەست لەپشت ئەو پرۆسە شۆڕشگێڕانەوە بێ. ئەگەر بیرۆکەی هەڵبژاردنی سروشتی راست بێ، ئەوا ئاژەڵ و رووەکەکان و مرۆڤ خۆیشی، بەهۆگەلێکی سروشتی، کوێر و لەخۆوە، بەم حاڵەی ئێستا گەیشتوون، رێك وەك ئەوەی روو دەدات بۆ پێکهێنانی شێوەی چیا، یان وادەکات زەوی و هەسارەکانیتر لە خولگەیەکی هێلکەییدا بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە. ململانێیەکی کوێرانە بۆ مانەوە روودەدات، پرۆسەی بۆماوە خۆبەخۆ روودەدات بۆ

هەڵبـژاردنی لـەبارترین جۆرەکـان بـۆ مانـەوە و پەرەسـەندنی رەگـەزەکان بـەرەو پێشەوە.

کتێبەکەی داروین وای لێکردین بتوانین پێگەی مرۆڤ و شارسـتانێتی ئێسـتامان لـە رۆشناییەکی راستەقینەدا ببینین. مرۆڤ کاڵایەك نیە دروستکردنی تـەواو بووبێـت و پێشـکەوتنی زیـاتر نـەبێ. ئـەو مێژوویـەکی دوور و درێـژی لەپشـتەوەیە، نـەك مێژوویەك بەرەو پاشەکشە و دابەزین، بەڵکو بەرەو هەڵزنان. بەردەمیشی واڵایە بۆ پەرەسـەندنی زیـاتر بـۆ پێشـەوە. زیـاد لـەوەیش، لەبـەر تیشـکی پەرەسـەندندا پێویستە فێر بین پشوودرێژتر بین بەبەراورد بەو ملیۆن ساڵەی مرۆڤ لەسـەر زەوی ژیاوە و ئەو هەزار ملیۆن ساڵەی بۆ پێشکەوتنی ژیانی پێویستە. دەتـوانین زیـاتر دامێـنگیری پشـوودرێژی بـین کاتێـك فەلەکناسـان ئـەوە دووپـات دەکەنـەوە کـە لانیکەم هەزار ملیۆن ساڵێترمان لەبەردەمدایە تا بەرەو وێنەیتری بـاڵاتری نـوێ بـۆ پێشەوە پەرە بسێنین.



## ١٥- "لێکدانەوەی خەون"
## سیگمۆند فرۆید Sigmund Frued
### دنیای نەست

هەموولا لەوەدا کۆکن کە دەروونناسی لە باقیی لقەکانی زانست جیاوازە لەوەی لە هەموویان تەمومـژاویتر و بەلوغزتر و لـە هـەموویان کـەمتر قابیلیـەتی سـەلماندنی زانسـتیانەی تێدایـە، لەبەرئـەوەی زانـای دەروونناس کـار لەسـەر تەمومـژاویترین دیـاردە سروشـتیەکان دەکـات. هـەر تیۆرێـك لـە کیمیـا یـان فیزیـادا دەکـرێ بـە تاقیکردنەوە ساغ بکرێتەوە و بسـەلمێ، بـەڵام تیۆرەکـانی بـواری دەروونناسـی وا نین. لێرەوە بوو مشتومڕێکی توند لەنێوان سیگمۆند فرۆیـد و دەروونشـیکارەکان سەری هەڵدا کە ماوەی زیاتر لە شەست ساڵی خایاند.
تیۆرەکانی فرۆید قابیل بە سەلماندن بن یـان نـا، کاریگـەریی قـووڵ و بێهاوتایـان لەسەر بیری نوێ هـەبووە. تەنانـەت ئەنیشـتاین خۆیشـی وەك فرۆیـد دەسـتی بـۆ شـێوەی بیرکردنـەوەی هاوسـەردەمەکانی نـەبرد و دەسـتی لـە ژیانیـان وەرنـەدا. فرۆید کۆمەڵێ بیرۆکە و زاراوەی لە بازنەی ناوچە نەناسراوەکانی عەقڵدا داڕشـت، کە بوونە بەشێك لە ژیانی رۆژانەمان. هەموو بوارەکانی مەعریفە، ئـەدەب و هونـەر و ئاین و ئەنترۆپۆلۆژیا و فێرکـردن و یاسـا و کۆمەڵناسـی و تاوانناسی و مێـژوو و مێژووی ژیانی تاکەکان و توێژینـەوەکانیتر لەسـەر تـاك و کۆمەڵگە، هەسـتیان بـە کاریگەریی رێنماییەکانی ئەو کرد.
سـەرباری هـەموو ئـەوەیش، هەنـدێ شـیرینی و رونـاکی لـەو رێنماییانـەدا هەیـە. رەخنەگرێك دەڵێ:

"کاتێ تیۆرەکانی فرۆید دەرکەوتن، بەلای مرۆڤی ئاساییەوە وەك گەورەترین خۆشی تێکدەر لە مێژووی فیکری بەشەریدا دەرکەوت. گاڵتە و شادیی مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ چەپاندنێکی خەمناك و نامۆ. لە ریشەی خۆشەویستیدا دوژمنایەتی و لە ریشەی نەرم و نیانیدا رق و کینە، لە خۆشەویستیی رۆڵەدا زیناکردن لەگەڵ مەحرەمان، لە بەخشندەیی و رقی چەپێنراو لە باوك تاوانکاری دەبینێ وەك تەبیعەتێکی ئاسایی و بۆماوەی مرۆڤ".

لەگەڵ ئەوەیشدا بەهۆی فرۆیدەوە، ئەمڕۆ خەڵك بیرۆکەیان لەبارەی خۆیانەوە جیاوازە. باوەڕیان وایە بیرۆکەکانی فرۆید وەك بنچینەی جینسیانەی تێکچوونی ئەرکەکانی دەمار، بوون و گرنگیی غەریزەی جینسی لای منداڵ، ئەرکی خەونەکان، گرێی ئۆدیب، چەپاندن و بەرەنگاریکردن و خوێندنەوەی بیر، شتی ئاساین. پاشان عەیبەکانی مرۆڤ وەك هەڵکەوتنەکانی زمان و لەبیرچوونی ناوەکان و نەبوونی توانای بیرکەوتنەوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، کاتێك لە روانگەی فریدەوە سەیر بکرێن گرنگیەکی نوێ وەردەگرن. ئێستا ئاستەمە دەرك بە ئەندازەی ئەو دەمارگیرییە بکرێ کە دەبوو فرۆید لەکاتی بڵاوکردنەوەی تیۆرەکانیدا بەسەریاندا زاڵ ببێ. ئەوە زۆر توندتر بوو لەوەی کۆپەرنیکۆس و داروین دووچاری بوون.

کاتێ فرۆید لە فرایبێرگ کە یەکێکە لە شارەکانی مۆراڤیا، لەدایك بوو، هێشتا کتێبی "بنەچەی رەگەزەکان"ی داروین دەرنەکەوتبوو. ئەوە ساڵی ١٨٥٦ بوو. باپیرانی فرۆیدیش وەك باپیرانی کارل مارکس حاخام بوون. بەلام فرۆید، بەپێچەوانەی فرۆید گوتی "بەجولەکە مامەوە".

فرۆید لە تەمەنی چوار ساڵیدا لەتەك ماڵباتەکەی چووەتە ڤیەنا و منداڵی لەوێ بەسەر برد. بەگوتەی گرنگترین ژیانووسی ئەو، کە ئێرنێست جۆنزە، فرۆید "لە گومانە دانایانەکەی لە تەقلەدانەکانی ژیان، لە نەریتی گێڕانەوەی چیرۆکێکی

یەهودی لەکاتی باسکردنی بنەمایەکی ئەخلاقیدا، هەروەها لە باوەڕنەبوونی بە مەسەلەکانی ئاین" قەرزاری باوکی بووە، کە بازرگانی خوری بووە.

دایکی فرۆید تا تەمەنی ٩٥ ساڵی ژیا و هێشتا کەسێکی پڕ چالاکی و بزۆز بوو. سیگمۆند فرۆید منداڵی نۆبەرە و کوڕە خۆشەویستەکەی بوو. پاش ئەوە فرۆید دەنووسێ "ئەو مرۆڤەی نازداری بێ رکابەر بێ لەلای دایکی، بەدرێژایی ژیانی هەست بە هەستەکانی مرۆڤی زاڵ دەکا، ئەویش متمانەبوونە بە سەرکەوتن، کە زۆربەی جار هاندەر دەبێ بۆ سەرکەوتنی راستەقینە".

فرۆید لە سەرەتای ژیانیدا شەیدای تیۆرەکانی داروین بوو، لەبەرئەوەی هەستی دەکرد ئەو بیردۆزانە "ئومێدگەلێکیان بۆ پێشکەوتنێکی ناوازە بۆ تێگەیشتنمان لە جیهان لێ دەخوێنرێتەوە". حەزی لێ بوو ببێتە پزیشك و پەیوەندی بە زانکۆی ڤیەناوە کرد بۆ خوێندنی پزیشکی و ساڵی ١٨٨١ بەکارلۆریۆسی بەدەست هێنا. کاتێکیش وەك پزیشکی نیشتەجێ (موقیم) لە نەخۆشخانەی گشتی دامەزرا، لە توێژینەوە لە زانستی دەمار و توێکاریی مێشك بەردەوام بوو. دوای چەند ساڵێك بەختی گۆڕا و ناوبانگێکی جیهانی پەیدا کرد. هاوڕێیەکی لەگەڵی چوو بۆ پاریس تا لەژێر فەرمانی جان شارکۆ کار بکات، کە ئەو کاتە مامۆستایەکی فەرەنسیی زۆر بەناوبانگ بوو لە زانستی نەخۆشی و پسپۆڕ لە دەماردا، بەوە توانی لەنزیکەوە ئاگای لە کارەکانی شارل لە هیستیریا و چارەسەرکردنی نەخۆشیەکە بە خەواندنی ئیحائی بێ. ئەوەی بۆ فرۆید مایەی سەرسامی بوو شارکو راستیی دیاردە هیستیریەکان و زۆر روودانی لە پیاوان، هەروەها روودانی ئیفلیجیی هیستیری و گرژوونی هیستیریانەی دەمارەکان لەڕێی خەواندنی ئیحائیەوە" و لێکچوونی لە رواڵەتدا بەگشتی بە نۆرەکانی هیستیریای راستەقینەی دەسەلماند.

بەڵام کاتێك فرۆید گەڕایەوە ڤیەنا، نەیتوانی پزیشکە هاوڕێکانی بە بوونی هیچ بنەمایەکی زانستیانە بۆ چارەسەری شڵەژانە دەماریەکان (الاضطرابات العصبية)

لەڕێی خەواندنی موگناتیسیەوە. لەوە بەدتر، ئەوە بوو بەهۆی بۆچوونە پەرگیرانەکانیەوە لە کارگەی توێکاریی مێشك دوور خرایەوە. لەوکاتەوە بوو بە کەسایەتیکی گۆشەگیر و لە ژیانی ئەکادیمی پاشەکشەی کرد و لە ئامادەبوونی کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی زانایان دابڕا. لەکاتی کارکردنی تایبەتی خۆی وەك پزیشك، چەند ساڵێك لەسەر ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بە خەواندنی موگناتیسی بەردەوام بوو، بەڵام وردە وردە دەوری چۆڵ بوو لەبەرئەوەی تەنها ژمارەیەکی کەم لە خەڵك دەچوونە ژێر باری ئەزموونەکانی، هەروەها لەبەرئەوەی خەواندنی موگناتیسی خۆیشی هەندێ جار ئاسەواری دڵتەزێن لەسەر ئەو کەسەی دەیخەوێنێ دروست دەکات. هەربۆیە ئەوەی گۆڕی بە پەرەپێدانی رێگەکانی ناسراو بە "بەشداریی ئازاد" (المشارکة الحرة) کە لەوکاتەوە بوو بە پیشەی شیکردنەوەی دەروونیی ئەسڵی.

حاشاهەڵنەگرە کە فرۆید دامەزرێنەری پزیشکیی نوێی نەخۆشییە عەقڵیەکانە. بەر لە سەردەمی ئەو، پزیشکیی نەخۆشییە عەقڵیەکان کاری لەسەر نیشانەکانی شێتی دەکرد، وەك قڵیشبوونی لوت و نەخۆشیی عەقڵی شێتانەی دابەزیو، کە پێویستی بە دابڕین لەنێو نەخۆشخانەی نەخۆشییە عەقڵیەکاندا. فرۆید کارە ئیکلینیکەی بە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی چەپاندن و ململانێی دەماری (التنازع العصبی) دەست پێکرد. هەر زوو گەیشتە ئەو ئەنجامگیریەی کە ئەو ململانێیانە تەنیا تووشی نەخۆشەکانی دەمار نابن، بەڵکو دووچاری عەقڵ ساغەکانیش دەبن. زیاد لەوەیش، شڵەژانە دەماریەکان لەڕاستیدا نەخۆشی نین، بەڵکو هەندێ حاڵەتی دەروونیی عەقڵن. کێشەی گەورە چۆنێتیی چارەسەری ئەو شڵەژانە عەقڵییە بەربڵاوەیە. لەسەر بنچینەی تێبینی و ئەزموون و چارەسەرکردنی زۆر نەخۆش لە ڤیەنا، بنەماکانی شیکردنەوەی دەروونی یان دەروونشیکاری لە کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە دامەزاند.

فرۆید یەکێك بوو لەو نووسەرە مەزنانەی بواری زانستی کە نووسینی زۆرە. ناتوانین سەرجەم ئەو بیرۆکە تازە و بۆچوونە سایکۆلۆژیانەی نووسیونی، لە هیچ تاکە کتێب یان بڵاوکراوەیەکدا ببینینەوە. ڕەنگە یەکەم کتێبی، کە کتێبی مەزنی "لێکدانەوەی خەونەکان"ـە و لە ساڵی ١٩٠٠ دەرچووە، خۆشەویستترین کتێب بووبێ لە دڵی خۆیدا، کە نزیکەی تەواوی تێبینی و بۆچوونە بنچینەییەکانی لەخۆ گرتووە. لە یەکێك لە کتێبە بەراییەکانیدا بەناونیشانی "چەند توێژینەوەیەك لە هیستیریا" و ساڵی ١٨٩٥ دەرچووە، باوەڕی خۆی دەربڕیوە بەوەی کە شڵەژانە سێکسیەکان "فاکتەری بنچینەیی و گرنگترین هۆی شڵەژانە دەماری و شڵەژانە دەمارییە دەروونیەکان"ـە، کە بەردی بناغەیە لە تیۆری شیکردنەوەی دەروونی. لە ساڵە کەمە بەراییەکاندا، فرۆید بۆچوونەکانی لەبارەی بەرەنگاری و گواستنەوەی هزر و کێشەکانی سێکس لە سەردەمی منداڵی و پەیوەندیی نێوان یاداوەرییە دزێوەکان و وەهمەکان و میکانیکیەتی بەرگری و چەپاندن، نووسی.

پوختەیەکی کورتی تیۆرە سیاسیەکان هەندێ ئاڵۆزیی شیکردنەوەی دەروونی روون دەکاتەوە. یەکەم شت وشەی (نەخۆشیە عەقڵیەکان) و وشەی (نەخۆشیە عەقڵییە دەروونیەکان) هاومانا نین. دەکرێ نەخۆشییە عەقڵییە دەروونیەکان بە لقێك لە نەخۆشیە عەقڵیەکان دابنرێ و بەگشتی لەسەر سەختترین حاڵەتەکانی شڵەژانە دەماری و دەروونیەکان جێبەجێ دەکرێن. بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی نوێ، لەنێو چوار هەزار پزیشکی دەروونی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنیا سێسەد پسپۆڕیان لە شیکردنەوەی دەروونی تێدایە.

چارەسەری تاکەکەسی بەدەگمەن نەبێ بەلای فرۆیدەوە پەسەند نەبووە و حاڵەتەکانی خراپ پێکهێنانی دەروونیی تاکەکان، وەك نیشانەی کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەنی و کەلتووریی جیهانی هاوچەرخ داناوە. مەبەستی ئەوە بوو لە ریشەوە لە نەخۆشی بدات.

زۆربەی رەخنەگران کۆکن لەسەر ئەوەی ناوبانگی فرۆید پشت بە دۆزینەوە و رۆچوونە نێو عەقڵی ناهۆشیار (العقل غیر الواعی) دەبەستێ. فرۆید عەقڵی مرۆڤی بە چاخێکی بەستەڵەك بەراورد کرد، کە لە دە بەش هەشت بەشی لەژێر رووی دەریاکەدایە و تەنیا دوو بەشی ئەوەیە لەبەرچاوە. ئەو پێی وابوو زۆربەی عەقڵ لەنێو عەقڵی ناهۆشیاردا شاراوەیە. لەژێر رووەکەدا کۆمەڵێ پاڵنەر و هەست و مەرام هەن کە مرۆڤ نەك هەر لە کەسانیتریان دەشارێتەوە، بگرە لە خۆیشیان دەشارێتەوە.

دەروونناسیی فرۆیدی دەڵێ عەقڵی ناهۆشیار زاڵە، لەکاتێکدا چالاکیی عەقڵی هۆشیار لە ناوەندێکی شوێنکەوتەدا کورت دەبێتەوە. کاتێك توانیمان لە قووڵاییە گەورە و نەزانراوەکانی عەقڵی ناهۆشیار تێبگەین، سروشتی ناوەکیی مرۆڤ دەناسین. فرۆید دەڵێ زۆربەی بیرکردنەوەمان ناهۆشیارانەیە و مەگەر بەرێکەوت ببێتە هۆشیارانە. عەقڵی ناهۆشیار سەرچاوەی شڵەژانە دەمارییەکانە، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەوڵ دەدات یاداوەرییە ناخۆشەکان و حەزە نادروستەکانی بخزێنێتە ئەو ناوچەیە، بەڵام تەنها دەتوانێ بیپارێزێ، بۆ سەرێشەکانی ئایندە.

فرۆید چالاکیی زەینی تاك بۆ سێ ئاست دابەش دەکات کە ناویان دەنێ: ئاید ID (کورتکراوەی وشەی Idioplasmە کە بریتیە لە یەکەی بۆماوەیی یان پلازمای بۆماوەیی لە ناوکدا)، خود Ego و خودی باڵا Super Ego). ناو ئاید بایەخی پلە یەکی هەیە. فرۆید دەڵێ "ناوچەی کارکردنی ئاید بەشە تاریکەکەی کەسایەتیمانە کە ناتوانین پێی بگەین. ئەو شتە کەمەی دەربارەی زانیومانە، لەرێی لێکۆڵینەوە لە خەونەکان و پێکهاتەی نیشانەکانی شڵەژانە دەروونیەکانەوە زانیومانە". ئاید ناوەندی غەریزە و هەڵچوونە بەراییەکانە و بۆ دواوە، بۆ رابردووی ئاژەڵیمان، پەل دەکێشێ، کە رابردوویەکی بەسروشت ئاژەڵی و سێکسییە. ئەو ناهۆشیارانەیە. فرۆید دەڵێ "ئاید هەموو شتێکی بۆماوە و هەموو ئەوەی لەکاتی

لەدایکبووندا هەیە و هەموو ئەوەی لە پێکهاتـەی کەسـەکەدا چەسـپاوە، تێدایـە".
ئاید کوێر و هەڵەشەیە و هەموو مەبەستی بەدیهێنانی حـەز و چێژەکانیەتی بـەبێ حسابکردن بۆ ئاکامەکان.

تۆماس مان گوتەنی "هیچ بەهایەك و هیچ خێر و شەڕ و هیچ ئەخلاقێك نازانێ".
منداڵی تازە بوو نموونەی ئایدە. وردە وردە لەکاتی گەشەی منداڵدا لـە ئایـد-ەوە خود گەشە دەکات. خـود لـەباتیی ئـەوەی بەتـەواوی ملکەچـی بنـەمای چـێژ بـێ، بنەمای حەقیقەت بەڕێوەی دەبات. خود هەست بە جیهـانی دەوروبـەری دەکـات و دەزانێ دەبێ حەزە سەرکەشەکانی جڵەو بکات تا یاساکانی کۆمەڵگـە نەشـکێنێ و وەك فرۆیـد دەڵـێ: خـود ناوەنـدە "لـەنێوان خواسـتە سەرچـڵەکانی ئایـد و حەرامکردنی جیهانی دەرەکی"دا. بەم پێیە خود (خود پێیشی دەوترێ: من) وەك چـاودێرێك بەسـەر پاڵنـەرەکانی ئایـدەوە کـار دەکـات و بـەگوێرەی هەلۆێسـتە راسـتەقینەکان دەیگـونجێنێ و دەرك بـەوە دەکـات کـە خـۆلادان لـە سـزا یـان خۆپاراستن لەوانەیە پشت بەم جۆرە چەپاندنە ببەستێ. لەوانەیشـە لەئـەنجامی ململانێـی نێـوان خـود و ئایـد، هەنـدێ شـڵەژانی دەمـاری روو بـدات کـە کـار لـە کەسایەتیی تاك دەکەن.

دواین شت رەگەزی سێیەمە لە پرۆسەی زەینیـدا، ئـەویش خـودی بـاڵا (بـەکوردی پێشی دەوترێ: بەرزە من)ـە، کە دەکرێ بـە هـۆش (الـوعي) پێناسـە بکرێ. أ.أ. بریـڵ کـە گـەورەترین لایـەنگری فرۆیـدە لـە ئەمـەریکا دەڵـێ "خـودی بـاڵا پێشکەوتووترین پەرەسەندنی زەینییـە کـە بکـرێ مرۆڤ پێـی بگـات و پێکدێ لـە نیشـتەنیی هـەموو حـەرامکراوەکان و هـەموو رێسـا کەسـایەتیەکان کـە بـاوان لـە منداڵیدا دەچەسپێنن. هەستکردن بە هۆش بەتەواوی پشت بە گەشەی خودی بـاڵا دەبەستێ".

خـودی بـاڵایش لـە ئایـد دەچـێ لـەوەدا کـە ناهۆشـیارانەیە و هـەردووکیان لـە ململانێیەکی بەردەوامـدان و خـود وەك ناوبـژیوان لەنێوانیانـدا کـار دەکـات. بـەها ئەخلاقی و رێساکانی سلوك لەنێو خودی باڵادا خۆیان حەشار داوە.

کاتێ ئاید و خود و خودی بـاڵا لـە تەباییـەکی گونجـاودا بـن، تـاك مێشـك سـاف و ئاسوودە و بەختەوەر دەبـێ. بـەڵام ئەگـەر خـود رێگـەی بـە ئایـد دا یاساشـکێنی بکـات، خـودی بـاڵا دڵـەراوکێ و هەسـتکردن بـەگوناه و دیـاردەیتری هۆشـیارانە دروست دەکات.

فاکتـەرێکیتر هەیـە کـەمێك لـە ئایـد دەچـێ و فرۆیـد دۆزیـەوە، تیۆرەکـەی بـوو دەربـارەی ئـارەزووی سـەرکەش (الشـهوە الجامحـە) Libidoo دەڵـێ: هـەموو هەڵچوونەکانی ئاید بارگاوین بە وێنەیەك لـە "چـالاکیی دەروونـی" کـە نـاوی نـاوە Libidoo واتـــە ئـــارەزووی ســـەرکەش "جەوهـــەری رێبـــازی شـــیکردنەوەی دەروونی". هەموو ئەوەی مرۆڤ فێری دەبێ لە کەلتور و هونەر و یاسـا و ئـاین، لـە پەرەسەندنەکانی ئارەزووی سەرکەشن. لەکاتێکدا وەك چالاکیەکی سێکسی ئاماژە بۆ ئەم ئارەزووە دەکرێ، لەڕاستیدا وشـەی "سێکسـی" بـە مانایـەکی زۆر فـراوان بەکار دەهێنرێ، بەشێوەیەك لە حاڵەتی منداڵـە تازەبووەکانـدا هەنـدێ کـاری وەك مـژینی پەنجەگـەورە و شـیرخواردن و پیسـاییکردن دەگرێتـەوە. لـە سـاڵەکانی پاشتردا لەوانەیە ئارەزووەکە لەرێی هاوسەرگیریەوە بـۆ کەسـێکیتر بگوێزێتـەوە و شێوەی لادانێکی سێکسی وەربگرێ، یان بە داهێنانێکی هونەری یان ئـەدەبی یـان مۆسیقی گوزارشـتی لێبکـرێ. ئەمـەیش پرۆسـەیەکە بـە "جێگرتنـەوە" (الاحـلال) دەناسرێ. بەلای فرۆیدەوە غـەریزەی جینسـی گـەورەترین سەرچـاوەیە بـۆ کـاری داهێنەرانە.

فرۆیـد لـە جێمشـتومڕترین تیۆرەکـانی شیکردنەوەی دەروونیـدا پێـی وایـە لـەژێر کاریگەریی ئارەزووی سێکسیدا هەندێ هەسـتی سێکسـی بەرانبـەر بـاوك و دایکـی

لەلای منداڵ دروست دەبێ، کە سەرەتا بە یەکەمین چێژە سێکسیەکان کە لە خواردن لەرێی مەمکی دایکیەوە دەست پێدەکات و منداڵ پەیوەندیەکی خۆشەویستی بەدایکیەوە دەبێ. کاتێك تەمەنی زیاد دەکات، بەڵام لە تەمەنێکی زوودا، لای منداڵی نێرینە هەڵچوونی سێکسی گەورە بەرانبەر دایکی دروست دەبێ، هاوکات رقی لە باوکی دەبێت و وەك رکابەرێك لێی دەترسی. هەرچی منداڵی مێینەیە لەوانەیە لە پەیوەندییە نزیکەکەی لە دایکی دوور بکەوێتەوە و بکەوێتە خۆشەویستیی باوکی، لەبەرانبەردا رقی لە دایکی بێتەوە و بە رکابەری بزانێ. بەجێبەجێکردنی ئەم تیۆرە لەسەر منداڵی کوڕ، ناوی دەنێ "گرێی ئۆدیب" کە ناوەکەی لە کەسایەتیەکی ئەفسانەیی گریکیی کۆن بەناوی "ئۆدیب" وەرگیراوە کە باوکی خۆی دەکوژێ و دایکی دەخوازێ.

فرۆید دەڵێ: گرێی ئۆدیب لە پێشینە بەراییەکانمانەوە ماوەتەوە کە لە شۆڕشەکانی غیرەدا باوکیان کوشتوون. کاتێکیش مرۆڤی سروشتی دەگاتە قۆناغی پێگەیشتن پاڵنەرە ئۆدیبیەکان تێیدا گەشە دەکەن. بەڵام تاکە لاوازەکان لەوانەیە بەهیچ شێوەیەك سەرکەوتوو نەبن لە پچڕینی پەیوەندی بە باوانیانەوە، لەبەرئەوە ملیان دەبێ بە ملی کۆمەڵێ شڵەژانی دروونیەوە.

لەڕاستیدا فرۆید پێی وایە "شڵەژانە دەروونیەکان، بەبێ جیاوازی، شڵەژانن لە وەزیفەی جینسیدا". هەبۆیە نابێ ئۆباڵی هاوسەرگرییە شکستخواردووەکان یان کاروبارەکانی ئەویندارییی سەرنەکەوتوو لای پێگەیشتووان، بخرێتە گەردنی شڵەژانە دەماریەکان. بەڵام دەکرێ هەموو ئەمان بدرێنە پاڵ گرێ دەروونیەکانی قۆناغی سەرەتای منداڵی.

بە پراکتیزەکردنی تیۆرەکەی لەسەر بواری زانستی رەگەزە مرۆییەکان (ئەنترۆپۆلۆژیا)، فرۆید گەیشتە ئەو ئەنجامگیریەی کە سروشت و ئەفسانە ئاینیەکانی مرۆڤی سەرەتایی بەرەنجامی گرێکانی دایك و باوکن. باوەڕیشی وابوو

ئاین هیچ نیە جگە لە گوزارشتکردن لە گرێی ئۆدیب. پاش شیکردنەوەی سەدان حاڵەت کە بۆ چارەسەر هاتبوونە بەردەستی، پایەی غەریزەی سێکسی و حەزە سێکسیەکان و رۆڵیان لە پێکهێنانی کەسایەتیدا زۆر بەرز کردەوە و بەهۆی سەرەکیی شڵەژانە دەماریەکانی دانا. ئەمەیش بڕیارێکە هەندێ لە گەورە پسپۆڕانی دەروونشیکاری رەتیان کردۆتەوە، وەك پاشتر روونی دەکەینەوە.

کاتێ کۆمەڵگە تاك ناچار دەکات زۆر لە حەزە قووڵەکانی بوەستێنێ، ئەوا بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە چەپاندنێکی زۆر لە دەروونیدا هەڵدەگرێ. ئەگەر زاراوەکانی فرۆید بەکار بێنین: هۆشی مرۆڤ سەرکەوتوو دەبێ لەوەی رێگە لە "هێزە تاریکەکانی ناهۆش (لاوعي)" کە چەپێنراون و رووشکێن کراون، بگرێ جارێکیتر دەربکەونەوە. سەرباری ئەمەیش، لەوانەیە ئەو کەسانەی تووشی شڵەژانی دەماری بوون ناوبەناو بەهۆی ئەم چاودێریکردنەوەوە بەدەست شڵەژانی عاتیفیەوە بناڵێنن. فرۆید دەڵێ "ئەرکی چارەسەرکردن بە شیکردنەوەی دەروونی ئەوەیە حاڵەتەکانی چەپاندن بدۆزێتەوە و لەجێگەیان حاڵەتی حوکمی دروست دابنێ، کە دەشێ پەسەندکردن یان وەلاخستنی ئەوەی لێبکەوێتەوە کە پێشتر رەفز کراوە. بەهۆی سروشتی بەئازاری مادە چەپێنراوەکە، عادەت وابووە کە نەخۆش هەوڵ دەدات رێگە لە دۆزینەوەی چەپاندنەکەی بگرێ". فرۆید بەم کۆششانە دەڵێ "بەرەنگاریەکان" و پزیشك دەیەوێ بەسەریاندا زاڵ بێ.

ئێستا ئەو رێگەیە باس دەکەین کە فرۆید بۆ مامەڵەکردن لەتەك چەپاندن و بەرەنگاریەکان دایهێناوە، کە بە "بەدوایەکداهاتنی ئازادی بیرۆکەکان" (التسلسل الحر للافکار) دەناسرێ. لێشاوێکە لە قسەی عەقڵی هۆشیار لەرێی نەخۆشێکەوە کە لەسەر تەختەی پسپۆڕێکی شیکردنەوەی دەروونی لە ژوورێکی روناکی کزدا راکشاوە. نەخۆش هان دەدات هەرچی بەخەیاڵیدا دێ بیڵێ بەبێ ئەوەی هیچ ئاراستەیەکی هۆشیارانە بە بیرەکانی بدات.

فرۆید پێی وایە شێوازی "بەدوایەکداهاتنی ئازادی بیرۆکەکان" تاکە ڕێگەی بەکارە بۆ چارەسەری شڵەژانی دەمار و ئەوەی بەدیهێنا کە لێی چاوەڕوان دەکرا، ئەویش دەرخستنی مادە چەپێنراوەکەیە بۆ وێنە هۆشیارانەکەی، ئەو مادەیەی بەرەنگاریەکان دەستبەسەریان کردبوو.

برێل لەبارەی ڕێگەکەی فرۆید لەگەڵ نەخۆشەکان دەڵێ "هانیدەدان هەر کاردانەوە (انعکاس)یەکی هۆشیارانە دەربخەن و خۆیان بدەن بەدەم تەرکیزی هێمنانەوە، شوێن ڕووداوە زەینییە خۆبەخۆکان بکەون و هەموو شتێکی بۆ بدرکێنن. بەو شێوەیە سەرەنجام ئەو بیرۆکانەی بەدەست هێنا کە ئازادانە بەدوای یەکدا دەهاتن و بەرەو ئەسڵی نیشانەکانمان دەبا".

ئەو مادە لەبیرکراوەی نەخۆش لە عەقڵی ناهۆشیاری لە ماوەیەکدا کە دەشێ بگاتە چەندین مانگ لە چارەسەری شیکردنەوەی دەروونی، دەریدێنێ، واباوە شتێکی ئازاربەخش و دزێو و ترسێنەر و ناشیرینە لە رابردوو، کە نەخۆش حەز ناکات لە باری هۆشیاریدا بیری بکەونەوە.

لەم جۆرە پرۆسەیەدا، بەدڵنیاییەوە ئەو یاداوەرییە کەڵەکەبووانە بڕێکی زۆر زانیاریی نەگونجاو و بێکەڵکیان تێدایە. کەواتە هەموو شت لەسەر توانای پزیشك بۆ شیکردنەوەی مادەکەی لە رووی دەروونیەوە وەستاوە، ئەو مادەیەی، وەك زۆر لە رەخنەگران باسی دەکەن، دەکرێ بە ڕێگەی بێشومار تەفسیری بۆ بکرێ. لەبەرئەوە لەو بارەدا زرنگی و لێهاتوویی پسپۆڕی شیکردنەوەی دەروونی بایەخێکی زۆر بنچینەیی هەیە.

فرۆید لەرێی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی بەرێگەی شیکردنەوەی دەروونی، شتێکی دۆزیەوە کە ناوینا "هۆکارێکی گرنگ کە خەونی پێوە نادیترێ"، ئەوەیش پەیوەندییەکی توندی عاتیفییە لەنێوان نەخۆش و پزیشکە شیکارەکە، کە پێی دەوترێ "خوێندنەوەی بیرۆکەکان یان گواستنەوەی بیرۆکەکان".

"دەكرێ خوێندنـەوەی بیرۆكـەكان لـەنێوان دوو كۆتاییـدا جیـاواز بـێ، یـەكێكیان خۆشەویسـتیەكی عـاتیفیی خـاوەن سـیفەتێكی سێكسـیانەی تـەواوە. ئـەویتریان دەربڕینێكی لەجڵەو دەرچووە لە گڕبەری و ڕقی تاڵ". لـەم هەڵوێسـتەدا پزیشـكە دەروونشیكارەكە "وەك بنەما، لە شوێنی یـەكێك لـە دایبـابی نەخۆشـەكە دەبـێ، بـاوكی یـان دایكـی". فرۆیـد خوێندنـەوەی بیرۆكـە بـە "چـاكترین ئـامراز بـۆ چارەسەری دەروونی" دادەنێ، بەڵام بەكارهێنانی سەختترین و گرنگترین بەشە لە هونـەری جوانكردنـدا. فرۆیـد بـاوەڕی وایـە كێشـەكە "چارەسـەر دەبـێ، بـەوەی نەخۆش قەناعەت پـێ بكرێ كـە ئـەو جـارێكیتر مومارەسـەی هەنـدێ پەیوەنـدیی سۆزداری دەكاتەوە كە لە سەرەتای منداڵێتیی ئەودا پەیدا بوون".

یـەكێكیتر لـەو ڕێگـە بەرهەمدارانـەی فرۆیـد بـۆ گەیشـتن بـە ململانـێ و سـۆزە ناوەكیەكان دایهێناوە، شیكردنەوەی خەونە و ئەو یەكەم كەس بوو پێی گەیشت، چونكە پـێش ئـەو خـەون بـە شـتێكی بـێ مانـا و بـێ ئامـانج دادەنـرا. كتێبەكـەی "لێكدانەوەی خەون" یەكەم هەوڵ بوو بۆ لێكۆڵینەوەیـەكی زانسـتیانەی نـوێ لـەو دیاردەیە. فرۆید پاش سی و یەك ساڵ لە بڵاوكردنەوەی كتێبەكە، سـەرنجی خـۆی دەربڕی، بەوەی كتێبەكە "تا ئەم ڕۆژە گەورەترین دۆزینەوەكانی تێدایە كە بەخت یاوەری بووە بۆ دۆزینەوەی و بەنرخترینیانە".

بەگوتـەی فرۆیـد "بۆمـان هەیـە جـەخت لـەوە بكـەین كـە خـەون ئەنجامـدانێكی بەردەوامی حەزێكی چەپێنراوە". هـەر خـەونێك درامایەكـە لـە جیهـانی ناوەكیـدا "خەونـەكان هەمیشـە ئـەنجامی ململانێیـەكن". فرۆیـد دەڵـێ "خـەون پاسـەوانی نووستنە" و ئەركی یارمەتیدانە لە نووستن نەك بێزاركردنی، بەوەیش بـەر بـۆ ئـەو گرژییانە شل دەكات كە بەرهەمی ئەو ئارەزووانەن كە بەدینایەن.

بەبڕوای فرۆید، جیهانی خەون لـەژێر دەسـەڵاتی عـەقڵی ناهۆشـیاردایە لـە یەكـەی بۆمـایی (ئایـد)دا. خـەون بـۆ پسـپۆڕی دەروونشـیكاری گرنگـە، لەبەرئـەوەی

دەیگەیەنێتە عەقڵی ناهۆشیاری نەخۆش. ئەو عەقڵە ناهۆشیارە كانگەی هەموو ئەو حەزە بەرایی و حەزە عاتیفیانەیە كە بەهۆی خود و خودی باڵاوە، لە ژیانی هۆشیاردا چەپێنراوان. حەزە ئاژەڵیەكان هەمیشە لەژێر رووەوەن و لەكاتی خەوندا خۆیان دەردەخەن، تەنانەت لەكاتی خەوتنیشدا هەر یەك لە خود و خودی باڵا (من و بەرزە من) وەك دوو پاسەوان چاودێری دەكەن. لەبەرئەوەیە ماناكانی خەون هەمیشە روون نین، بەڵكو لە شێوەی هێمادا دەردەكەون كە لێكدانەوەیان پێویستی بە كەسی پسپۆڕ هەیە. ناكرێ رەمزەكانیش بەمانا حەرفیەكەیان وەربگیرێن مەگەر لە خەونە سادەكانی منداڵاندا. كتێبی "لێكدانەوەی خەون" چەند نموونەیەكی تێدایە كە فرۆیدا لە رووی دەروونیەوە شی كردوونەتەوە.

یەكێكیتر لە شێوە دەربڕینەكانی عەقڵی ناهۆشیار هێرشە هەڵەكان و ئەو قسانەن بەهەڵە لە زمان دەردەچن و هەروەها فێڵەكانی مێشك جەنجاڵەكانە. فرۆید دەڵێ "پسپۆڕی دەروونشیكاری بەهەمان رێگە سوود لە لێكدانەوەی خەون دەبینێ، هەروەك سوود لەو لەزار دەرچوونە سادە و زۆرانە و ئەو هەڵانەی خەڵك دەیانكەن و بە كاری لەپڕ ناو دەبرێن".

ساڵی ١٩٠٤ فرۆید ئەو بابەتەی لە كتێبی "چارەسەری دەروونیی ژیانی رۆژانە"دا پشكنیوە. تێیدا دەڵێ "ئەم دیاردانە زادەی رێكەوت نین، بەڵكو مانایان هەیە و دەكرێ تەفسیر بكرێن. مرۆڤ دەتوانێ بوونی هەڵچوون و نیازی خەفەكراوی لێ بخوێنێتەوە". لەبیركردنی ناوێك مانای ئەوەیە ئەو كەسە رقی لە خاوەنی ئەو ناوەیە. كاتێك كەسێك بەهۆی لێتێكچوون لە خشتەی مەوعیدەكاندا شەمەندەفەری لەدەست دەچێ، لەوانەیە ئەوە نیشانەی ئەوە بێ حەزی لە سواربوونی نیە. ئەو مێردەی كلیلیماڵەكەی ون یان لەبیر دەكات، لەوانەیە لە ماڵەكەیدا ئاسوودە نەبێ و حەز نەكات بۆی بگەڕێتەوە. دەكرێ وردبوونەوە لەم هەڵانە پسپۆڕی دەروونشیكاری بگەیەنێتە داڵانەكانی عەقڵی ناهۆشیار.

دەکرێ هەمان شت لە نوکتەکانیش بەدەست بێ، کە فرۆید ناوی دەنێ "باشترین دەمەوانەی پاراستنە کە مرۆڤی هاوچەرخ بەرهەمی هێناوە"، چونکە بەهۆیەوە بەشێوەیەکی کاتی لە حاڵەتەکانی چەپاندن رزگار دەبین کە کۆمەڵگە دەیەوێ بیشارینەوە.

رەنگە بەهۆی هەستێکی ئاگەدارکردنەوەی رابردوو، یان هەوڵی رزگاربوون لە خەیاڵاتێکی روو لەزیاد، یان ئەوپەڕی رەشبینیەوە بووبێ کە فرۆید لە کۆتا رۆژەکانی ژیانیدا بە "غەریزەی مردن"ەوە خۆی سەرقاڵ کردبوو، تا کار بەوە گەیشت ئەو بیرۆکەیە لە بایەخدا رێك وەك "غەریزەی جینسی (سێکسی)" دابنێ. فرۆید پێی وابوو غەریزەیەکی مردن هەیە، کە هەموو مادە زیندووەکان بەرەو گەڕانەوە بۆ ئەو حاڵەتە نائەندامیەی لێیەوە هاتبوو پەلکێش دەکات. بەگوێرەی ئەم رایە، مرۆڤ بەردەوام دوو هێز کێشی دەکەن: هێزی هاندان بۆ ژیان کە بریتییە لە غەریزەی جینسی، هەروەها دژە هێزێکیتر کە هاندانە بۆ فەوتان یان لەناوچوون، ئەویش غەریزەی مردنە. بەتەبیعەتی حاڵ، سەرەنجام غەریزەی مردن زاڵ دەبێ. ئەم غەریزەیە بەرپرسە لە جەنگ و لە جۆرەکانی سادیەت وەك دەمارگیری دژی رەگەز و چینەکان و چێژبینینی زۆر لە دادگەییە تاوانکاریەکان و شەڕە گا و لەسێدارەدان بەبێ دادگەییکردن.

ئەمە بەگورتی هەموو خاڵە سەرەکیەکان بوون لە تیۆری فرۆیددا.

ئەمرۆ زانایانی دەروونناسی بۆ دوو یان سێ جەمسەری ناکۆك دابەش بوون، هەندێکیان پشتگیری لە فرۆید دەکەن و هەندێکیتریان بەرهەڵستی دەکەن. تەنانەت قوتابیەکانیشی لە پەنجا ساڵی رابردوودا هەوڵیاندا لە قبوڵکردنی رەهای تیۆرەکانی گۆڕیوە. ئەوەتا ئەلفرێد ئەدلەر Alferd Adler یەکێك لە شوێنکەوتە بەراییەکانی لە بەرەی فرۆید جیا دەبێتەوە لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو فرۆید زیاد لە پێویست جەختی لەسەر غەریزە سێکسیەکان کردۆتەوە. وەك

جێگرەوەی ئەو ڕێبازەیش، ئەدلەر جەخت لەوە دەكات كە حەزی هەموو مرۆڤێك بۆ سەلماندنی سەركەوتنی، چاوگی بنچینەییە لە ڕەفتاری مرۆڤدا.

یەكێك لە جیابووە بەناوبانگەكانیتر كارل یۆنگە Karl Jung كە ئەویش هەوڵیدا لە ڕۆڵی سێكس كەم بكاتەوە.

یۆنگ مرۆڤایەتی بۆ دوو جۆرە دەروونی دابەش دەكات: یەكێكیان هەڵگەڕاوەیە لە ناوەوە بۆ دەرەوە، دووەمیان هەڵگەڕاوەیە لە دیار (ظاهر)ەوە بۆ نادیار (باطن)، ئەگەرچی دەیزانی هەر كەسێك تێكەڵەیەكە لە هەردوو جۆرەكە. بەپێچەوانەی فرۆیدیش یۆنگ جەختی لەسەر گرنگی هۆكارەكانی بۆماوە دەكرد لە پێكهێنانی كەسایەتیدا.

بەگشتی ڕەخنەگرانی فرۆید لە چەند خاڵێكدا لەگەڵی ناكۆكن، لەوانە سووربوونی لەسەر بایەخی یەكەمی شڵەژانە دەروونیەكانی سەردەمی منداڵی و تۆمەتباركردنی خەڵك بەوەی غەریزە بەرابیە توندەكان هەڵیاندەسوڕێنن. هەروەها پێدانی ڕۆڵێكی سەرەكی بە شارەزووی زایەندی (واتە سێكسی) لە پێكهێنانی كەسایەتیدا. هەروەها هەندێ كەس لەوەدا نەیارین كە باوەڕی وایە بەدوایەكداهاتنی ئازادانەی بیرۆكەكان ڕێگەیەكە لە دەستگەیشتن بە عەقڵی نادیار (باطن)دا هەڵە ناكا. بەتایبەت ئەوە زەق دەكەنەوە كە لێكدانەوەی ئەو زانیاریانەی لەو ڕێگەیەوە دەست دەكەون كارێكی ئاستەمە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، وەك یەكێك لە زانایانی دەروون دەڵێ "ئەو گۆڕانكاری و پەرەسەندنانەی لە ماوەی شەست ساڵی ڕابردوودا روویان داوە، بەهیچ شێوەیەك پێگە و هەژموونی فرۆیدیان كەم نەكردۆتەوە. ئەو مەملەكەتی عەقڵی نادیاری كردەوە و ڕوونی كردەوە كە چۆن یارمەتیدەرە لەوەی وامان لێبكات بەم شێوەیە بین كە ئێستا هەین. هەر دەبوو لەبەر تیشكی تاقیكردنەوەی زیاتردا زۆر لە بۆچوون و ئەنجامگیریەكانی دەستكاری بكرێن. دەتوانیت بڵێیت جێگرەوەكانی

ئەو "سەردەمێکی نوێ"یان لە پزیشکیی نەخۆشییە دەروونیەکاندا دەنووسیەوە. بەڵام فرۆید "سەردەمی کۆن"ی نووسیەوە و کارەکەی لەو بوارەدا بە بناغە دەمێنێتەوە".

ئێمە لە تێڕوانینی نوێمان بۆ دیاردەی "شێتی" زۆر قەرزاری فرۆیدین. بۆچوونەکان بەو ئاراستەیە روو لەزیادبوونن کە پێی وایە "نەخۆشانی شلەژانە عەقڵیەکان کەسانی وەك ئێمەن، بگرە زیاتر لەوەیشن وەك ئێمە بن". ئەلیکسەندەر راید مارتین دەڵێ: "چ ئەوە رابگەیەنرێ یان نا، هەموو نەخۆشخانەکانی نەخۆشییە عەقڵی و دەروونیەکان، توخمەکانی دەروونناسیی فرۆیدی و تیۆرە بنچینەییەکانی بەکار دێنن. ئەوەی پێشتر بە جیهانێکی نەناسراو و ترسێنەر و تەمومژاوی و بێ ئامانج و بێمانا دادەنرا، لەڕێی فرۆیدەوە بووەتە جیهانێکی روناك و پڕ مانا و سەرنجڕاکێش و بەچێژ و دانپێدانراو، نەك هەر لە پزیشکیدا، بگرە لە هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا".

بیری فرۆید بەهەمان ئەندازە لەسەر ئەدەب و هونەریش رەنگیداوەتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا بۆچوونەکانی فرۆید لە جیهانی خەیاڵ و شیعر و دراما و باقیی وێنە ئەدەبیەکانیتردا گەشەیان کردووە. لەوبارەوە بێرنارد دی ڤۆتۆ دەڵێ "هیچ زانایەکیتری سروشتی ئەو کاریگەرییە بەهێز و بەبڵاوەی لەسەر ئەدەب نەبووە". قووڵیی کاریگەریشی لەسەر وێنەکێشان و هەڵکۆڵین و جیهانی هونەر بەگشتی کەمتر نەبوو.

سەرژمێرکردنی بەشداریەکانی بلیمەتیی فرۆید لە بنیاتنانی زانیاریەکانمان، لە تیۆر و بۆچوونی هەمەلایەنەدا، کارێکی ئاستەمە، ئەویش بەهۆی فراوانیی بوارە ماندووکەرە قورسەکانی و سروشتی دۆزینەوە فرە ئاراستەکانی. نووسەری ئینگلیزی رۆبێرت هامیلتۆن لە هەوڵێکیدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی بڵێ: "فرۆید زانستی دەروونی لە نەخشەدا دانا. ئەو زانایەکی بدۆز و مەزن بوو، زۆر لە

سەرکەوتنەکەیشی بۆ ناسکی و شێوازە ئەدەبیەکەی دەگەڕێنرێتەوە. سەرباری ئەوەی ڕێگەکەی پشت بە شتێکی بەرهەست نابەستێ، هیچ ڕێگەیەکیتر نیە لە دەرەوەی ئەدەبی رووت کە لەوە چێژبەخشتر و ناسکتر و خاوەن شێوازێکی سەرنجڕاکێش بێ. ئەو وای کرد جیهان لەڕووی دەروونیەوە بیر بکاتەوە، ئەوەیش پێویستیەکی بنچینەییە بۆ سەردەمەکەمان. خەڵکی ناچار کرد کۆمەڵێ پرسیار لە خۆیان بکەن کە بۆ بەرژەوەندییەکانیان گرنگن. لە بابەتە نەزۆکەکانی دەروونناسیی ئەکادیمی سەدەی نۆزدەیەم، دژە تیۆرەکانی لە دەروونشیکاریدا بەرهەم هێنا، بە سەلبیاتە تاریکەکانیەوە.

فریدریك وێرثام کە یەکێکە لە پزیشکە دەوونییە ئەمەریکیە بەناوبانگەکان، لە روانگەیەکیترەوە دەدوێ و دەڵێ: "پێویستە مرۆڤ ئەوە روون بکاتەوە کە جگە لە زۆر لە راستییە ئیکلینیکییە تازەکان لەبارەی ئەو نەخۆشانەی فرۆید سەرنجیدان، ئەو سێ گۆڕانکاری لە ئامادەسازی بۆ لێکۆڵینەوەی کەسایەتی و چارەسەری عەقڵی هێنایە کایە. یەکەمیان قسەکردن بوو لەسەر سەرجەم پرۆسە سایکۆلۆژیەکان و بیرلێکردنەوەیان بە لۆژیکی زانستە سروشتیەکان. ئەمە تەنها ئەو کاتە کرا کە فرۆید بیرۆکە واقیعیەکەی دەربارەی عەقڵی نادیار و ڕێگە زانستیەکانی پشکنینی پێشکەش کرد. دووەمیان پێشکەشکردنی رەهەندێکی نوێ بوو بۆ چارەسەری دەروونی، ئەویش کاریگەریەکانی قۆناغی منداڵیی نەخۆشەکەیە. بەر لە فرۆید بەشێوەیەك مامەڵە لەتەك نەخۆشییە عەقڵیەکان دەکرا وەك ئەوەی هەموو نەخۆشێك ئادەم بێ، کە هەرگیز منداڵ نەبووە. سێیەمیشیان کردنەوەی تێگەیشتنێکی جۆرایەتی بوو لە غەریزەی سێکسی. دۆزینەوە تازەکە لێرەدا ئەوە بوو کە منداڵ ژیانی سێکسییان نیە، بەڵکو غەریزەی سێکسی خۆی قۆناغی منداڵی هەیە".

أ. ئـۆ. تانسـلی لـە راپۆرتێكیـدا بۆچـوونێكی هاوشـێوە دەردەبـڕێ و دەڵـێ: "سروشتی شۆڕشگێڕانەی ئەنجامگیریەكانی فرۆید كاتێك دەردەكەوێ كە بیر لـەوە بكەینەوە ئەو بوارێكی دەپشكنی پێش ئەو كەس بەهیچ شێوەیەك تێـی نەچووە، ئەویش ناوچەیەكە لـە عـەقڵی مـرۆڤ كـە كـەس پێشـتر دزەی نەكردووەتـە نـاوی و دیمەنە ناڕوونەكانی بە ناقابیل بە تەفسیركردن یان بە لادانـی خـراپ دانـراوە، یـان زانایان فەرامۆشیان كـردووە لەبەرئـەوەی دەكەوێتـە ژێـر بـەهێزترین حـەرامكراوە بەشەریەكان. ئەم كایەیە بەهیچ شێوەیەك پەی پێ نەبراوە. هەربۆیە فرۆید ناچـار بوو گریمانەی بوونی ناوچەیەكی ناهۆشیارانە لە عەقڵدا بكـات، پاشـان هـەوڵ بـدا لەڕێی لەبەریەكهەڵوەشاندنی روونی زنجیرەی رووداوە عەقڵییـە هۆشـیارانەكانەوە، بچێتە ناوی".

لە كۆتاییدا، وینفرێد ئۆڤەرهۆڵسـتەر دەڵـێ "هۆیـەكی بـەهێز هەیـە بـۆ بـاوەڕبوون بەوەی پاش سەد ساڵیتر فرۆیـد لـە ریـزی كۆپـەرنیكۆس و نیوتنـدا دادەنـرێ وەك یەكێك لەو پیاوانەی ئاسۆی نوێیان لەبەردەم هزردا كردەوە. ئەوە روونـە كـە لـەم سـەردەمەماندا كـەس وەك فرۆیـد تیشـكی نەخسـۆتە سـەر قووڵاییـەكانی عـەقڵی مرۆڤ".

فرۆید دواین مانگەكانی ژیـانی لـە تاراوگـە بەسـەر بـرد. پـاش داگیركردنـی نەمسـا لەلایەن نازیەتەوە، ناچار بـوو سـاڵی ١٩٣٨ ڤیـەنا بـەجێ بێڵـێ و ئینگلتـەرا مـافی بەنابـەری پێبەخشـی، بـەڵام دوای كـەمێك لـە سـاڵێك زیـاتر بـەهۆی شـێرپەنجەی دەمەوە لە سێپتەمبەری ١٩٣٩ كۆچی دوایی كرد.

## ١٦- "گوێرەیی: تیۆرەت تایبەت و گشتیەکانی"

### ئەلبێرت ئەنیشتاین Albert Einstein

### ئەفسانەی چاخی ئەتۆم

ئەلبێرت ئەنیشتاین یەکێکە لە کەسە دەگمەنەکانی مێژوو، چونکە توانی لەژیانیدا ببێتە ئەفسانە. وەك برتراند رسل بەڕاستی تێبینی کردووە "هەموو کەس دەزانێ ئەنیشتاین شتێکی سەرسوڕهێنی کردوە، بەڵام تەنیا کەمێك رێك دەزانن ئەو شتە چییە کردوویەتی". ئەگەر بەوردیش نەبێ دەبێ ئەوە بزانین کە بەئاستەم دە کەس هەبن لە سەرتاسەری دنیادا کە بەتەواوی لە تیۆرەکانی ئەنیشتاین لەبارەی گەردوونەوە تێبگەن، ئەو تیۆرانەی، ئەگەر نەڵێین ملیۆنان، هەزاران کەس کە هەوڵ دەدەن بزانن ئەو جادوگەرە مەزنەی ماتماتیك چی دەڵێ، دەخەڵەتێنن و گژبەری دەکەن.

تێنەگەیشتن لە بیردۆزەکانی ئەنیشتاین لە سروشتی ئاڵۆز و نائاسایی بواری کارەکەیەوە دەست پێدەکات. ت. أ. بریدجز T. E. Bridges دەڵێ زانایەکی ئینگلیزی ناو نادیار بەم شێوەیە باسی کردووە:

"ئەم رێبازەی ئەنیشتاین، قسە لەسەر رێژەی نێوان رووداوە سروشتی و ماتماتیکیەکان دەکات. کەواتە بە زاراوە ماتماتیکیەکان نەبێ شەرح ناکرێ و مەحاڵە بەهیچ شێوەیەکیتر پێشکەش بکرێ، کە بکرێ ئەوانەی شارەزاییەکی پێشکەوتوویان لە جەبردا نیە لێی حاڵی بن".

جۆرج و. گرای-ش بەهەمان شێوە دەڵێ:

"لەبەرئـەوەی دانـەری بـیردۆزی گـوێرەیی بیردۆزەکـەی بـە زمـانێکی ماتمـاتیکی خستوویەتیە روو، لەڕاستیدا بەبێ ئەو رێگەیە ناکرێ باس بکرێ. هـەر هـەوڵێك بـۆ تەرجەمەکردنی بۆ زمانی باو جۆرە لافلێدانێکە..".

لەگەڵ ئەوەیشدا دەشێ هەندێ دیمەنی دیاریکراوی جیهانەکەی ئەنیشتاین بخرێتـە روو بەبێ پەنابردن بۆ رەمزە ماتماتیکیەکان. ئای چ دنیایەکی خەیاڵییـە، کـە ئـەو بیرۆکانەی بۆ چەندین سـەدە دانیـان پێـدا نرابـوو ئـاوەژوو دەکاتـەوە. "ئەمـەیش شتێکی نامۆیە کـە داوا لـە مرۆڤـی رەشـۆکی بکـرێ هەرسـی بکـات،". بـۆ نموونـە داوامان لێدەکات دان بە هەندێ بیرۆکەدا بنێین کـە جێـی بـاوەڕپێکردن نـین، وەك ئـەوەی: فـەزا کەوانەییـە و نـزیکترین دوو خـاڵ هێڵێکـی راسـت نیـە، گـەردوون سـنووردارە بـەڵام بـەبێ سـنوور، هێڵـە تەریبـەکان لەکۆتاییـدا بەیـەك دەگـەن، تیشکەکانی روناکی بە هێڵی چەماوە دەڕۆن، زەمەن گوێرەییە و ناکرێ بە هـەمان رێگە لە هەموو شوێن پێوانە بکرێ، پێوانەی درێژیەکان بەپێی جیـاوازیی خێرایـی جیاوازە، زەوی شێوەلولەکی (اسطواني)یە نەك خڕ، تەنی جوڵاو قەبارەی دەچێتە یەك بەڵام بارستەی زیاد دەکات، جگە لـە سـێ رەهەنـد یـاخود دووراییـە باوەکـە، دوورایيەکی چوارەمیش هەیە کە زەمەنە.

ئەگەرچی ئەنیشتاین بێشومار بیردۆزی لە ماتماتیکدا هەیە، بەڵام ناوبانگەکەی بەر لـە هـەموو شـت پشـت بـە بـیردۆزی گـوێرەیی یـاخود رێـژەیی (النظريـة النسبية) دەبەستێ. ئـەوەیش کارێکـە وای لـە بـانیش هۆفمـان کـردوو بڵـێ ئـەوە کـارێکی: "مێژووییە و دانەرەکەی بەهەق بردۆتە ریزی گەورە زانایانی هـەموو سـەردەمەکان شانبەشانی ئیسحاق نیوتن و ئەرشمیدس. ئەم تیۆرە بە دژیەکییە سەرسوڕهێن و سەرکەوتنە ئاشکراکەی، خەیاڵگەی جەماوەری کردەوە".

شۆڕشەکەی ئەنیشتاین سـاڵی ١٩٠٥ دەسـتی پێکـرد و لـە رۆژنامەیـەکی ئەڵمانیـدا بەناونیشـانی "سـاڵنامەی زانسـتی سروشـت" دەرکـەوت لـە سـێ لاپـەڕەدا

بەناونیشـانێکی سـەرنجڕاکێش "لـەبارەی داینـامیکی کارەبـایی تەنـەوە جوڵاوەکان". ئەنیشتاین ئەوکاتە لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا بوو و وەك فەرمانبەرێکی ئاسایی لە بەڕێوەبەرایەتیی تۆمارکردنی دۆزراوەکانی سویسرادا کاری دەکرد. ساڵی ١٨٧٩ لە بنەماڵەیەکی جولەکە لە شاری ئولم لە باڤاریا لەدایك بوو. کاتێك قوتابی بوو جگە لە ماتماتیك، کە هەر لە سەرەتاوە نیشانەی هەڵکەوتوویی پێوە دەرکەوت، هیچ شتێکیتری بەباشی نەدەزانی. لەبەر خراپبوونی باری گوزەرانی خێزانەکەی هێشتا تەمەنی پازدە ساڵ بوو ناچار بوو خۆی خۆی بەخێو بکات.

کۆچی کرد بۆ سویسرا و توانی لە خوێندنی زانستی لە ئەکادیمیای هونەرە تەکنەلۆژیەکان لە زیوریخ بەردەوام بێ. کچە هاوڕێیەکی لە ئەکادیمیاکە خواست و بوو بە هاوڵاتیەکی سویسری. کاتێك بۆی نەلوا وەك حەزی دەکرد ببێتە مامۆستایی زانکۆ، بۆ ئەوەی بژێوی ژیانی پەیدا بکات، لە کارێکدا جێگیر بوو کە تێیدا راپۆرتی بەرایی و تۆمارکردنی داوای دۆزەرەوان بۆ تۆمارکردنی دۆزینەوەکانیانی ئامادە دەکرد. لەکاتی دەست بەتاڵیشدا بە خوێندنەوەی کتێبەکانی فەیلەسوف و زانایانی سروشت و ماتماتیکەوە خۆی خەریك دەکرد. زۆری نەبرد کەوتە خۆ بۆ دەرکردنی لێشاوێك بیرۆکەی سەیر لە فیزیادا، کە کاردانەوەی دوورمەودایان لێکەوتەوە.

ئەنیشتاین ساڵی ١٩٠٥ لە رۆژنامەکەیدا تیۆرە تایبەتەکەی رێژەیبوونی خستە روو و گۆڕبەریی بیرۆکە باوەکانی مرۆڤی دەربارەی زەمەن و فەزا و مادە و وزە کرد. بناغەکانی ئەم بیردۆزە لە دوو گریمانەی سەرەکیدا دانران. یەکەمیان ئەو تیۆری گوێرەییە بوو کە دەڵێ هەموو جوڵەکان گوێرەیین، ئەم تیۆرە نموونەیەکی باوی هەیە لە شەمەندەفەری جوڵاو یان کەشتیی جوڵاودا. ئەو کەسەی لە کەشتیەکدا دانیشتووە کە پەنجەرەکانی بە پەردەی تاریك داپۆشرابن و ژاوەژاوێکی کەمی تێدا بێ، هیچ بیرۆکەیەکی نە لەبارەی خێرایی و نە لەبارەی ئاراستەی

شەمەندەفەرەکەوە نابێ. بگرە لەوانەیە هەر هەست بە جوڵەی شەمەندەفەرەکە نەکا. ئەو کەسەیش لە کەشتیەکی پەنجەرە قەپاتدا بێ لە هەمان دۆخدا دەبێ. ئێمە بەشێوەیەکی گوێرەیی نەبێ هەست بە جوڵە ناکەین، واتە بەبەراورد بە تەنەکانیتر. لە مەودایەکی فراواندا جوڵەی زەوی بۆ پێشەوە هەستی پێ ناکرێ تا تەنیتری ئاسمانی نەبن پێیان بەراورد بکرێ.

گریمانەی دووەمی ئەنیشتاین ئەوەیە خێرایی روناکی لە جوڵەی سەرچاوەکەی سەربەخۆیە. خێرایی روناکی کە ١٨٦٠٠٠ میل/چرکەیە هەمیشە و لە هەموو جێیەکی سەرزەوی جێگیرە و شوێن یان کات یان ئاراستە کاری تێناکەن. بۆ نموونە لە شەمەندەفەرێکی جوڵاودا روناکی بەهەمان ئەو خێراییە دەڕوات کە لە دەرەوەی شەمەندەفەرەکە پێی دەڕوات و هیچ هێزێك نیە کاری تێبکات و وای لێبکا خێراتر یان هێواشتر ببێ. زیاد لەوەیش، هیچ شتێك نیە خێرایی لە خێرایی روناکی زیاتر بێ ئەگەرچی ئەلیکترۆنەکان لەم خێراییە نزیك دەبنەوە. لەڕاستیدا روناکی تاکە هۆکاری جێگیر و نەگۆڕە لە تەواوی سروشتدا.

ساڵی ١٨٨٧ هەردوو زانای ئەمەریکی میچێلسۆن و مۆرلی تاقیکردنەوە بەناوبانگەکەیان ئەنجامدا کە بنچینەی تیۆرەکەی ئەنیشتاینی لەبارەی روناکیەوە دانا و جیهازێکی زۆر وردی بۆ پێوانەکردنی خێرایی روناکی زۆر بەوردی دروست کرد. دوو بۆری کە درێژیی هەریەکەیان میلێك بوو بە (متعامد/لاکێشەیی) دانران، یەکێکیان بە ئاراستەی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆر و ئەویتریان بەپێچەوانەی ئاراستەی جوڵەی زەوی دانران و لەکۆتایی هەر بۆریەکدا ئاوێنەیەك دانرا. لەیەك کاتدا تیشکێکی روناکی خرایە سەر هەردوو بۆریەکە. لەو رووەیشەوە ئەثیری نەبینراو هەموو ئەو فەزایە پڕ دەکات کە تەنێکی رەقی تێدا نەبێ، یەکێك لە دوو تیشکە روناکیەکە لە مەلەوانێك دەچێ کە دژی تەوژم مەلە دەکات، لەکاتێکدا تیشکەکەیتر بە مەلەوانێکیتر بەراورد دەکرێ کە بەئاراستەی تەوژم مەلە دەکات.

ئەوەی هەردوو زاناکەی تووشی سەرسوڕمان کرد ئەوە بوو هەردوو تیشکەکە لە هەمان ساتدا گەڕانەوە. ئەم تاقیکردنەوەیەیش بە سەرنەکەوتوو دانرا. (ئەثیر بەو شتە گریمانەکراوە دەوترێ کە بۆشایی گەردوونی پڕ کردووە. بەکوردی وشەیەکم شك نەبرد بۆیە هەر بە عەرەبی دامنایەوە–وەرگێڕ).

ڕۆژنامەکەی ئەنیشتاین ساڵی ١٩٠٥ وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە کە میچیلسۆن و مۆرلی و هاوڕێیانیان لە زانایانی سروشتی سەرسام کردبوو. حسابی ئەثیری نەکرد، لەڕاستیدا دوو بۆریەکە بەدروستی خێرایی روناکییان پێوانە کردبوو. ئەنیشتاین بەو دەرەنجامە گەیشت کە روناکی هەمیشە بەهەمان خێرایی دەڕوات، ئیتر ئەو بارودۆخەی تێیدا پێوانە دەکرێ هەرچی بێ. جوڵەی زەوی بەلای خۆرەوە، کار لە خێرایی روناکی ناکات.

بەپێچەوانەی زانیاریەکانی نیوتن، ئەنیشتاین پێی وابوو شتێك نیە بەناوی "جوڵەیەکی رەها" و بیرۆکەی جوڵەی رەهای تەنێك لە فەزادا شتێکی بێمانایە، چونکە جوڵە حاڵەتی سروشتی هەموو شتەکانە. هیچ شتێك لە هیچ شوێنێکی سەر زەوی یان گەردووندا نیە کە لە حاڵەتی سکونێکی تەواو یان سکونێکی رەهادا بێ. جوڵە لە هەموو لایەکی جیهانە ناساکینەکەماندا بەردەوامە، لە گەردیلەی بێئەندازە بچوکەوە بۆ گەورەترین گەلەئەستێرەی ئاسمانی. بۆ نموونە زەوی بەخێرایی ٢٠ ملی/چرکە بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. لە جیهانێکیشدا هەموو شت تێیدا بجوڵێت و هیچ شتێکی جێگری تێدا نەبێ بۆ بەراوردکردن، هیچ پێوەرەێکی جێگیر نابێ بۆ بەراوردکردنی خێراییەکان و درێژی و قەبارە و باریستە و زەمەن، مەگەر بە جوڵە گوێرەییەکانیان بەراورد بکرێن. بەڵام روناکی خۆی گوێرەیی نیە، خێراییەکەیشی جێگیرە و ناگۆڕێ بەچاوپۆشین لە سەرچاوەکەی یان شوێنی بینەر، وەك تاقیکردنەوەکەی میچیلۆن و مۆرلی سەلماندی.

بێگومــــان لاوازتـــرین بیرۆكـــەكانی ئەنیشـــتاین لـــە تێگەیشـــتندا، كـــە تواناییئاوەژووكردنــەوەی بیروبــاوەڕە بۆماوەكــانی لــە هــەموویان كــەمتر بــووە، بیرۆكــەی گوێرەییبــوونی زەمەنــە (نســبیە الــزمن). ئەنیشــتاین پێــی وایــە ئــەو ڕووداوانەی لەیەك كاتدا لـە چـەند شـوێنێكی جیـاواز لای بینـەرێك ڕوو دەدەن، لـە هەمان ساتدا لای بینەرێكیتر كە لەچاو بینەری یەكەمدا دەجوڵێ، ڕوویـان نـەداوە. بۆ نموونە ئەگـەر بگوترێ دوو ڕووداو لـە یـەك كاتـدا ڕوویـان داوە، یـەكێكیان لای بینەرێك لەسەر زەوی و ئەویتریان لای بینەرێك لەناو شەمەندەفەر یان فڕۆكەیـەك، ئەوا لەڕاستیدا ئەو دوو ڕووداوە لە هــەمان ســاتدا ڕوویـان نـەداوە. كەواتـە زەمـەن ڕەها نیە بەڵكو بەگوێرەی شوێن و خێرایی بینەر ڕێژەییە.

بەجێبــەجێكردنی ئــەم بــیردۆزە لەســەر گــەردوون، ئــەوا ئەگــەر ڕووداوێكــی وەك تەقینەوەیەك، لەسەر ئەستێرەیەكی دوور ڕوویدابێ و كەسێك لە دانیشتوانی زەوی دیبێتی، ئەوا ئەو تەقینەوەیە لە هەمان ئەو كاتـەدا ڕووی نـەداوە كـە لـە زەوییـەوە بینراوە. بەپێچەوانەوە، ئەگەرچی خێرایـی ڕونـاكی ١٨٦٠٠٠ میلـە لـە چـركەیەكدا، ئەوا ڕووداوێك كە لەسەر ئەستێرەیەكی زۆر دوور ڕوویدابێ، لەوانەیە چـەند سـاڵێك بــەر لــە گەیشــتنی هەواڵەكــەی بــە زەوی ڕوویــدابێ. ئــەو ئەســتێرەیەی ئــەمڕۆ دەبینرێ، بێگومان هەمان ئەو ئەستێرەیە كە ماوەیـەكی زۆر لەمـەوپێش بینـراوە، لەگەڵ ئەوەی دەشێ ئیتر لەكاتی چاودێریكردنەكەدا نەمابێ.

ئەگەر بكرایە بیر لەبوونی كەسێك بكەینەوە كە خێرایی زیـاتر لـە خێرایـی ڕونـاكی بەدەست بێنێ، ئەوا بەپێی تیۆری گوێرەیی ئـەو كەسـە دەتـوانێ پـێش ڕابـردووی بكەوێ و لە ئایندەدا لەدایك ببێ. هەر هەسارەیەك سیستمی تایبـەتی خـۆی هەیـە بۆ زەمەن كە جیاوازە لە خشتەكانی زەمـەن لـە هــەموو شـوێنێك. ئـەمڕۆ، لەسـەر هەســارەی ئێمــە تــەنیا مــاوەی ســوڕانەوەی زەوییــە بــەدەوری خولگەكەیــدا. لەبەرئەوەی مشتەری كاتێكی زۆرتر لە زەوی دەوێ لە سوڕانەوە بەدەوری خۆردا،

ئەوا ساڵ لەسەر رووی مشتەری لە ساڵ لە سەر رووی زەوی درێژترە کاتێك خێرایی بەهۆی خاویی زەمەنەوە زیاد دەکات. ئێمە راهاتووین وا بیر بکەینەوە کە هەموو تەنێك سێ دوورایی (رەهەند)ی لە فەزادا هەیە، فەزا دوورابییەکە بۆ زەمەن و ناکرێ هیچکام لە زەمەن و فەزا بەبێ یەکتر هەبن. لەبەرئەوە هەریەکەیان پشت بەویتریان دەبەستێ. لەو رووەوە جوڵە و گۆڕان بەردەوامن، ئەوا ئێمە لە گەردوونێکی چوار رەهەندیدا دەژین، رەهەندی چوارەم زەمەنە.

بەم شێوەیە هەردوو دەسپێکە بنچینەییەکانی تیۆری ئەنیشتاین وەك نیو سەدە پێشتر خستیە روو، بریتین لە گوێرەییبوونی هەموو جوڵەکان. هەروەها بیرۆکەی روناکی وەك ئەوەی تاکە بڕی نەگۆڕە لە هەموو جیهاندا.

ئەنیشتاین بە پەرەپێدانی گوێرەییبوونی جوڵە باوەڕێکی ریشەداکوتاوی بەتەواوی داڕوخاند. پێشتر درێژی و بارستە بە دوو شتی رەها و جێگیر لە هەر هەلومەرجێکدا دادەنران، بەڵام ئەنیشتاین هات و رایگەیاند بارستە یاخود کێش یان درێژیی هەر تەنێك لەسەر خێرایی جوڵەی تەنەکە وەستاوە. بۆ نموونە: بێنە بەرچاوت شەمەندەفەرێك درێژیەکەی ۱۰۰۰ پێ بێ و بەخێراییەك بەرانبەر ٥/٤ی خێرایی روناکی بێ بڕوات، بەلای ئەو کەسەی بەوەستاوی تەماشای شەمەندەفەرە تێپەڕیوەکە دەکات، وا دێتە بەرچاوی کە درێژییەکەی تەنیا ٦٠٠ پێ بێ ئەگەرچی بەلای ئەو کەسەی سواری بووە هەر ۱۰۰۰ پێیە. بەهەمان شێوە هەر تەنێکی ماددی کە لە بۆشاییدا دەجوڵێ، بەپێی خێراییەکەی دەچێتە یەك. جا ئەگەر دارێکت بەخێرایی ۱٦۱۰۰۰ میل/چرکە بەئاسماندا فڕێدا کە درێژیەکەی یاردەیەك بوو، ئەوا درێژیەکەی نیو یاردە دەچێتە یەك. سوڕانەوەی زەوی ئەو کاریگەرییە سەیرەی هەیە و چێوەکەی نزیکەی سێ بۆصە کەم دەکاتەوە.

هەروەها بارستەیش گۆڕاوە. کاتێك خێرایی زیاد دەکات بارستەی تەنەکە گەورەتر دەبێ.

ئەزموونەکان دەریانخستووە ئەگەر گەردیلەکانی مادە بەخێرایی ٨٦٪ی خێرایی ڕووناکی بجولێن، کێشیان دووقاتی کێشەکەیان لە حاڵەتی نەجولاندا زیاد دەکات. ئەم ڕاستییە پەیوەندیی گەورەی بە پەرەسەندنی وزەی ئەتۆمیەوە هەیە.

تیۆری ئەسڵی ئەنیشتاین لە ساڵی ١٩٠٥ بە تیۆری تایبەتی گوێرەیی دەناسرێ، لەبەرئەوەی ئەنجامگیریەکانی تەنیا تایبەتن بە جوڵە ڕێکخراوەکانی لە هێڵێکی ڕاستدا و پەیوەندییان بە جۆرەکانیتری جوڵەوە نیە. لە جیهانەکەماندا، ئەستێرە و تەنە ئاسمانیەکانیتر بەکەمی بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەسەر هێڵێکی ڕێك دەجولێن، لەبەرئەوە هەر بیردۆزێك هەموو شێوەکانی جوڵە لەخۆ نەگرێ، وەسفێکی تەواوی گەردوون بەدەستەوە نادات. لەبەرئەوە هەنگاوی پاشتری ئەنیشتاین داڕشتنی تیۆرە گشتیەکەی بوو لە گوێرەییدا، ئەوەیش پرۆسەیەك بوو دە ساڵ جێبەجێکردنی سەختی خایاند. ئەنیشتاین لە تیۆری گشتیی گوێرەییدا لەو هێزە تەمومژاویەی کۆڵیوەتەوە کە جوڵەی ئەستێرە و کلکدار و نەیزك و گەلەئەستێرە و تەواوی تەنە ئاسمانیەکان ڕابەرایەتی دەکات، کە بەدەوری گەردوونی بەریندا دەخولێنەوە.

ئەنیشتاین لە تیۆرە گشتیەکەیدا لەبارەی گوێرەیی کە ساڵی ١٩١٥ بڵاوی کردەوە، بیرۆکەیەکی نوێی لەبارەی کێشکردن خستە ڕوو و کۆمەڵێ گۆڕانکاریی جەوهەری لە هەردوو بیرۆکەی کێشکردن و ڕوناکیدا هێنایەکایە، کە لە سەردەمی سێر ئیسحاق نیوتنەوە بەگشتی پەسەند کرابوون. نیوتن کێشکردنی بە "هێز" دادەنا، بەڵام ئەنیشتاین سەلماندی کە بۆشایی دەوری هەر هەسارە یان تەنێکیتری ئاسمانی، کایەیەکی کێشکردنە کە لە کایەی موگناتیسیی دەوری موگناتیس دەچێ. تەنە زەبەلاحەکانی وەك خۆر و ئەستێرەکان، کایەیەکی کێشکردنی زۆر بەهێز دەوری داون. بەم شێوەیە کێشکردنی زەوی بۆ مانگ لێکدرایەوە. هەروەها ئەم تیۆرە ڕاڤەی جوڵە هەڵەکانی عەتاردی کرد کە نزیکترین

هەسارەیە لە زەویەوە. دیارە ئەو دیاردەیە بۆ ماوەی چەندین سەدە فەلەکناسانی حەیران کردبوو و یاسای کێشکردنەکەی نیوتن توێژینەوەی گونجاوی لەسەر نەکرد. کایەکانی کێشکردن زۆر بەهێزن بەرادەیەك تیشکی روناکی دەچەمێننەوە. ساڵی ۱۹۱۹ واتە چەند ساڵێك دوای راگەیاندنی بیردۆزی گشتیی ئەنیشتاین، وێنەگران هەندێ وێنەی تیشکیی گیرانی تەواوەتیی خۆریان گرت، بەیەکجاری راستیی تیۆرەکەی ئەنیشتاینی سەلماند، کە دەڵێ ئەو تیشکانەی کایەی کێشکردنی خۆر دەبڕن، بەهێڵی چەماوە دەڕۆن نەك بە هێڵی راست.

لەم دەسپێکەوە ئەنیشتاین راستیەکی خستە روو کە دەڵێ فەزا کەوانەییە. هەسارە بزۆزەکان لەژێر کاریگەریی خۆردا، (لە جوڵەیاندا) کورتترین رێگەی مومکین دەگرنە بەر، رێك وەك چۆن روبار لە رۆیشتنی بەسەر زەویدا بەرەو دەریا، بەئاسانترین رێگەی سروشتیدا رێچکە دەبەستێ. بەپێی حسابی زەوییانەی خۆمان بۆ شتەکان، ئەو کەشتی یان فرۆکەیەی ئۆقیانووس دەبڕێ، شوێن هێڵێکی چەماوە دەکەوێ، واتە کەوانەیەك لە بازنەیەك، نەك بە هێڵێکی راست. لێرەوە ئەوە روون بوویەوە کە نزیکترین ماوە لەنێوان دوو جەمسەردا هێڵێکی چەماوەیە نەك هێڵی راست. رێسایەکی هاوشێوەیش جوڵەی هەسارەکان و تیشکە روناکیەکان رێك دەخات.

ئەگەر تیۆرەکەی ئەنیشتاین لەبارەی فەزای چەماوە پەسەند بکەین، ئەوا ئەنجامگیریی لۆژیکی ئەوە دەبێ کە فەزا سنووردارە. بۆ نموونە، ئەگەر تیشکێکی روناکی لە ئەستێرەیەکەوە دەرچوو، ئەوا پاش ملیۆنان ساڵ، لەکۆتاییدا دەگەڕێتەوە هەمان ئەو خاڵەی لێی دەرچووە، رێك وەك ئەو گەشتیارەی بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە. گەردوون لە فەزادا بۆ ناکۆتا ناکشێ، بەڵام سنووری هەیە، ئەگەرچی ناتوانرێ ئەو سنوورانە دیاری بکرێن.

لەنێو سەرجەم دۆزینەوە زانستییە مەزنەکانی ئەنیشتایندا، بیرۆکەکانی لەبارەی تیۆری ئەتۆمی گەورەترین کاریگەریی قووڵ و راستەوخۆیان لەسەر جیهانی ئەمڕۆ هەبووە. ماوەیەکی کەم دوای بڵاوکردنەوەی وتاری یەکەمی سەبارەت بە گوێرەیی، کە لە رۆژنامەی "ساڵنامەی فیزیا"دا بڵاو کرایەوە، هەمان رۆژنامە وتارێکیتری کورتی ئەنیشتاینی بەناونیشانی "ئایا کێماسیی خودی تەنێك لەسەر وزەکەی دەوەستێ؟" بڵاو کردەوە کە تێیدا تیۆرەکەی درێژتر دەکاتەوە. ئەنیشتاین لەو وتارەدا جەختی لەوە کرد کە لانیکەم لەڕووی تیۆرییەوە دەکرێ وزەی ئەتۆمی بەکار بهێنرێ. دەشتوانرێ ئەو وزەیە بەپێی هاوکێشەیەك -کە ئەنیشتاین دایڕشت- دەربهێنرێ، ئەوەیش بەناوبانگترین هاوکێشەیە لە تەواوی مێژوودا. هاوکێشەکە بەم شێوەیە:

و= ب خ٢ (واتە وزە یەکسانە بە بارستایی جاران دووجای خێرایی روناکی). بەپێی راپۆرتەکەی ئەنیشتاین، ئەگەر بتوانرێ وزەی ناو نیو رەتڵ لە هەر ماددەیەك تەقێنرابێ، بەکار بهێنرێ، ئەوا هێزەکەی دەگاتە هێزی تەقینەوەی حەوت ملیۆن تەن مادەی T.N.T.

وەك نووسەرێك گوتویەتی "ئەگەر هاوکێشەکەی ئەنیشتاین نەبووایە زاناکان لە تاقیکردنەوەکانیاندا لەسەر پرزەکردنی یۆرانیۆم بەهەڵەدا دەچوون، بەڵام گومان هەیە لە یەکەکانی وزە یان چەند یەکەیەك لە بۆمبەکاندا دەرکیان بە گرنگیەکەی کردبێ".

ئەنیشتاین لە هاوکێشە بەناوبانگەکەیدا سەلماندی کە وزە و بارستە هەمان شتن و تەنها لە دۆخدا جیاوازن. لەڕاستیدا بارستە وزەیەکی چڕکراوەیە. بارنیت دەڵێ "ئەم هاوکێشەیە وەڵامی زۆر لە لوغزەکانی زانستی فیزیا دەداتەوە، کە ماوەیەکی دوور و درێژ بە لێڵی مابوویەوە. تەفسیری ئەوە دەکات چۆن چۆنی مادە تیشکدەرەکانی وەك رادیۆم و یۆرانیۆم دەتوانن گەردیلەی خاوەن خێرایی مەزن

دەربدەن و ملیۆنان ساڵ لە دەردانی بەردەوام بن. ئەمەیش لای خۆیەوە روونی دەکاتەوە کە چۆن خۆر و هەموو ئەستێرەکان دەتوانن بۆ ماوەی ملیاران ساڵ روناکی و گەرما بنێرن، چونکە ئەگەر خۆر بەهۆی پرۆسەی سووتانی ئاساییەوە بەناو بچووایە، دەمێك بوو زەوی لە سەرما و تاریکیدا مردبوو. هەروەها بڕی وزەی شاراوەی نێو ناوکی خانە و ژمارەی ئەو گرامانەی یۆرانیۆم کە پێویستە لە بۆمبێکدا هەبن، تا بتوانێ شارێك وێران بکات، ئاشکرا دەکات".

هاوکێشەکەی ئەنیشتاین بە تیۆری مایەوە تا ساڵی ١٩٣٩، کە دانەرەکەی بوو بە هاوڵاتیەکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پاش ئەوەی نازیەکان لە ئەوروپا دەریانکرد. کاتێك ئەنیشتاین زانی ئەڵمانەکان یۆرانیۆم هاوردە دەکەن و سەرقاڵی توێژینەوەن بۆ دروستکردنی بۆمبێکی ئەتۆمی، نامەیەکی زۆر نهێنی بۆ سەرۆك رۆزڤێڵت نووسی: "چەند وێنەیەکی دەستخەتم لە هەندێ توێژینەوەی نوێ بەدەست گەیشتووە، کە هەریەك لە أ. فێرمی E.F.fermhi و ل. سزیلارد L. Szilardئەنجامی دەدەن، وای لێکردووم پێشبینی بکەم توخمی یۆرانیۆم لە ئایندەیەکی زۆر نزیکدا بگۆڕێ بۆ سەرچاوەیەکی نوێ و گرنگی وزە... هەروەها ئەم دیاردە نوێیە سەردەکێشێ بۆ دروستکردنی بۆمب، بۆمبێکی لەم جۆرە ئەگەر کەشتیەك هەڵیبگرێ و لە بەندەرێکدا بیتەقێنێتەوە، دەشێ بتوانێ تەواوی بەندەرەکە و هەندێ ناوچەی دەوروبەریشی بەتەواوی وێران بکات".

ئەنجامی راستەوخۆی نامەکەی ئەنیشتاین بۆ رۆزڤێڵت ئەوە بوو دەست بە پرۆژەی دروستکردنی بۆمبی مانهاتان Manhattanی ئەتۆمی کرا. نزیکەی پێنج ساڵ دوای ئەوە، یەکەمین بۆمبی ئەلماگۆردۆ Almagardo لە ویلایەتی نیو مەکسیکۆ تەقیەوە. ماوەیەکی کورت پاش ئەوە بۆمبێکی ئەتۆمی لەلایەن ئەمەریکاوە بەسەر شاری هیرۆشیمای ژاپۆندا بەردرایەوە، کە وێرانکاریەکی

تۆقێنەری خستەوە و بووە هۆی ئەوەی جەنگ لەگەڵ ژاپۆن بەخێرایی کۆتایی بێت.

ئەگەرچی بۆمبی ئەتۆمی دیارترین جێبەجێکردنە کرداریەکانی تیۆرەکانی ئەنیشتاین بوو، بەڵام ئەوەی ناوبانگەکەی چەسپاند دەستکەوتێکیتری بەناوبانگ بوو. لەتەک تیۆرە تایبەتەکەی لەبارەی (گوێرەیی) لە ساڵی ١٩٠٥، یاسا روناکییە کارەباییەکەشی هەبوو، کە تەفسیری ئەو کاریگەرییە رۆشنە کارەباییە ناڕوونە دەکات کە رێگەی خۆش کرد بۆ پەیدابوونی تەلەفزیۆن و سینەمای قسەکەر و "چاوی کارەبایی"ی ناسراو بەچاوی سیحری، کە لە زۆر بواردا بەکار هات. بەهۆی ئەم دۆزینەوانەوە ساڵی ١٩٢٢ خەڵاتی نۆبڵ لە فیزیادا بەخشرایە ئەنیشتاین.

ئەنیشتاین لە ساڵە کۆتاکانی ژیانیدا بەلێبڕان وبەبێ ماندوبوون سەرقاڵی کارکردن بوو بۆ دانانی تیۆری ناسراو بە تیۆری کایەی یەکگرتوو (المجال الموحد). هەوڵیدەدا هارمۆنیەت و سیستەمبەندیی سروشت بسەلمێنێ. بەبروای ئەو، پێویستە یاسا سروشتیەکانی ئەتۆمی ورد بەسەر تەنە ئاسمانییە زەبەلاحەکاندا جێبەجێ بکرێ، لەبەرئەوەی تیۆری کایەی یەکگرتوو تەواوی دیاردە سروشتیەکان لە یەك هۆڵدا ئاوێتە دەکات. هێزی کێشکردن و کارەبای موگناتیسی و وزەی ئەتۆمی هەر هەموویان هێزگەلێکن یەك تیۆر دەیانگرێتەوە. ساڵی ١٩٥٠ پاش چەندین توێژینەوە کە ماوەی زیاتر لە نەوەیەکی خایاند، ئەنیشتاین ئەم تیۆرەی پێشکەشی جیهان کرد و بڕوای خۆی دەربڕی کە کلیلی ئەم گەردوونە لەو تیۆرەدایە، چونکە لە یەك بیرۆکەدا، بێکۆتابوونی بچوکی و جیهانی خولاوی ئەتۆم و بەرینیی پانتایی فەزای پڕ لە ئەستێرە کۆ دەکاتەوە. ئەم تیۆرە، بەهۆی زەحمەتییە ماتماتیکیەکانەوە، بەپێی راستییە چەسپاوەکانی زانستی فیزیا تاقی نەکراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەنیشتاین باوەڕی چەسپاوی هەبوو بەوەی رۆژێك

دێ تیۆرەکەی لەبارەی کایەی یەکگرتوو تەفسیرێك بۆ "سیفەتی ئەتۆمیانەی وزە" دەکات و بوونی جیهانێکی باش رێکخراو دەسەلمێنێ.

ئەنیشتاین لە موحازەرەیەکیدا سەبارەت بە بناغەکانی تیۆری گشتیی گوێرەیی کە ساڵی ١٩٣٣ لە زانکۆی گلاسجو پێشکەشی کرد، ئەو فەلسەفەیەی روون کردەوە کە بە دەیان ساڵ کۆششی زەینی قورس بۆی هاتووە و لەسەری چووە. تێیدا گوتی:

"ئەنجامەکانی دوایی خەریکە سادە دیار بن، هەر قوتابیەکی زیرەکی زانکۆ دەتوانێ بەبێ زەحمەتیەکی زۆر تێیان بگات. بەڵام ساڵانی توێژینەوە لە تاریکیدا بەدوای راستیەکدا کە مرۆڤ هەستی پێدەکات و ناتوانێ دەریببڕێ، هەروەها حەزی بەهێز و ئاڵوگۆڕی متمانە و گومان تا مرۆڤ رێگە بەرەو رۆشنی و پاشان تێگەیشتن دەبڕێ، هەموو ئەمانە تەنها ئەو کەسە دەیانزانێ کە خۆی مومارەسەی کردبێ".

لە بۆنەیەکیتردا ئەنیشتاین بەڵگەیەکیتری بەدەستەوەدا لەسەر لایەنی رۆحیی قووڵی سروشتی خۆی، کە گوتی: "جوانترین و قووڵترین سۆز و هەڵچوون کە بکرێ دامانبگرێ، هەستکردنە بە پاڵنەرێکی شاراوە بەرەو بوونی شتێکی ناڕوون. ئەوەیە کە تۆوی هەموو زانستە راستەقینەکان دەوەشێنێ. هەر کەسیش ئەم هەڵچوونە پێی نامۆ بێ، ئەوا زانینی ئەوەی ناتوانین بۆ ناو تاریکیەکانی رۆبچین، بەکردەوە هەیە و وەك باڵاترین حیکمەت و مەزنترین جوانیی درەوشاوەدا گوزارشت لەخۆی دەکات کە بەهرە سستەکانمان توانای تێگەیشتنی نیە لە وێنە زۆر زۆر سەرەتاییەکەیدا نەبێ. ئەم زانین و ئەم هەستە لە نێو دینداریکردنی راستەقینەدا حەشار دراوە".

ژمارەیەکی بێشومار لە زانایان دانیان بە فەزڵی ئەنیشتایندا ناوە و ئاماژەیان بە دەستگرتنی بەسەر دنیای زانستدا کردووە. پۆڵ ئۆیهزەر دەڵێ "دەستبەسەرداگرتن وشەیەکی لاوازە بۆ وەسفکردنی کارەکانی ئەلبێرت

ئەنیشتاین، چونکە ئەو تیۆرانەی پێشکەشی کردن تیۆری شۆڕشگێڕانە بوون. سەردەمی ئەتۆمییان تێدا لەدایك بوو و ناشزانین مرۆڤایەتی بەرەو کوێ دەبەن. بەڵام لەوە دڵنیاین کە ئەمە مەزنترین زانا و فەیلەسوفی سەدەی بیستەمە. خەریکە لە چاوی ئێمەدا قدیسێك بێ، کارەکانی متمانەی پێ بەخشین بە عەقڵی مرۆڤ".

زانا بانێش هۆفمان دەڵێ "گرنگیی بۆچوونە زانستیەکانی ئەنیشتاین تەنها لە سەرکەوتنە مەزنەکەیدا نیە، لەبەرئەوەی کاریگەرییە سایکۆلۆژیەکەی بەهەمان پلە بەهێزە و لە قۆناغێکی رەخنەگرانەیش لە مێژووی زانستدا. ئەنیشتاین سەلماندی ئەو بیرۆکانەی ماوەیەکی دوور و درێژ پەسەند بوون، پیرۆز نین. ئەمە لە هەموو شتێکیتر زیاتر بوو و خەیاڵگەی کەسانی وەك بۆهر و دی برۆگلی ئازاد کرد و بوو بە ئیلهامبەخشی سەرکەوتنەکانیان لە مەملەکەتی رستەدا. چاو بۆ هەرلایەك بگێڕین، فیزیای سەدەی بیستەم جێپەنجەی نەسڕاوەی بلیمەتیی ئەنیشتاینی هەڵگرتووە".

## پێرست



## دنیای مرۆڤ

## دنیای زانست



